





# چێژوتام لەژیانی خۆت وەرگرە

## تەکنیکەکانی هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی لەژێر ڕووناکی ژیننامەی پێشەوای مرۆڤایەتی پێغەمبەر (ﷺ)



نووسینی
دکتۆر محەمەد عەبدول ڕەحمان ئەلعەریفی

وەرگێڕانی : ئەبوبەکر تۆفیق

# چۆن لە ژیانی خۆت وەرگرە؟!

# *Enjoy your life*

# إستمتع بحياتك

تەکنیکەکانی
هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی لەژێر رووناکیی ژیننامەی
پێشوای مرۆڤایەتی پێغەمبەر ((ﷺ))


نووسینی:
دکتۆر محەممەد عەبدولرەحمان ئەلعریفی
أستاذ العقيدة والمذاهب المعاصرة بجامعة الملك سعود بالرياض وعضو الهيئة العليا للإعلام الإسلامي

وەرگێرانی:
أبوبكر توفيق فتاح
ماستەر لە کۆلێژی شەریعە و خوێندنی ئیسلامی



چاپی دووەم: پوختە و زیاد کراوە

١٤٣١کۆچی ٢٧١٠ کوردی ٢٠١٠زایینی



## پێناسێک دەربارەی ئەم پەڕتووکە:


- ناوی کتێب:: چێژوتام لەژیانی خۆت وەرگرە.
- پەڕتووكي گرنگترین باسخوازي جيهاني
- ناوەڕۆك :: باری دەروونی وکەسایەتیناسی..
- نووسەر: : دوکتۆر محمد عبدالرحمن العریفی .
- وەرگێڕ ::ئەبوبەکر تۆفیق فەتتاح.
- ژمارەی سپاردن:( ٦٠٣) ی پەڕتووکخانەی گشتی هەولێر سالی ٢٠٠٨ز .
- پیت چنین ::کۆسرەت.
- دیزایینی ناوەڕۆك::ئەبوبكر.
- تیراژ :: (١٠٠٠) دانە.



- نۆرەي چاپ ::چاپی دووەم.
- شوێنی چاپ ولاتی لوبنان_بە یرووت

**من الدكتور محمد عبدالرحمن العريفي...**
**الى الأستاذ ابوبكر الكردي**

***السلام عليكم... جوابا لطلبك بترجمة كتبي الى اللغة الكردية..***
***.فأقول(( ترجم ماشئت)) يشكر الله لك وجعلنا وإياك مقبولين.آمين.***

**كەواته بۆ هیچ کەسێك نییه هەستێت به وەرگێڕانی ئەم پەڕتووکه (استمتع بحیاتك) بێجگه له مامۆستا (ابوبکر) وەریگێڕاوه بۆ زمانی کوردی بەناوی (چێژله ژیانی خۆت وەرگره) ..**

**جا هەرکەس سەر پێچی بکات خۆی بەرپرسیاره...**

| Intrudes About the book | تعريف بالكتاب |
| --- | --- |

## پێناسەی ئەم پەرتووکە

١-ئەم پەرتووکە گرنگترین باسخوازي جیهانییە -لە ویست و ئاوات و ئامانجي هەر تاکێکە بۆ ئەوەی بتوانێت بچێتە قوولایي دڵانەوە ...
هەموو کۆمولگایەك لە سەر ڕووی ئەم زەوییە-لە هەوڵی جێبەجێکردني ئەم مەبەستەیە لەژیاني دونیا و دوارۆژیش- هەر بەو هیوایەش خوداي گەورە زیاتر لە سەدوبیست و چوار هەزار پێغەمبەري ناردووە بۆ ئەوەي خەڵك و مرۆڤ بەتێکڕا تەبا بن و بەیەکەوە بژین -تەنانەت ئەم هەموو پێشکەوتنەي کەدونیا بە خۆیەوە دەیبینيێ- هەر لە یەك تێگەیشتنە کە مرۆڤ هەوڵي یێوچانی بۆ دەدات ...

٢- ڕاستترین و ڕەواترین داوایە کە لەناخي مرۆڤدا هەڵقولاوە -لەرۆژانەو بەڵکو لەسات وچرکەکاني هەوڵي بەدەست هێناني دەدات -ئەمەش لەکردار و وتەی ڕەنگی داوەتەوە بەڵکو تەنانەت لەداڵغەو هزر و بۆچوونی ڕەنگ دەداتەوە کاریگەریی خۆي دەبێت لە سەر ڕووخساری دەرەوەی مرۆڤ ....

٣-بۆ هەر باسێك لە باسەکان هەوڵم داوە بە کورترین وشە(وتە) واتاکەی بدەم بە دەستەوە لە مەبەستی نووسەر لام نەداوە بەپێی توانا ...

٤-لەوانەیە چەند جارێك هەمان رووداو دووبارە ببێتەوە ، ئەم کارەم بۆیە کردووە چونکە سوودێکی تری زیاتر و جیاتر بە دەستەوە دەدات ...

٥- شادترین کات وساتی لەگەڵ دەبەیتە سەر...

٦- پوختەی ژیاننامەی ناودارترین کەسی جیهانی هێناوە کەپێغەمبەرە ((ﷺ))...

٧- تازەیە لە دەربڕینی هەر واتایەك کە پەیوەندی بەتەکنیکی هەڵسو کەوتەوە هەیە لە گەڵ بەرانبەردا با خاوەن هەر ئایدۆ لۆژیایەك بێت ...

٨-لە سەرووی ئەوەی کە دەچێتە دڵی خەڵکییەوە ، خودای گەورەش لە خۆت رازی دەکە مادەم شوێن پێی پێغەمبەر ((ﷺ)) (هەڵبگریت و مەبەست و نیازت بۆ خودا بێ ... هەر ئەم خاڵەیە جیاوازای نێوان موسوڵان و بێ باوەڕ .. کە مەبەستی ئێمە دوونیا و دوارۆژە..

وەرگێڕ

بشری..بشری

**Good news.. Good news..**

مژدە... مژدە...

ئەتوانم لە دەرئەنجامدا مژدەی ئەوە بدەم بە خوێنەری بەڕێزی ئەم پەرتووکە بە دڵنیاییەوە لە دوای پشتوانی بەستن بە خودای گەورە لە خوێندنەوەی ئەم پەرتووکە و ئامۆژگاری خاڵەکانی جێبەجێ بکات هەنگاو بە هەنگاو دەبێتە کەسێک کە بتوانێت دڵی خەڵکی بۆ خۆی ڕابکێشێت لە ژێر ڕووناکی ڕێنماییەکانی پێغەمبەردا ((ﷺ))...

ئینجا لە کۆتاییدا **خوێنەری بەڕێز** تۆش هەوڵ بدە لە ناخ ودەروونی خۆتدا هەر دەم لە سەر ئەم یاسایانە بمێنیتەوە...ئەمە هیوا و ئاواتی منە لە خزمەتکردنی تۆدا بە وەرگێڕانی ئەم پەرتووکە ...

خوێنەری بەڕێز! ئیتر کاتی ئەوە هاتووە تۆ بدەمە دەستی **خودا ی گەورە** کە هیچ سپاردەیەك ون ناکات ...

| TRAMS LATOR WORK | عمل المترجم |
| --- | --- |

## كـارى وەرگێڕ...

**١- پوختـە ى مەبەستەكە م داوە بەدەستەوە بەبێئەوەى زۆر لەسەر خوێنـەري درێـژ بكەمە .... يان بەپێچەوانەوە...**

**٢- فەرموودەكانم هێناوە ..وەك خـۆي نەگەڕاوم بەدواى سەنەدەكاندا ..بۆ ئەوەى پەڕتووكەكە لە مە زياتر درێژ نەبێتەوە..**

**٣-تـەنها ئامـاژە بـۆ سەرچـاوەكان وەك نووسـەر هێناومـە بـۆ نموونـە.. بوخـارى و موسليم و ئەحمـەد و ئـەبوداود و نەسائى و ئيبن ماجـە و تورمـوزى... (ڕەحمـەتى خودايان لێبێت) بێجگە لە ئەمانيش .**

**٤**-پەسـەندكردن و پەسـەند نـە كردنـى توێژينـەوەى فـەرموودەييم هێنـاوە زۆر بـە دەست پاكييەوە وەك سپاردەيەكى زانستى -(**الامـانـة الـعـلمـيـة**).

| Note,remarks | ملاحظة |
|---|---|

تێبینی :

زۆر بە خۆشحاڵییەوە رەخنەو پێشنیارەکان لە بەرچاو دەگرین لەم ڕێگایانەی خوارەوە:

- ژمارەی مۆبایل کۆرەك ( ٤٨٢٧٠٥٣ )ژمارەی ئەردەن((٠٠٩٦٢٠٧٧٩٤٩٥٨٢٦)
- ئیمێل m.abubaker_kordy@yahoo.com
- یان بە نامە بدرێت بە دەست هەریەك لەو پەڕتووکخانانەی کە ئەم پەڕتووکەی لێدەفرۆشرێت...لە کۆتاییدا خودای گەورە خێری هەر کەسێك بنووسێت سوود لەم پەڕتووکە دەکات... پاڕانەوەی خێرم ی بکات هەر ئەوەش لە تۆی بەڕێز چاوەڕوان دەکەم...

براتان: وەرگێڕ

| Geatefulness and aunwledgement | الـشكرو الـتقـديـر |
| --- | --- |

## سوپاس و پێزانین

* بۆ خوای گەورە((الله)) وبالادەست هەرئەو خاوەن هەموو دەسەلات بەهەرەیەکە بەسەرمانەوە،بۆهەرهەناسەیەك کەهەڵی دەمژین وفرەیدەینەوە سوپاسی بێپایانی ئەو خودایەمان بۆ تەواو نابێت لەسەری..

* گەردیلەی چاومان خاوەن رەوشت بەرزەکە پێغەمبەر((ﷺ)).کە مایەی بەرزترین هەڵسوکەوتە بۆ هەمووکات و ساتێك خۆشبەختی وکامەرانی سەرجەم مرۆڤایەتییە- پێشەنگی سەر کاروانچیان رێگەی نموونەییە لە هەڵسوکەوت کردنیدا.

* هەر کەسێ چاوی بەهەڵەیەك بکەوێت لەم وەرگێرەکەمەمدا بگەرێت بەدوای پاساودا بۆم چونکە بەس خودا تەواوە بێ کەم و کورتیە .

* ئەو کەسە ئەگەر تێبینی بنیات نەری هەیە لەهەر هەڵەیەك ئاگادارمان بکاتەوە پێی دەزانم و بە وردی تەماشای دەکەمەوە.

* ئەو کەسەی هەوڵ دەدات ئەم وەرگێڕە کەمەو نووسینی تر بڵا و بکاتەوە بەهەموو ماڵ لێکدا لەکوردستانی خۆشەویستدا.

*بۆ ئەو کەسەی ئەگەر بڵاوی کاتەوە چ بەلایەنی فرۆشتنی یان بەلایەنی بەخشینی لەناو خەڵکاندا .

* بۆ ئەو کەسەی کەکاربۆناسوودەیي مرۆڤایەتی دەکات لەهەرکوێ هەبێت.

*بۆ ئەو کەسەی هەوڵی بڵاو کردنەوەی دەدات پەیوەندیم پێوە بکات.

*بۆ بەڕێز مامۆستا (جەوهەر ئەحمەد لە سەنگەسەر)شارەزا لە زمان ورێنووسی کوردی لەبەرماندووبونی بێ وچانی بۆ پێداچوونەوە و هەڵە چنین ...

* بە هیوای ئەوەی کەم و زیادی بۆ چاپی داهاتوو بکەین، کاری یاسایشي *بۆ ئاسان بکەم... دەسا بەهیوا ی ئەوە ی هەربمێنێن بەو شێوەیە ی بتوانن لە هەڵسو کەوتتان خودا لەخۆتان راز ی بکەنو بچبنە ناو د ڵی خەڵکییەوە ... تا بەر هەمێکیتر بەئێوە ی خوێنەری بەر ێزو خۆشەویست ... دەگەمەوە..... خواتان لەگەڵ....

وەرگێڕ

## لە نێوان وەرگێڕ و خوێنەرانی کوردوستان و پەڕتووکی ((چێژ لە ژیانی خۆت وەرگرە...؟!))

م: جەوهەر نەحمەدسەنگەسەری((سلاو، دەستی مانددووی نێوخزمەتی زمان فەرهەنگ. بوارەکانی ترت دەگووشم ..سەرکەوتووبی...شوێنی دەستپێکردنی سەرەتای هەربەرەگرافێك تۆزێك شوێن جێبهێڵە..وسلام.

م:زیددوسەتەبەی((سلام علیکم خواتەمەنت درێژ بکات بۆئەم خزمەتانەت.بەتایبەت کتابی((استمتع بحیاتك)).کەکردووتەکوردی...دووبارە سلاوم.

((عظیم الهمة لایفکربملیءاوقاته بالطاعات.بل یفکربأن لاتموت حسناته بموته))٢٠٠٩/٨/٩

((لەخودا دەپارێمەوەکەخودا تەمەنت درێژبکات بۆخزمەت عیلم وزانست،هیوادارم بەردەوامبیت مامۆستاگیان))٢٠٠٩/٥/١٨

((السلام علیکم.برای بەرێزم.من وەکو خوێنەرێك دەستخۆشیت لێدەکەم بۆ وەرگێڕانی کتێبی (استمتعستی بحیاتك)بەراستی سودێکی زۆرم لێبینی بۆشێوازی هەڵسوکەوت کردنم لەگەڵ خەڵکدا. خودای گەورەپاداشتی خێرت بداتەوە)).٢٠٠٩/٣/٨

شەوباش مامۆستاگیان،ڕێزوسلاوم هەیەبۆتمامۆستاگیان تۆتوانیوتەخزمەتێکی باشب کەیت بەمرۆڤایەتی ولەسەررووی هەموویانەوەبەئیسلام بکەیت ،خواگیان بیکات بەپاداشتێك بۆت لەقیامەتدا،وتەکانت زۆرکاریگەرە،مرۆڤ دەتوانێ سوودی لێوەرگرێت(من ئاریان لەکەرکووکەوە).

((مامۆستاگیان،ڕێزوسلاوم هەیەبۆت مامۆستاگیان من گەنجێکم تەمەنم بیستویەك ساڵەکتێبێکی تۆی بەرێزم لەبەردەستدایە....(چێژلەژیانی خۆت وەرگرە)خواقبوڵی بکات ان شاء الله))٢٠٠٩/٢/٢.



| The front | المقدمة |
|---|---|

## پێشەکی...

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگار و سەلاّت و سەلام لەسەر ئەو پێغەمبەرەی ((ﷺ)).کە هیچ پێغەمبەرێك ((ﷺ)).لە دوای ئەو نایەت..

تەمەنم شانزە ساڵ بوو پەرتووکي (تەکنیکی هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی) نووسەری بەناوبانگ (دیل کارینجی)م لەبەردەست بوو ئەم پەرتووکە زۆر جوان و سەرنج راکێش بوو بۆ چەند جارێك خوێندمەوە.

چونکە نووسەرەکەی پێشنیازی کردبوو خەڵکی هەموو مانگ جارێك بیخوێننەوە.. منیش... بەجێم هێناو لەکاتی هەڵسوکەوتم لەگەڵ خەڵکی کارم بە یاساکانی دەکرد دەرئەنجامی زۆر چاك و سەرسورهێنەرم لێ بەدي کرد...

کارینجي یاسایەك دەهێنێتەوە و چەند نمونەیەك لەژێر ئەم یاسایەدا باس دەکات و لە رووداوەکان دەدوێ هی ئەو کەسانەی کە تایبەتمەندییان هەبووە لەناو نەتەوەکاني خۆیاندا وەکو... روزفلت... لنکولن... جۆزف... مایك... منیش جوان سەرنج و تێرامانم کرد، روانیم ئەم نووسەرە کار بۆ ئەوە دەکات و رێنمایی بۆ ئەوئاراستەو مەبەستە دەبات کە هۆی بەختەوەری و شادی و خۆشحاڵیی خەڵکی لێ بێ، ئەی ئەمە چۆنە ئەگەر ئەو کابرا ئایینی ئیسلامی بناسیبایە، رەوشتە پڕ بەها و بەرزەکانی فێر بووایە، ئەوکات بەختەوەری و کامەرانی و سەرفرازی هەردوو دونیای بەدەست دەکەوت!...ئەي چۆن دەبوو گەر بەهرەکان و پسپۆرییەکانی لە هەڵسوکەوتەکاندا

بکردایە بە پەرستن و لە خودای گەورەی پێ نزیک بوو بایەتەوە...لە پاشاندا بۆم ئاشکرا و دەرکەوت کە دیل کارینجی خۆی بەخۆی خۆی کوشت! بۆیە دڵنیابووم لەوەی کە پەرتووکەکەی با زۆر و لەوپەڕی جوانیدا بوو بێ هیچ سوودی بۆ خۆی نەبووە...بەڵام لە مێژووی خۆماندا بۆم دەرکەوت کە لە ژیاننامەی پێغەمبەر ((ﷺ)) و هاوەڵانی و هەڵوێستی دانایانی ئەم ئایینی ئیسلامە زۆری تیادایە کە ئێمەی پێ دەوڵەمەند بکات...

هەر بۆیە لەو کاتەوە دەستم بە دانان و نووسینی ئەم پەرتووکە کرد لە تەکنیکی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ خەڵکیدا...

ئەم پەرتووکەی کەوا لە بەردەستی تۆدایە بە مانگێك و ساڵێك درووست نەبووە و نەهاتووەتە دونیاوە... بەڵکو بەرهەمی تاوتوێکردنی بیست ساڵە کە پێی هەستاوم لەگەڵ ئەوەی کە خودای گەورە منەت و چاکەی بەسەرمەوەیە بۆ دانانی نزیکەی بیست ناونیشان لە دانانی پەرتووك هەتا ئێستا... هەندێك لەو پەرتووکانە لە چاپکردنەوەی تێپەڕ بوو لە دوو ملیۆن "نووسخە: دانە...بەلاْم ئەم پەرتووکەم بە خۆشەویسترین و بە بەهاترین پەرتوکیانە بۆ لای دڵم ، لە دڵمدا... لە هەموویان زیاتر سوود بەخشترە لە رووی زاستییەوە لە بۆچوون و گومانی خۆمدا - ئەوە ئەم پەرتووکەیە کە وشەکانی نووسراوە مەرەکەبەکەی تێکەڵ بەخوێنم بوو بوو... رۆحم تیادا رژاندبوو. لەنێوان دێرەکانیدا یادەوەریەکانی خۆمم تیادا گوشیوە.. هەموویم کردووە بە وشە کە لە دڵمەوە بێنە دەرێ بۆ ئەوەی بچنە ناو دڵەوە... سوێند بە خودا ئەم وشانە لە دڵمەوە دەرچوون بە هیواو ئاوات شەوق و حەزبوونی ئەوەوە کە جێگیر ببێت لە دڵی تۆدا.. تۆش بە زەییت پیادا بێتەوە...

ئاي چەند گەورەیە و بیی سنووورە ئەو دڵخۆشییەم کاتێك بزانم خوێنەرێك لە ((برا)) یان لە ((خوشکێك)) ئەم لاپەڕانە بخوێنێتەوە و ئەوەی تیایدایە جێبەجێی بکات... خۆی هەست پێ بکات پسپۆری و بەهرەکانی پێش کەوتووتربووە لە بوارەکانیدا.. خۆشی و تام و چێژ و لەزەتی ژیانی زیاتر پێ رازاوەتر بێت...

بەدەستی راستی خاوێنی... نامەیەکم بۆ بنێرێ سوپاسی دەکەم - بۆ ئەوەی بلێت و دەربڕینی خۆی دەربڕێت لەبۆچوونی بەرامبەر ئەم وشانە، وێنەی هەستەکانی خۆی تیادا بکێشێ لەو پەڕی راستی و راشکاویدا.. لە پاشاندا بۆم بنێرێ لە ڕێگەی پۆستەوە یان کورتە نامەوە SMS بۆ نووسەری ئەم دێڕانە... منیش بەم چاکەیەی سوپاس و پێزانینم دەبێت... بەنهێنی و لەکاتی نهێنیدا بۆی دەپاڕێمەوە... داوا لە خودای گەورە دەکەم کە بەم پەڕاوانە سوود و قازانج بگەیەنێ... داوایشی لێ دەکەم کە تایبەتی بێت بۆ خۆی کە لێم رازی بێت..

نووسیویەتی ئەو کەسەی کە داوا و پاڕانەوەی خێر بۆ تۆ دەکات.

د. محەمەد کوڕی عەبدولرەحمان ئەلعرێفی

استاذ العقيدة والمذاهب المعاصرة بجامعة الملك سعود بالرياض وعضو الهيئة العليا للإعلام الإسلامي

دەستپێك..

((مەبەست ئەوە نییە تۆ پەرتووکێك بخوێنیتەوە.. بەڵکو مەبەست ئەوەیە تۆ سوود و قازانجی لێ وەربگریت...)).

# ئەو کەسانەی سوود مەند نابن..

دێتەوە یادم نامەیەکی کورتم بۆ هات لە مۆبایلەکەمەوە... دەقەکەی ئەوە بوو: بەڕێز مامۆستا... خۆ کوشتن حوکمی چییە لە ئیسلامدا؟

منیش پەیوەندیم کرد بە کابرای پرسیارکارە و وا سەیر دەکەم گەنجێك بوو لەو پەڕی تەمەنی لاویدا...

پێم وت: داوای لێبووردنم هەیە لە پرسیارەکەت تێ نەگەیشتم... بێ زەحمەت پرسیارەکەت دووبارە بکەرەوە!...

بەهەموو بێ تاقەتی و بێ هیوابییەکەوە وەڵامی دایەوە: پرسیارەکە روونە... ئیسلام دەربارەی خۆکوشتن چی.. دەڵێت:؟

منیش ویستم وەڵامێك بدەمەوە کە ئەو بەلایەوە سەیر بێت و پێم وت:

خێرە ئەگەر مرۆڤ خۆی بکوژێت...

هاواری کرد و بەدەنگی بەرز وتی: چییە؟!

پێم .. وت: پێت چۆنە کە کۆمەکی وهاوکاریی یەکتر بکەین بۆ ئەوەی رێگەی خۆکوشتنەکە دیاری بکەین؟..

گەنجەکە بێ دەنگ بوو...

وتم: بۆچی دەتەوێ خۆت بکوژی؟

وتی: چونکە هیچ کارێکم نییە... خەڵکیش خۆشیان ناوێم... لە بنەڕەتدا هەر دۆڕاو و هەر هێنراو و شکستخواردووم... و دەستی کرد بە چیڕۆکی خۆی بە درێژی کە چۆن هەرەس هێناوە و نەیتوانیوە خۆی و تواناکانی خۆی پەرە پێ بدات... لە بنەڕەتدا هەر ئامادەی ئەو نەبوو سوود لەوەی کە بەدەستی دێنێ بکات لەو بەهرە و توانایانەی کە خودای گەورە بە هە

کەسێك لە ئێمەی بەخشیوە...

بەڵێ :ئەمە بەڵایەکە لەلای زۆربەی خەڵکی...

بۆچی کەسێك لە ئێمە خۆی پێ کەمە؟ بۆچی سەیری خەڵکی دەکات بەچاوەکانی بۆ ئەو کەسانەی، کە گەیشتوونەتە لوتکەی چیاو شاخەکان، هەست بەخۆی دەکات کە کەمترە لەوەی کە بتوانێ سەرکەوێ وەك ئەوان کە چۆن سەرکەوتن؟...

و من يتهيب صعود الجبال يعش ابد الدهر بين الحفر

هەرکەس بترسێ لە بەرزبوونەوە بۆ سەر چیاکان

هەر دەمی ساڵ ژیان دەباتە سەر لەنێو چاڵەکان.

ئایا دەزانی کێ سوودمەند نابێت لەم پەرتووکە؟ و لەهیچ پەرتووکێکی تر کە دابنرێت بۆ پێشخستن و بەهێزکردنی تواناکان؟!

ئەو کەسە هەژارەیە کە خۆی داوەتە دەست هەڵەکانی، خۆی پێ قانیع و رازی دەکات، دەڵێت: ئەمە سروشتی منە کە لەسەری گەورە بووم...

لەسەری راهاتووم، بەهیچ شێوەیەك رێی تێ ناچێ کە بتوانم رێگەی خۆم بگۆڕم.. خەڵکیش ئەمەم لێ دەخوێننەوە ... بەڵام من ئەگەر وەك فلان کەس بم لە وتار و دەربڕینەکان... وەك فلان کەسی تربم لە رووخۆشی و خەندەدارییەکەی... یان فلانی تر کە خەڵك چەندیان خۆش دەوێ..

ئەمانە هەموو لەسەر من ، بۆ من مەحاڵ و موستەحیلاتی دونیایە... رۆژێك لەگەڵ کابرایەك دانیشتم کە زۆر بەساڵدا کەوتبوو تەمەنی زۆر درێژ بوو... لە جێگەیەکی گشتی بووین، هەر هەموو ئەو کەسانەی لەوێ بوون نەخوێندەواربوون- بە واتای خاوەن بڕوانامەی بەرز نەبوون- توانایان زۆر نەبوو... کابرای بەتەمەنیش قسەو باسی گشتی لەگەڵ ئەو کەسەی کە لەپەنای دانیشتبوو وەردەگرت و دەگۆڕییەوە وەك هەریەك لە نەخوێندەوارەکانی تری ناو کۆڕەکە وا بوو، ئەوەی کە زیاتر خەڵك رێزی لەو بگرتایە تەنها لەبەر تەمەنەکەی بوو... تەنها و بەس... منیش وتەیەکی کورتم وت... تیایدا وەلامێکی شێخ و زانای بەناوبانگم باس کرد بوو ((عەبدولعزیز بن باز))... کاتێك لە وتەکە بوومەوە..

کابرای بە ساڵداچوو وەك شانازی بە خۆیەوە بکات پێی وتم من و شێخ بن باز بەیەکەوە قوتابی بووین و دۆست و برادەربووین لەکاتی قوتابیەتیماندا لەلای شێخ محەمەد ئیبراهیم لەناو مزگەوتی ماڵی خودا دەرس و وانەمان دەخوێند... پێش چل ساڵ پێش ئێستا..

رووم بۆ لای ئەو وەرگێڕا سەیرم کرد زۆر خۆشحاڵ بوو لەسەر ئەم قسەیەی کە بۆی کردین... چونکە رۆژێك بووە ئەم هاوەڵی سەرکەوتووان بووە..بەڵام منیش لە دەروونی خۆمدا دووبارەم دەکردەوە و دەم وت:ئەی هەژار، ئەی تۆ بۆ خۆت نەبووی بەکەسێك لە سەرکەوتووان وەك (ابن باز) مادەم تۆ خۆت رێگەت زانی و شارەزابووی ئەی بۆچی بەردەوام نەبووی...؟ بۆچی کاتێك (ابن باز) دەمرێت میمبەرەکان بۆی دەگرین... مرەکەبەکان... پەڕتووکخانەکان... خەڵکانێك هاواریان لێ بەرز دەبێتەوە چونکە ئەو لەناویاندا نامێنێت مردنی زانا مردنی جیهانێکە... بەڵام تۆ کاتێك دەمریت...

لەوانەیە هیچ کەسێك بۆت نەگری... وەك موجامەلە... یان نەریتێك نەبێ...!!

ئێمە هەموومان دەڵێین رۆژێك لە رۆژان هاوەڵ و برادەری فلان کەس بووین... فلان کەسمان ناسی... لەگەڵ فلان دانیشتین... ئەمە خۆی بەخۆی هیچ تایبەتمەندی و پیاهەڵدان و شانازییەکی تیادا نییە... بەڵکو شانازی و پیاهەڵدان ئەوەیە تۆش سەر کەوی وەك چۆن شێخ (ابن باز) سەرکەوت...

بۆیە پاڵەوان و دلێر بە ، هەر ئێستا دەست پێ بکە ئەوە بەجێبهێنە کە دەزانی سوودی هەیە لە تواناکانت... سەرکەوتووبە... رەزاگرانییەکەت بگۆڕە بە رەزاسووکی وخەندەداری "رەزیلییەکەت بگۆڕە بە سەخاوەت... تووڕەییەکەت بە لێ بووردەیی و سینە فراوانی... ناخۆشییەکان و بەڵاکانت بگۆڕە بە خۆشی و بەهرە... باوەڕبوونت بە خودای گەورە چەکت بێ لەم گۆڕانکارییانەدا..

هەر ئێستا دەست پێ بکە و خۆشی لەژیانی خۆتا ببینە... ژیان خۆی کورتە کات و دەرفەتی ئەوەی نییە بۆ پەژارەو کەسار خواردن... بەڵام چۆن دەست پێ دەکەیت... ئەمە ئەو پرسیارەیە کە ئەم پەڕتووکەی لەپێناودا دانراوە... لەگەڵم بە (بەیەکەوە) دەگەینە مەبەست و ئاوات و خواست بەیارمەتیدانی خودای گەورە...

## ئەوەی لە گەڵمان ماوە...

## پاڵەوان ئەو کەسەیە کەبەردەوامبوون و لەسەر رۆیشتنی هەبێ بۆ ئەوەی توانا و بەهرەکانی پێش بخات... سوود لە تواناکانی خۆی وەربگرێت و بە فیرۆیان نەدات...

| What dower Learn | ماذا نتعلم؟ |
|---|---|

## چی فێر ببین؟..

زۆرینەی خەڵکی هاو بەش وهاوشێوەن لەهۆکارەکانی کەساری(کەسەری) و خۆشحاڵییەکان...

خەڵکی هەموو( بە تێکڕا) دڵخۆش و شاد دەبن ئەگەر ماڵ و سامانیان زۆر ببێ...

خۆشحاڵن ئەگەر سەرکەوتن بەدەست بهێنن لە کارەکانیان...

خۆشبەختن ئەگەر نەخۆشییەکانیان سارێژبن...

دڵشادن ئەگەر دونیا بەخەندەوە روویان تێ بکات... مەبەست و ئاواتیان بە دەست بهێنن...

لەهەمان کاتدا... هەموو خەڵکی نیگەران و دڵتەنگن ئەگەر...هەژار و نەداربن کەسار (خەم )دەخۆن ئەگەر نەخۆش بن...پەژارە دەبن ئەگەر سووکایەتییان پێ بکرێ...

مادەم وایە... وەرە بۆ ئەوەی بگەڕێین بە دوای ڕێگەیەکدا خۆشی و دڵشادی و سەرفرازییەکانی پێ بەردەوام بکەین...

زاڵ و سەرکەوتوو بین بەسەر دڵتەزێنییەکانماندا...

بەڵێ... ڕاستە سوننەت و ڕێڕەوی ژیان ئەوەیە مرۆڤ بەخۆشی و ناخۆشیدا تێپەڕ دەبێت بە شیرینی و تاڵیدا دەڕوات...

بەڵێ من گەڵتم لەم شتەدا...

بەڵام بۆچی ئێمە . لە زۆربەی کاتەکانی ژیانماندا،خەتەتەکان و و دڵتەنگییەکان ،زیاتر و گەورەتر دەکەینەوە....!!؟

وامان لێ دەکات چەند ڕۆژێك پەژارە لێمان نابڕێت...

بەڵام خۆی لە خۆیدا دەتوانین تەنها بەساتێك لەدڵی خۆمانی دەربکەین...

زۆر جاریش چەندەها سات ئێمە کەساری دەخۆین لە کاتێکا هەر پێویست بە خەم(کەساری) و پەژارەیی نییە... بۆچی؟!

دەزانم پەژارە و دڵتەنگی روو لە مرۆڤ دەکات سەر دڵی دەگرێت، دەچنە ناو لاپەڕەکانی دڵی مرۆڤە وە و بەبێ ئەوە ی تۆ هیچ دەسەلاتی ئەوەت هەبێت کە نەیەڵیت و قەدەغەی چوونە ژوورەوەی ناو دڵی خۆتی لێ بکەیت...
بەڵام هەر دەرگایەك کە خەفەتت بۆ دەکاتەوە هەر ئەو دەرگایە سەد رێگەی هەیە بۆ داخستنی... ئا ئەمەیە کە ئێمە فێری دەبین...

وەرە بۆ شتێکی تر... چەندەها کەس دەبینین لەو خەڵکانەی کە زۆر خۆشەویستن...
ئەو کەسانەی کە خەڵکانی تر خۆشحاڵ و شادومانن بە پێگەیشتن و بینینیان... دڵیان دەکرێتەوە لە دانیشتن لەگەڵیان... ئایا بیرت نەکردۆتەوە لەوەی کە وەك کەسێك لە ئەوان بیت...؟
بۆچی رازی دەبیت کە هەردەم بە خەڵکانی تر سەرسام بیت و هەوڵی ئەوە نادەیت خەڵکان بە تۆ سەرسام بن ،کار و کردار و رەوشتی بەرزت لێ وەرگرن!!؟
ئا لێرەدا ئێمە فێر دەبین کە چۆن بەو شێوەمان لێ دێت...
بۆچی ئەگەر کوڕی مامەکەت قسە بکات خەڵك گوێی بۆ دەگرن و بێ دەنگ دەبن بۆ قسەکانی... سەرسام دەبن بە شێوازی وتە و دەربڕینەکانی...
بەڵام ئەگەر تۆ قسە بکەیت هەڵ دەستن، پشتت تێ دەکەن...
خۆیان سەرقاڵی قسەی ئەملاو ئەو لای تر دەکەن لەنێوان خۆیانا لەکاتی قسەکردنی تۆدا؟!!
بۆچی؟ لەگەڵ ئەوەی کە لەوانەیە زانست و زانیاریی تۆ گەورەتر و زیاتر بێ... خوێندنەکەیشت بەرزتر بێت... پلە و پایەت گەورەتر بێت...
بۆچی ئەو توانیویەتی سەرنجی خەڵکی بۆ خۆی رابکێشێت بەڵام تۆ نەتتوانی بەم کارە هەستی؟!
بۆچی ئەو باوکە منداڵەکانی خۆشیان دەوێ و دڵخۆشن بە لەگەڵبوونی لە هەموو چوون و هاتنێك...

کابرایەکی تر هەردەم لە هەوڵی ئەوە دایە کە منداڵەکانی لەگەڵی بن بۆ سەردانێك بەڵام منداڵەکانی بڕوبیانوو دەهێننەوە کە میوان و ئیش و کاریان هەیە بۆیە ناتوانن لەگەڵ باوکی خۆیان سەردان و گەشتێك بکەن... بۆچی؟!

بۆ ئایا هەردووکیان باوك نین؟!!

وە بۆچی... و بۆچی...

لێرەدا فێر دەبین چۆنیەتی تام و چێژ و لەزەتوەرگرتن لەژیان...

شێوازەکانی سەرنج و دڵراکێشانی خەڵکی بۆ لای خۆت... کاریگەری و شوێنەواریان لە ناخدا بەجێ بهێڵی... دان بە خۆتا بگریت لە ئاست هەڵچوون و زیادەڕەوییەکانی لەسەر بەرژەوەندیی تایبەتی خۆت...هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەو کەسانەی خاوەن رەوشتی ئازار و ئەشکەنجەن بەرانبەر تۆ و کەسانی تری وەك تۆ...

بێجگە لەمانەش هتد...

جا بۆیە من زۆر بەخێرهاتنت دەکەم بۆ ئەم بوارە...

وشەیەك...

((سەرکەوتن ئەوە نییە بزانیت خەڵکی چییان پێ خۆشە... بەڵکو سەرکەوتن ئەوەیە توانا و بەهرەمەند بیت بۆ ئەوەی خەڵك خۆشی بویێت...))

## بۆچی ئێمە بە دوای توانا و بەهرەکاندا دەگەڕێین؟!

سەردانی ناوچەیەك لە ناوچە هەژارەکانم کرد بۆ ئەوەی موحازەرەیەکیان بۆ بدەم... لە پاشاندا مامۆستایەکیان هات بۆ لام، پێی وتم: ئێمە پێمان خۆشە هاریکاریمان بکەیت بۆ بەخێوکردنی هەندێك قوتابی...

وتم: سەرم سوڕدەمێنێ بۆ ئایا قوتابخانەکەتان میریی نییە... خوێندن بە خۆڕایی بێت؟!.

وتی: بەڵێ.. بەڵام ئێمە گرنتی ژیانیان دەکەین بۆ ئەوەی خوێندنی کۆلێژ تەواو بکەن.وتم: خوێندنی کۆلێژیش هەر بە لاشەوخۆڕاییە، تەنانەت رێزلێگرتنیان هەیە...

وتی: تەواو زیاتر بۆت روون دەکەمەوە، بۆ ئەوەی لەم قسە و باسە تێ بگەیت...وتم: خۆزگە...

وتی: ئێمە هەندێك قوتابیمان هەیە پلەکانیان نزیکەی لە ٩٩٪یە زۆر شارەزا و لێهاتوون ئەگەر بێت و دابەش بکرێت بەسەر کۆمەڵگادا.

کاتێك دەردەچی ئەیەوێت بۆ خوێندنەکەی بچێتە شارێکی ترە لە پزیشکی و ئەندازیاری بخوێنێت... شەریعە و ... کۆمپیوتەر... بێجگە لەمانەش...

باوکی رێگری دەبێت لە بەردەوامبوونی و دەڵێت: ئەوەندەی فێربوویت بەسە بۆت... هەر بۆیە دایدەنیشێنێ بۆ لەوەڕاندنی مەڕەکانی... منیش بە دەنگێکی بەرز بەبێ ئەوەی ئاگام لەخۆم بێت هاوارم کرد: بەخێوکردن و شوانی کردنی مەڕ و ماڵات!!

وتی: بەڵێ بەخێوکردنی مەڕ و ماڵات... هەر بۆیە کابرای قوتابی لەگەڵ باوکی دادەنیشێ بەلای باوکییەوە هەمان پیشەی مەڕ و مەڕلەوەڕاندن دەکات...

ئەم هەموو تواناو بەهرانەی دەمرێنێ... چەندەها ساڵ دەڕوات ئەو هەر بەردەوامە لەسەر ئەو پیشەیە...

بەڵکو دوای هاوسەرگرتنیشی... دوا ی منداڵ بوونیشی... ئەویش هەمان شێواز دەگرێتە بەر لەگەڵیان... بەخێوکردنی مەڕ!!..

وتم: ئەی چارە؟!وتی: چار ئەوەیە ئێمە باوکەکە رازی بکەین بۆ ئەوەی کەسێك بگرێت بۆ خزمەتکردنی مەڕەکان...

ئێمەش ئەو پارەیە دەدەین لەباتی باوکی... منداڵەکە بەروبوومی بەهرە و تواناکانی خۆی بەگەڕ دەخات... ئێمەش هەڵ دەستین بە بەخێوکردنی منداڵە بەهرەمەندەکەش هەتا بەم شێوە دەردەچێ...

لەپاشاندا مامۆستاکە سەری خۆی دەجوڵاندەوە و دەیوت:

گوناه و تاوانە ئەم بەهرە و توانایانە بەفیڕۆ و بەلاش و بێ هودە بچێت لەناو دڵی خاوەنەکانیانەوە...

خەفەت و پەژارەی لەسەر دەخۆین... بیرم کردەوە لە وتەکانی... بۆیە منیش بۆچوونم وایە کە ئێمە ناگەینە لووتکە مەگەر بە تاوتوێکردنی تواناکان نەبێت... یان بەدەست هێنانی بەهرە و تواناکان نەبێت...

بەڵێ من تەحەددای ئەوە دەکەم کە کەسێکی سەرکەوتوو ببین... با لەهەر بوارێکدا بێت.. لە زانست... یان لە بانگەواز... یان لە وتار خوێندن... یان لە بازرگانیدا... یان لە ئەندازیاریدا... یان لە سەرنج و رای خەڵکی بەلای خۆیدا رابکێشێت... یان سەرکەوتووان لەبواری خێزانیەوە... وەك باوك لەگەڵ منداڵەکانی... دایك و خێزان لەگەڵ باوك و مێردیدا... یان لایەنی کۆمەڵایەتی... وەك ئەوەی سەرکەوتوو بێت لەگەڵ دراوسێیەکانی و هاوەڵانی تریدا...مەبەستم پێی سەرکەوتوانە... نەك مەبەستم پێی خۆبەرزکەرەوان بێت لەسەر شانی خەڵکانی ترەوە..!!

دووبارە تەحەدای ئەوە دەکەمەوە کە کەسێك لەوانە ببینی گەیشتبێتە لووتکەیەك لە سەرکەوتن... مەگەر بە شێوەیەك لە شێوەکان ئەو هەڵسوکەوتێکی کردووە بەخۆی بزانێت یان بە خۆی نەزانێت. بەهۆیەوە توانیویەتی بگات بە سەرکەوتن...

لەوانەیە هەندێ کەس هەستن بە بەهرەمەندی وتواناییەك کە سەرکەوتنی تیادا بێت بە سروشتی...

لەوانەشە کەسانێکی تر فێری بەهرەمەندیی وەگەڕخستنی تواناکان بن لە خەڵکانی ترەوە..
.ئەوانیش هەڵسوکەوتی پێ بکەن... پێی سەرکەون...
ئێمە لێرەدا گەڕانمان بەدوای سەرکەوتوانە... تاوتوێی ژیانیان دەکەین... چاودێری ڕێگە گرتنە بەرەکانیان دەکەین... بۆ ئەوەی هەمووومان پێکەوە بزانین چۆن سەرکەوتن و ئایا گونجاوە ئێمەش هەمان ڕێگە بگرینە بەر هەمان سەرکەوتن بەدەست بهێنین وەك ئەوان بەدەستیان هێناوە...؟
پێش ماوەیەك پێش ئێستا گوێم لە بەرانبەرییەك بوو لەگەڵ کەسێك لە کەسە ڕەنگینەکانی جیهان، پیاو ماقووڵ و ناودار (سلێمان ئەلراجحی) بۆم دەرکەوت چیایە کی گەورە و پۆلایینە لە ڕەوشت بەرزیدا و لە هزر و بۆچوونیدا...
کابرایەکە خاوەن ملیارات... هەزارەها خانوو بەرەی هەیە... سەدەها مزگەوتی درووست کردووە ، هەزارەها هەتیو بەخێو دەکات... کەسێکە لە چڵە پۆپی سەرکەوتندایە...
خۆی کرد لە دەستپێك و سەرهەڵدانییەوە پێش پەنجا ساڵ بەر لە ئێستا... کەسێکی سادە و ساویلکە بوو، وەك زۆربەی خەڵکانی تری دونیا بەگشتی... تەنانەت جاری وا بووە خواردنی ڕۆژێکی نەبووە!باسی لە وە کرد جاری وا بووە ماڵانی خەڵکی خاوێن کردووەتەوە بۆ ئەوەی خواردنی ڕۆژانەی خۆی پەیدا بکات...
لەوانەشە شەوی بەدەم ڕۆژەوە دابێت لە کرێکاریکردنی لەدوکانێك یان هەر جێگەیەکی تر...
باسی لەوە دەکرد چۆن لەبن و چالأیی خواری خوارەوەی شاخ و چیاکاندا بووە... بەڵام لە پاشان و بەبەردەوام بەرەو چڵە پۆپ و لووتکە خۆی دەکوتا هەتا پێی گەیشت...
بۆیە بیرم لە بەهرەمەندی و تواناکانی دەکردەوە... بۆم دەرکەوت زۆربەی کەس لە ئێمە دەتوانن وەك ئەو بین بە یارمەتیدانی خودای گەورە...
ئەگەر فێری بەهرە و وەگەڕخستنی تواناکان بین... بەردەوامبوون و ڕاگیربوون و لەسەر چوون و سووربوون... بەڵێ...
کارێکی تر کە بانگێشەی ئێمە دەکات بۆ ئەوەی ئێمە گەڕان و لێکۆڵینەوە بکەین بە دوای تواناکاندا... ئەویش ئەوەیە... زۆربەی خەڵکی خاوەن توانا و بەهرەیە لەسەر داهێنان کردنی بەڵام ئەو خۆی لێی بێ ئاگایە... یان کەسێك کۆمەك و یارمەتیدەری نەبووە بۆ دەرخستنی و کلپەهێنانی... بۆ نمونە وەك توانای لەسەر وتنەوە و دەربڕین بۆ کۆڕ و کۆمەڵ...

یان هێزێکی بازرگانی... زیرەکی و لێهاتوویی، زانین و زانستی...
جاری وا دەبێت مرۆڤ خۆی بەخۆی ئەم لێهاتووییە دەدۆزێتەوە لەخۆیدا... یان مامۆستایەك بە گڕو کڵپەی دەسێنێ لەناخ و دەروونیدا... یان بەرپرسێکی کار و پیشەیی... یان دۆست و برادەرێکی دڵسۆز...
بەڵام ئاخ و ئای لەم ڕۆژەدا چەندە ئەم جۆرە کەسانە کەمن...!
جاری واش دەبێ ئەم لێهاتوویی و بەهرەمەندی و تواناداریيە بەندی دەروونی مرۆڤ دەبێ ، شتێك زاڵ دەبێت بەسەریدا ، ئەوەی لە نێوان خەڵکی باوە... یان هەر دەمرێت ئەو هێشتا کۆرپەیە و وەك لە ناو بێشکە و جۆلانەی منداڵدایە.
ئا لەو کاتەدا ئێمە سەرکردەیەك یان وتاربێژێك یان زانایەك... یان لەوانەیە باوکێکی سەرکەوتوو یان باوکێکی دڵسۆزمان لەدەست بچێت...
کە ئەمانە هەموویان توانا و بەهرە لێهاتووییيان هەیە بۆ داهێنان...
من لێرەدا هەندێك بەهرە و لیهاتوویی تایبەتی باس دەکەم و بەبیر دەهێنمەوە ئەگەر ئەو شتانە لەتۆدا هەبێت...
تۆی لەسەر ڕادەهێنین ئەگەر تۆ خاوەن ئەم بەهرانە نەبیت...
دەسا وەرە و فەرموو...

## هزر و بۆچوونێك...

ئەگەر سەرکەوتنی بەسەر چیادا بەرەو چلەپۆپە و لووتکە...
ئاور مەدەرەوە لە تاشەبەرد ووردە بەردەکانی پەرش و بلاو بوونەتەوە بەملاو لاتدا...
سەرکەوە با هەنگاوەکانت دڵنیایانە بن...
خۆت هەڵ مەدە و خۆت فڕێ مەدە چونکە پێت دەخزێت...

| Developer your self | طور نفسك |
| --- | --- |

## خۆت پێش بخە....

لەگەڵ کابرایەك دانیشتنێك دەکەیت لە تەمەنی بیستساڵیدا. لە ئاست و هزر و بۆچوونێکدایە... لە پاشاندا دوای سێ ساڵ هەر هەمان خەڵە و خەرمانە... بەبێ ئەوەی توانایی زیاد کردبێت...

بەڵام کەسانێکی تر هەن ، هەست دەکەیت سوودمەندن لە ژیانیندا...

هەر هەموو رۆژێك بەهرەمەندتر دەبێت ، خۆی دەوڵەمەند دەکات بەزانست و زانین و تێگەیشتن هەر رۆژ لە دوای رۆژ چاکترە لە رۆژی پێشتری... بەڵکو لەوانەیە بە تەنها یەك ساتیش لە ژیانی ناڕوات ئەگەر بەرز نەبێت لە رووی دونیایی یان ئاییني... ئەگەر ئەتەوێ جۆرەکانی خەڵکی بناسیتەوە لەو بارەوە... وەرە لەگەڵمان بۆ ئەوەی بیر لە شێواز و گرنگی پێدانەکیانیان بکەینەوە...

بۆ نموونە کەناڵە ئاسمانییەکان... کەسانێك هەیە هزر و زانستی خۆیانی پێ زیاد دەکەن... زیرەکیی خۆی پێ پێشکەوتووتر دەکات... بەوەی سوود لە ئەزموونەکانی خەڵکانی ترەوە وەر دەگرێ لە روانینی بەردەوامی دایەلۆگی((گفتوگۆی)) بەسوود و گونجاو... هەموو توانا و بەهرەکانی جوان و شیاو لەمشتو مڕو قسە گۆڕینەوەکان دەکات... و زمانەوانی... لێگەیشتن و خێرایی بۆ هاتن لە دەربڕیندا... توانایی و لێهاتوویی لەسەر گۆڕینەوەی قسە و باسەکان لەگەڵ خەڵکانی تردا...شێوازەکانی سەلماندن بە خەڵکانی تر...

کەسانێکیش هەن لەوانەیە هیچ فلیمێکیان لە زنجیرەکان لەدەست نەچێت کە باس لە چیرۆکی خۆشەویستیی درۆدەکات... یان شانۆیەکی سۆز و دڵداری... یان فلیمێکی داڵغەیی و ترسێنەر... یان ئەو فلیمانەی چیرۆکە هەڵبەستراوەکانی بێ نرخ و بێ بەهان کەهیچ راستیشیان نییە...

وەرە لەگەڵم سوێندت دەدەم بەخودای گەورە... بڕوانە بۆ حاڵی یەکەم و حاڵی دووەم لەپاش پێنج ساڵ... یان دە ساڵ... کامیان زۆر زیاتر پێشکەوتووتر دەبن لە بەهرە و تواناکانیان؟.. تواناییوەرگرتندا؟..

لە فراوانیی رۆشنبیریدا؟..

لە توانای رازیکردنی بەرانبەردا؟..

لەشێوازی هەڵسوکەوت لەگەڵ رووداوەکاندا؟..

بێ گومان یەکەم کەسە... بەڵکو شێوازی کابرای یەکەم بە تەواوی جیاوازە... بەڵگەهێنانەوەکانی بەتایبەتمەندییەکان... ژمارەکان... زانستییەکان... بەڵام کابرای دووەم بەڵگەهێنانەوەکانی بە وتەکانی نوێنەران... و گۆرانیبێژانە هەتا کابرایەکیان وتی:

(خودا دەڵێت: بەندە کەم هەوڵ و کۆشش بکە منیش هەوڵ و کۆشش دەکەم لەگەڵت!!ئێمە ئاگادارمان کردەوە کە ئەوە ئایەت نییە... یەکسەر رەنگی گۆڕاو بێ دەنگ بوو... لە پاشاندا بۆم دەرکەوت ئەو وشەیە قسەی میسری لەمێشکی ئەم کابرایەدا جێگیر بووە بە ئایەت! ئەمەش لە یەکێك لە زنجیرە تەمسییلیەکانەوە وەریگرتووە!!..

بەڵێ راستە هەر پەرداخەو ئەوە دەڕژێنی کە پێیەتی...بەڵێ وەرە بۆ روویەکی تر... لە خوێندنەوەی رۆژنامە و گۆڤارەکاندا...

چەندن ئەو کەسانەی کە گرنگی دەدەن بە خوێندنەوەی هەواڵی بەسوود و زانینە بەسوودەکان کە یارمەتیدەرن بۆ بەهێزکردن و پێشخستنی خودی مرۆڤ خۆی، گەشە پێکردنی توانا و بەهرەکان... پتر و زۆرکردنی زانستەکان...

بەڵام چەند زۆرن ئەوانەش تەنها پەراوێزەکانی وەرزش و تەکنیك دەخوێننەوە؟! هەتا وای لێهاتووە زۆربەی رۆژنامەکان و گۆڤارەکانی لاپەڕەکانی وەرزش و تەکنیکیان زیاد و زۆر کردووە لەسەر حیساب و بەرژەوەندیی لایەنەکانی تر.

بەهەمان شێوە بڵێ بۆ شوێنی دانیشتن و بەڕێکردنی کاتەکانمان... ئینجا ئەگەر تۆ ئەتەوێ سەربیت نەك كلك ...

ئەوا سووربە بۆ شوێن پێهەڵگرتنی سوودەکان لەهەر کوێ هەبوون... خۆتی لەسەر رابهێنە کابرایە بەناوی عەبدوڵڵاوە دڵگەرم بوو... بەڵام لە هەندێ لێزانیدا شارەزایی کەم بوو...

بەرەو مزگەوت رۆیشت، هەنگاوەکانی خێراتر دەکرد بۆ ئەوەی فریای نوێژی جەماعەت بکەوێ

لەرێگەدا تێپەڕ دەبێت بەلای کابرایەکدا وا خۆی سەرقاڵی دارخورماکانی خۆی کردووە و لە ئێستا واکاتی نوێژە!... بۆیە عەبدوڵڵا کە بۆ ئایین دڵسۆزە و بۆ رازیبوونی خودا بە پەرۆشە زۆر بەلایەوە سەیر بوو ئەم کابرایە وەك ئەوەی هەر گوێی لە بانگ نەبوو بێت..!!بۆیە عەبدوڵڵا هاواری لێکرد و بە توڕەییەوە (وەرە دابەزە بۆ نوێژ).

کابرای باخچەوان زۆر بەساردی و لەسەرخۆییەوە وتی باشە... باشە...

بەڵام عەبدوڵڵا... هەڵەی کرد و وتی: پەلە بکە.. هەی گوێدرێژ...!!

کابرای باخچەوان تووڕە بوو ئەمەش هەقی خۆیەتی..وتی: من گوێدرێژم!!

لقە دارخورمایەکی بڕی بە دەستەوەی گرت و واخەریکە دابەزێ بۆ ئەوەی سەری عەبدوڵڵا لە سەرلاشەی پێ نەرم بکات!!

عەبدوڵڵاش لە ترسادا دەم و چاوی خۆی داپۆشی بۆ ئەوەی کابرای باخچەوان نەیناسێتەوە و خۆی کرد بە ناو خەڵکەکەدا... بەرەو مزگەوت هەنگاوەکانی خێراتر کرد...

کابرای باخچەوان دابەزی و بە تووڕەییەوە چووە ماڵەوە... دوای نوێژکردن و ئیسراحەت... لەپاشاندا بەرەو باخچەکەی بەڕێ کەوتەوە بۆ ئەوەی ئەوەندەی کە ماوە لەئیش و کارەکانی رایپەڕێنێت...

کاتێ نوێژی عەسەر هات و عەبدوڵڵا بەرەو مزگەوت کەوتە ڕێ...

بەهەمان شێوە بەلای باخچەوانەکەدا تێ دەپەڕێ لە سەر دارخورمایەك... بەڵام ئەم جارە شێوازی دایەلۆگی و قسەکانی خۆی گۆڕی...

بۆیە وتی السلام علیکم... حاڵت چۆنە...

باخچەوان وتی: سوپاس بۆ خودا زۆرباشم... عەبدوڵڵا وتی: دەی مژدەی خێر بێ!! ئەم ساڵ بەرو بووم چۆنە؟..باخچەوان وتی سوپاس بۆ خودا... زۆرباشە... عەبدوڵڵا وتی: خودای گەورە سەرکەوتووتان بکات رۆزیت بدات... فراوانی بخاتە ماڵ و حاڵت... پاداشتی ماندووبوونت بداتەوە ،لە سەر رۆزی پەیدا کردنت بۆ ماڵ و منداڵت...

باخچەوان، زۆر دڵخۆش بوو بەم دووعایانە بۆی... سوپاسی عەبدوڵڵاشی کرد.

عەبدوڵڵا وتی: لەوانەیە لەبەر سەرقاڵیت ئاگات لە بانگدان نەبووبێت بۆ بانگی عەسر!! بانگی فەرمووە و لەوانەیە کاتی قامەتکردنیش نزیك بووبێتەوە...

تــۆش تۆزێك حەوانــەوە بــدە بــەخۆت و فریــای نوێژەكەشــت دەكــەوی و... لــە دواتــریش كارەكانی باخچەوانی خۆت تەواو دەكەیت... خودا لاشەو تەندروستیت بەساغ بۆ بهێڵێتەوە...

باخچەوان: انشاء الله... انشاء الله.دەستی بە دابەزین كرد هێواش هێواش...لەپاشاندا رووی لە عەبدوڵلا كرد و زۆر بەگەرمییەوە تەوقەی لەگەڵ كرد..
باخچەوان وتی: سوپاسی تۆ دەكەم لەسەر ئەم رەوشتە جوان وبەرزەت..
نەیدەزانی ئەم عەبدوڵلایە هەرهەمان كەسی جاری تر بوو كە شێوازی بە دو خراپ بوو ...
بۆیە باخچەوان وتی: ئای ئەگەر ئەمزانی ئەو كەسە كێ بوو كە نیوەڕۆ بە لای مندا تێپەڕ بوو، خۆزگە دەمزانی كێ بوو بۆ ئەوەی پێی نیشان بدەم كێمان (من یان ئەو )گوێدرێژە!!.

دەرئەنجام...

بەهرەكان و توانابیە كانت بەكار بهێنە لە هەڵسوكەوتت لەگەڵ خەڵكی.. لە سەر بنەما و بنچینەكانی رێگەی هەڵسوكەوتی خەڵكی دیار دەبێت بەرامبەر تۆ...

## مەگری لەسەر شیری رژاو یان داکراو..

هەندێ کەس گومان دەبەن ئەو سروشت و نەریتە کە لە سەری پەروەردە وگەورە بوون .. خەڵکی ئەویان بەو نەریتە یان کار و پیشە ناسیوە.. لە هزرو بۆچوونیاندا وێنەی ئەو کەسەیان کێشاوە پێی دەناسرێ..

ئەم کەسانە واهەست دەکەن هەرگیز لەتواناو دەسەڵاتیاندا نییە کە بتوانن ئەم هزر و بۆچوونەی خەڵکی دەربارەی خۆیان بگۆڕن.. هەر بۆیە ئەوانیش چاریان ناچارەو خۆیان دەدەنە دەستی ئەم هەڵسوکەوتەی خەڵکی دەربارەی ئەوانەوە..

وەك چۆن مرۆڤ کە دەسەڵاتی نییە ئەگەر درێژ بێت یان کورت لە جەستە ولاشەیدا یان رەنگی پێستی کە رەش پێست بێت یان سپی پێست بێت..

چونکە هیچ ناتوانی ئەم شتانە بگۆڕێ.. لە گەڵ ئەوەشدا مرۆڤی هۆشمەند سروشتی خۆی بگۆڕێ لە خراپ بۆ چاك وەك چۆن ئەگەر جل وبەرگێکی بەدل نەبێ بتوانێ بیگۆڕێ!!

سروشت وەك شیرێکی رژا و نییە کە نەتوانین کۆی بکەینەوە یان فریای بکەوین..

بەڵکو لە بەر دەستی خۆمانە ..

بەڵکو ئێمە دەتوانین بە جۆرێك وشێوازێکی تایبەتی سروشتی خەڵکانی تریش بگۆڕین..

بەڵکو لە وانەشە بتوانین هۆش وبیریشان بگۆڕین!!

زانا ئیبن حزم لە پەرتووکە جوانەکەی خۆیدا ناوی (طوق الحمامة) باس لەو بارەیە دەکات کە کابرایەکی بازرگان زۆر ناودار بوو لە ئەندەلووسدا کێشە کەوتە نێوان ئەوو چوار بازرگانی تر.. بە هۆی موونافەسەکردنی ئەوە وە بۆ ئەو چوار کەسە ئەوانیش سۆزو پەیمانی تۆڵە لێسەندنەوەی خۆیاندا..

بۆیە کابرا سەروێنێکی (جامانەیەکی) سپی وجوانی لەسەر کردبوو.. ئەو چوار کەسەش هەریەکەو قسەیەکیان بۆ هەڵبژاردبوو..
یەکەمیان: ئەو سەروێنە- جامانە زەردە زۆر جوانە..

ئەویش وتی: ئەوە بۆ کوێری ئەو جامانە سپییەیە کابراش پێی وت دڵتەنگ مەبە بازەردیش
بێت بەڵام هەر جوانە وزۆر لەتۆ دێت..
کەسی دووەم: پێی گەیشت وزۆر بەگەرمی بەخێرهاتنی کرد..و
وتی : ئەمڕۆ تۆ زۆر جوانی بەڵام بەتایبەت بەمجامانە سەوزەوە..
تۆ ئەوەندەیتر جوان بوویت بەو جامانە سەوزە..
ئەویش زۆر نیگەران دەبێ دەڵێت: بڕۆ لەپێش چاوم ون بە..بەڵکو جامانەکەم سەوز بەڵکو سپییە.. بەڵام ئەم قسانە کاریگەری لەسەر دەروونی کابرا دەکات.. بۆیە دوو دڵی دەکەوێتە دڵیەوەو زۆر دیقەت بەجامانە کەی خۆی دەدات!! کاتێك دەگاتە دووکانەکەی خۆی..
کابرای سێیەم پێی دەڵێت: ئەم بەیانیە تۆ زۆر کەشخەیت بەتایبەت بەوجلە جوانانەتەوە.. بەتایبەتیتریش ئەو جامانە شینەت..
بۆیە کابرا سەیری جامانەکەی خۆی کردوو وتی: برام جامانەکەم سپییە...
کابراش، وتی: نەخێر شینە..بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر جوانە.. نیگەران مەبە..
کابرای چوارەم..خۆی کرد بە دووکانە کەیدا، وتی:
((مەرحەبا ئەی فلان کەس.. ماشاء الله!! ئەوە تۆ لە کوێت کڕیوە ئەو جامانە سوورە؟!)) ..
کابرای بازرگان هاواری لێبەرز بووەوە و وتی: جامانەکەم سەوزە..
کابرای چوارەم وتی: نەخێر سوورە..
بازرگانەکە وتی: نەخێر سەوزە.. نەخێر .. نەخێر .. سپییە.. نا..نا..کەسکە..نا..نا...رەشە..
لەپاشاندا دەستی بەپێکەنین کرد ..لەپاشاندا هاواری کرد.. لەپاشاندا دەستی بە گریان کرد..
هەتا سەرگەردان بوو.. بەلای راست وچەپی خۆیدا خۆی فڕەدەدا بۆ ئەولاترا!!
بەکورتی واتە: (( شێتیان کرد. .))

ئیبن حەزم دەڵێت: خۆم ئەو بازرگانەم بە چاوی خۆم دی کە شێت بوو بوو منداڵان بەردەبارانیان دەکرد...

مەبەستمان ئەوەیە ئەگەر ئەم چوار کەسە بەم شێوازە سادە و ساویلکە توانییان سروشتی ئەو کەسە بگۆڕن...

بەڵکو توانیان هزر و هۆشی بگۆڕن..

ئەی تۆ دەڵێی چی ئەگەر توانایی ولێهاتوویی بەهرەکان بەشێوەیەکی دارێژراو کاریان بۆ بکرێت.. بەتایبەت ئەگەر پشتیوانی بکرێت بەدەقەکانی نیگای خودای گەورە وسوننەتەکانی پێغەمبەر ((ﷺ))..

ئێمە پێی هەستین وەك ئەوەی پەرستن وخێری بۆ ئێمە تیادا بێت..

خودای گەورە پاداشتت لەسەر بداتەوە..

بۆیە تۆ بە جێی بهێنە هەرچ بنەماو یاسا یەك لە توانایی ولێهاتوویی و بەهرەداری کە پێی دەگەیت بۆ ئەوەی لە ئامادە باشیدا بیت..

ئەگەر پێم دەڵێیت: ناتوانم..!

منیش پێت دەڵێم: هەوڵ بدە..

ئەگەر پێم دەڵێیت: نازانم..

منیش پێت دەڵێم: فێر بە..

چونکە پێغەمبەر ((ﷺ)) دەفەرموێت :(( انما العلم بالعلم، وانما الحلم بالتحلم.. )).

واتە:(( زانست بە خۆفێرکردنە لەسەرخۆییش بە خۆڕاهێنانە.. )).

بۆچوونێك..

پاڵەوان ئەو کەسەیە تواناییەکانی هەردەم زیاترو زیاتر دەبێ وبەردەوام دەبێ لەسەر ئەوەی بەهرە وتواناییەکانی پێش بخات.. بۆ توانایی و دەسەڵات لە سەر پێشخستنی تواناییەکانی خەڵکی.. یان لەوانەشە بۆی بکرێت بەهرە و تواناییەکانی خەڵکی بەرەو باشترو چاکتر بگۆڕێ!!

| Be distinguish Person | كن شخصاً مميزاً |
|---|---|

## کەسێکی تایبەتمەندیدار بە..

بۆچی دوکەس لەجێگەیەك دادەنیشن لە دوای پەیوین مشت ومڕ دەکەوێتە نێوانیانەوە..
کەچی دووکەسی تر پەیوینیش(پەیڤین) دەکەن بەلاّم دەرئەنجام بەهێمنی ولە سەرخۆیی و بەیەك ئاشنابوون لەیەکرازی بوون کۆتایی پێ دێت..
ئەمەیە وەگەڕخستنی بەهرەو تواناکان لە پەیوین کردندا.. ئەی بۆچی دوو وتاربێژ هەمان وتار دووبارە دەکەنەوە بە هەمان و شە و دەربڕینەوە..

بۆ وتار بێژی یەکەم ئامادەبوان باوێشك وخەودەیانباتەوە.. یان خۆیان سەرقاڵ دەکەن بە وفەرشەی لەژێر خۆیاندایە..یان شێوازی دانیشتنیان دەگۆڕن، چەند جارێك لە ئەم شێواز بۆ ئەو شێواز.. بەلاّم ئامادەبوان بۆ وتاربێژی دووەم هەموو گیانیان دەبێتە گوێ و دەبیستن و تێکەڵ بە وتارەکە دەبن..

تەنانەت چاوتروکانێکیش ناکەن یان دڵیان ناڕوات .. ئەمە هەموو ی هۆی لێهاتوویی و شارەزایی و پسپۆرییە لە دەربڕیندا..ئەی بۆچی کەسێك لە ناو کۆڕو کۆمەڵێکدا ئەگەر هاتە قسە هەموو خەڵکانی تر چاوی تێ دەبڕن گوێ بیستی وتەکانی دەبن.. بەلاّم کەسێکی تر ئەگەر قسەی کرد خەڵك هەریەکەو خۆی بە کەس تەنیشت خۆیەوە سەرقاڵ دەکات.. یان بە خوێندنەوەی کورتە نامەکانی مۆبایلەکەیەوە خۆی سەرقاڵ و خەریك دەکات.. ئەمە هۆیەکەی شارەزایی و پسپۆرییە لە قسەکردندا..

ئەی بۆچی ئەو مامۆستایە لە هەر کوێوە بڕوات قوتابیان ڕێگەی لێ دەگرن چواردەوری لێدەدەن..

ئەمەیان تەوقەی لەگەڵ دەکات.. ئەوەیتریان راوێژی پێ دەکات.. قوتابی سێیەم کێشەی خۆی بۆ باس دەکات.. تەنانەت ئەگەر بچێتە جێگەی دانیشتنی خۆشی دەرفەتی قوتابیان بدا و بچنە ژووریێ بۆ لای، ژوورەکەی پڕدەکەن..
بەکورتی هەموویان حەزیان بە دانیشتنی لە گەڵی هەیە..؟؟

بەڵام مامۆستایەکی تر.. یان زۆربەی مامۆستایان هیچ قوتابییەك سەلامیشی لێ ناکات، کەس بە روویەوە پێ ناکەنێ.. خۆی چۆن بە تەنها دێتە قوتابخانەوە بەهەمان شێوە بەتەنها دەڕواتە دەرەوە..
ئەگەر لە بەیانی تا ئێوارە دەرگای هۆدە و جێگەکەی کرابێتەوە کەس رووی تێ ناکات.. کەس لە قوتابیان حەزیان بەدانیشتن نیە لەگەڵی..
بۆ چی؟!!
بەراستی ئەمە لێزانی ولێهاتووییە لە هەڵسووکەوت لەگەڵ خەڵکی..
ئەی بۆچی ئەگەر کەسێك هاتە ناو کۆڕێکەوە خەڵکی پێخۆشحاڵن پێی روویان خۆش دەبێ لە گەڵی.

هەر هەموو خەڵك حەزیان بەوەیە کە لەپەنای ئەو دانیشێ..بەڵام کەسێکی تر دێتە ژوورەوە، ئەگەر تەوقەی لەگەڵ بکەن بەساردییەوە لەگەڵی دەکەن– یان هەروەك موجامەلەیەك ونەریتێك لەپاشاندا کابرا ئەم لادەکات و ئەولا دەکات، جێگەیەکی دەست ناکەوێت کە تیایدا دابنیشێ، هیچ کەسێك ئامادە نییە جێگەی بۆ بکاتەوە ،یان هیچ کەس حەزی بەوەنییە لە پەنای خۆی دابنیشێ؟!!

بە راستی لێهاتوویی وهونەری کارتێکردنە لەسەر هەست ونەستی خەڵکی بۆچی ب ئەگەر باوکێك هاتە ژوورەوە منداڵەکانی..
زۆر بەخۆشحاڵییەوە باوەشیان بۆ باوکیان دەکەنەوە.. بەڵام باوکێکی تر منداڵەکانی هەر بە خێرهاتنەوەیشی ناکەن..

بەراستی لێهاتوویی هەڵسووکەوت کردنە لە گەڵ منداڵەکانیان..
بەهەمان شێوە بڵێ بۆ مزگەوت.. شایی کردن.. بێجگە لەمانەش..

خەڵکی جیاوازییان هەیە لە تواناییان بۆ هەڵسوکەوت کردنیان بەرانبەر خەڵکانی ترە..
بێ گومان خەڵکیش جیاوازییان هەیە بۆ گرنگیپێدان ورێگەی هەڵسوکەوت لە گەڵیان..
کاریگەری لە خەڵکی بە دەست هێنانی خۆشەوستییان ئاسانترە لەوەی کە تۆ زۆر بە زەحمەتی دەزانی..!
ئەمەش هیچ زیادەرەوی نیە کە دەیڵێم بەڵێ خۆم ئەمەم زۆر جار تاقی کردووەتەوە..

بۆم دەرکەوت کە زۆر بەی کەسان لە ئێمە دەتوانین کاریگەری وشوێنەوار لە دڵی خەڵکیدا بەجێبهێڵن، بە رێگەی زۆر ئاسان وتوانایيەکی سادە.. بە مەرجێك ئێمە راست بکەین تیایدا خۆمانی لەسەر رابهێنین وبەرێك وپێکی وجوانی وتەواوی پێی هەستین..

خەڵکیش سەرسام وکاریگەری ئێمەیان لەسەر دیارە لە هەڵسوکەوتی ئێمە لە گەڵ ئەوان ..
ئینجا ئێمە هەستی پێ بکەین.. یان هەستی پێ نەکەین.. ئەوە شانزە ساڵە من پێشنوێژ ووتارخوێنم لە مزگەوتی کۆلیژی سەربازی.. لە رێگەی مندا بۆ مزگەوت ئەبێت بە دەرگایەك دابڕۆم کە پاسەوانێکی ئاسایش دەرگاکە بکاتەوە ودایبخاتەوە..

منیش هەردەم سوور دەبووم لە سەر ئەوەی هەر جارێك بە وێدا بچم خەندەو رووخۆش بم لە گەڵی.. بەم شێوەیە بەهەر دوو دەستم سڵاوم دەکردوو خەندەو روو خۆشیم پێوەدیار و ئاشکرابوو... لە دوای نوێژیش سواری ماشینەکەی خۆم دەبووم بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە..زۆر جار لە گەڕانەوەم سەرقاڵ دەبووم بە خوێندنەوەی ئەو کورتە نامانەی کە لە کاتی نوێژەکەمدا بۆم هاتبوون.

کابرا دەرگاکەی کردەوە وتی یاشێخ تۆ لە من زویری..؟ وتم: بۆچی؟ وتی چونکە لە هاتنت رووت لە گەڵم خۆش بوو.. بەڵام کە گەڕایتەوە بەس سەلامت لێکردم..بۆچی؟!!

منیش ،وتم: نەخێر هیچ لە تۆ زویر نیم، داوای لێبوردنم هەیە.. ئەویش، ئەو بەستەزمانە دەستی کرد بە سوێندخواردن کەمنی خۆش دەویٚ و حەزی بە بینینی من هەیە..

بەم شێوەیە دڵنیابووم ئەم جۆرە بەهرە وهونەرە ئەگەر ئێمە خۆمانی لەسەر رابهێنین ئەوا دەبێتە بەشێك لە ئێمە ولێمان جیانابێتەوە ،هەر دەبێتە سروشت ونەریتمان..
خەڵکانیش زۆر بەچاکی تێبینیی خۆیانی لەسەر دەکەن تەنانەت ئەگەر ئێمە خۆمان جاروبار لێی بیٚ ئاگا بین..
ماڵ و سامان کۆدەکەیتەوە لەسەر ئەوەی خەڵکی لە خۆت زویر بکەیت –نەکەیت ئەم کارە بکەیت..
چونکە بەراستی بەدەستهێنانی خۆشەویستیی خەڵکی بۆ تۆ رێگەیە بۆ بەدەستهێنانی ماڵ وسامان..
چێژ لە توانایی ولێهاتووییەکانی خۆت وەرگرە.. لێهاتوویی خۆشییەکی هەست پێکراوە. مەبەست ئەوە نییە تەنها خاوەن پاداشتی دوا رۆژ دەبیت، بەڵکو خۆشی وسەر بەستییە ودڵشادبوونە ،لە راستیدا خۆت بە خۆت هەستی بیٚ سنووری پیٚ دەکەیت..

بۆیە چێژی لیٚ بکە، هەڵسوکەوتی لەگەڵ هەموو خەڵکی پیٚ بکە، گەورەو بە ساڵداچوو بن یان منداڵ وگەنجبن و سەرەتای تەمەنیان بێت، دەوڵەمەند وهەژاربن.خزمت بن یان دوور بن لێت.. هەر هەموویان بەبیٚ هیچ جیاوازیەك..
ئەم تەکنیکەیان... لەگەڵ بەکاربهێنە .. بۆ ئەوەی خۆت لە خراپە وشەڕیان دوور بخەیتەوە..

یان بۆ ئەوەی خۆشەویستیان بەدەست بهێنی.. یان بە نیازی چاکردن و چاکسازی لێکردنیان..
بەڵیٚ چاکسازی لیٚ کردنیان..عەلیی کوڕی جەهم هونراوە بێژێکی زمان پاراو بوو..
_بەڵام دەشتەکی بوو.. وشکوبرینگ بوو.. هیچ شتێکی لە ژیاندا نەدەزانی تەنها ئەوەندە نەبیٚ لە بیابانەکاندا دەیبینی.. جێنیشی موسوڵمانان ئەوکات ((المتوکل)) بوو زۆر دەسەڵاتدار بوو.. چی بویستایە بۆی جێبەجیٚ دەکرا..

جارێك ئیبن جەهم چووە لای لە بەغداد .. پێیان وتبوو هەرکەس بە ((المتوكل))دا بهەڵبەستێت بە هۆنراوە ئەوا خەڵاتی زۆر گەورەی دەکات.. بۆیە ئیبن جەهم دڵی بەمە زۆر خۆش بوو.. بەرەو تەلاری کۆشکی پادشا چوو .. چووە لای المتوكل..
وا سەیر دەکات هۆنراوە بێژان هۆنراوەی خۆیان بەسەر (المتوكل) دا دەڵێن و خەڵاتی زۆر گەورە وەردەگرن..

بەڵام ئەوەمان لەبیرنەچێت (المتوكل) کابرایەکی دڵ رەق بوو ئەگەر لە زەوقی بدرایە .. تۆرەی لەبەرامبەر زۆر بەئێش وئازار دەبوو..

عەلی کوڕی جەهمیش دەستی کرد بە پیاهەڵدانی (المتوكل) بەوشتانە کە لە بیابانەکاندا رۆڵ کاری گەرییان هەیە وەك ئەوەی سەگ بەوەفایە..
ئازا و دلێرە وبوێرە بە داڵغەی خۆی لایەنە باشەکانی سەگی لە (المتوكل) دا دەخوێندەوە..
بەڵام( المتوكل) زۆر تووڕە بوو چونکە پێشتر هۆنراوەبێژان وەك مانگ و ئەستێرە نموونەی بۆدەهێننەوە بەڵام ئێستاش ئەوە حاڵە؟!

بۆیە پاسەوانەکان دەستیاندایە شیرەکانیان بۆ سەر لێکردنەوەی عەلی کوڕی جەهمی شاعیر بەڵام بەهەر هۆیەك بێت خلیفە المتوكل ..
زانی وبۆی دەرکەوت ئەم بەم هۆنراوانە مەدحی خەلیفەی پێ دەکات ، بەڵام لە ژیانی دونیا هەر ئەوەندەی دیوە؟!!

بۆیە بۆ نزیکەی حەوت مانگ لەلای خۆی میوانداریی کرد هەموو خۆشییەکانی دونیای پێ تام وچێژ کرد. ئەوجا هێنایەوە ناو شاعیران، وتی: بڵێ ئەی عەلیی کوڕی جەهم..
ئەویش پیاهەڵدانێکی سەرسوڕمانی بە خەلیفەدا وت بووە مایەی سەرسوڕهێنەری سەرجەم شاعیران وپیاوماقوڵان..
مەبەستمان ئەوەیە: بڕوانە چۆن خەلیفە توانی نەریت وسروشت وبەهرەی عەلی کوڕی جەهم بگۆڕێ..

بەڵام ئێمە چەندە دڵتەنگ دەبین بە خوو رەوشتی منداڵەکانمان.. یان هاوەڵان وبرادەرانمان
ئایا هەوڵمانداوە بۆ گۆڕینیان.. ئێمەش گۆڕیبێتمان؟..
بەڵێ چاکتر دەتوانی خۆت وسروشتی نەریتی خۆت بگۆڕیت.. دەم وچاوگرژیت بەخەندەو پێکەنین.. تورەییت بە لێبوردەییت..
رەزیلیو چاوچنۆکی بەسەخاوەت ودڵفراوانی.. ئەمەش هیچ گرانیەك و زەحمەتێکی تیادانییە..

بەڵام پێویستی بە بەویستن و بەردەوامیەتی ئێمە هەیە لەسەری.. شارەزایی وپسپۆڕی وتەکنیکی تایبەتی خۆی بۆ بگرینەبەر..
کەواتە پاڵەوان بەودەست پێ بکە .. هەرکەس بە وردی بڕوانێتە ژیاننامەی پێغەمبەر ((ﷺ)) دەزانێت چۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵ خەڵکیدا دەکرد بەهرە وتەکنیکی جوان ولێهاتوویی.. دڵەکانیانی بەلای خۆیدا راکێشابوو..

ئەمە لە کاتێکێکا ئەوەش بزانە ئەم رەوشتە بەرزانەی پێغەمبەر((ﷺ)) ئەوە نەبوو زۆر لە خۆکردن بێت لە پێش چاو خەڵکیدا بێت..
کاتێك چووە ناو ماڵ ومنداڵی ئەم رەوشتە بەرز وبێوێنانەی لە گەڵ نەبووبێ بەڵکو خۆی دەفەرموێت (چاکترین کەستان ئەوەتانە کە بۆ خێزانەکانتان چاك بن ،منیش لە هەمووتان چاکترم بۆ خێزانەکانم..
نەك بێتەوە لەماڵدا لێبووردەیی بکات بە تووڕەیی یان نەرم ونیانییەکەی بە دڵ رەقی..
نەخێر .. روو کراوە نەبووە لە دەرەوە.. داخراو بێت لەماڵەوە.. سەخی نەبووە لەگەڵ خەڵکی ودەستگیرۆ بوو بێ لەگەڵ ماڵ ومنداڵ وخێزانی.. نەخێر .. رەوشتە بەرزو بێ وێنەکانی لە ناخ ودڵیەوە هەڵ قووڵابوون..
بەڵکو بەشێك بوو لەجەستە و رۆح ودەروونی لێ پێك هاتبوو وەك سەرجەم ئەندامە کانی تری لاشەی وابوو..بە هیوای پاداشتی خوداو بەپەرستنی دەزانی..
وەك چۆن نوێژەکانی بەپەرستن وهیوای پاداشت پێبوونی بوو..
خەندەی بە لەخودای گەورە نزیك بوونەوە دەزانی.. نەرمی بەپەرستن دەزانی..

لێبوردەیی ولێخۆشبوونی بە ئەو پەڕی چاکەکان دەزانی.. بەراستی هەر کەسێك رەوشت بەرزی بە پەرستن بۆ خودا بزانێت..

ژنەوا هەردەم لەگەڵی دەبێ وخۆش جوان ورازاوە تر دەکات.. لە ئاشتی و لە جەنگبوونیدا.. لە برسێتی وتێربوونیدا.. لە ساغی و لە نەخۆشیدا.. بەڵکو لە خۆشی و ناخۆشیدا..
بەڵێ .. زۆر لە ئافرەتان گوێیان لە مێردەکانی خۆیان دەبێت .. باس لەرەوشتیان .. سینەو سینگ فراوانیان.. خەندەو سەخاوەتیان ..
بەڵام ئافرەتانی هاوسەرانیان تەنها بە گوێیان ئەوشتانە لەمێردەکانیان دەبیستن و لە رۆژانەی ژیانی خۆیاندا هەرگیز ئەم رەوشتانە ناخرێنە باری کارەوە و پیاوانیان بەکارو کردار ئەم رەوشتە نیشانی خێزان ومنداڵەکانیان بدەن..

بۆیە پیاوان لەماڵدا رەوشتیان ناشیرینە.. دڵ وسینەیان گوشراوە.. روویان گرژە.. هاوارکارو جنێوو نەفرین نەفرین کارن.. چاوچنۆك وهەردەم چاکەوچاکەکاری بە منەتی دەزانن بەسەر ماڵ ومنداڵەکانیاندا..
بەڵام پێغەمبەر ((ﷺ)) دەفەرموویێت:(( خيركم خيركم لاهله، وانا خيركم لاهلي))..رواه الترمذي وابن ماجة وهو صحيح ..
ئینجا وەرە بڕوانە کردەوەی پێغەمبەر ((ﷺ))لە خێزان وماڵ ومنداڵەکانی خۆیدا..خاتوو عائیشەی خێزانی دەفەرموویێت پێغەمبەر ((ﷺ))لە خزمەت خێزانەکانیدا بوو..
واتە یارمەتی دەریان بوو بۆ ئیش وکاری ناوماڵ..
کاتێکیش بانگ بدرایە دەست نوێژی دەگرت و دەچوو بۆ مزگەوت..
بەهەمان شێوە بڵێ بۆ دایکان وباوکان.. زۆر کەس لەرەوشت بەرزی وجوانیانە لەگەڵ خەڵکانی دەرەوە.. سەخین وخەندەدار و رووخۆشن.. بەو پەڕی شێوازی جوانییەوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکەن..
بەڵام لەگەڵ نزیکترین کەس لێیانەوە .. گەورەترین کەس کە مافی رەوای بەسەریانەوەیە.. لەگەڵ دایکان و باوکان وخێزان ومنداڵەکانیان وشکو برینگن، دڵ رەقن... تەنانەت قسەیان لەگەڵ ناکەن..

بەڵێ چاکترین کەستان ئەوەتانە چاکترینتان بن بۆ کەس وکاریان.. بۆ دایك وباوك .. بۆ خێزان..تەنانەت بۆ منداڵەکانیشی..

لە رۆژێکی پڕ هەستیار وخۆشی بێ وێنەدا.. هاوەڵانی پێغەمبەر ((ﷺ)) لەگەڵی دانیشتبوون.. حەسەن یان حوسێن دێت.. پێغەمبەر ((ﷺ)) بە ئامێزوسینگی خۆیەوە دەگرێت..

ئەویش میز دەکاتە سەرسینگی پێغەمبەر ((ﷺ))هاوەڵەکەی دەڵێت: هەتا میزی منداڵەکە بەسەر سینگی پێغەمبەردا ((ﷺ)) هێڵیخۆی کێشا..

دەڵێت :ئێمە پڕماندا منداڵەکە لەسەر سینگی لابدەین..بەڵام پێغەمبەر ((ﷺ)) فەرمووی: ((واز لە منداڵەکەم بهێنن.. مەیترسێنن ئەو منداڵە شیرینەم..

کاتێك منداڵەکە لە میزەکەی خۆی بووەوە..)) پێغەمبەر ((ﷺ)) داوای ئاوی کرد خۆی پێ خاوێن کردەوە١.. رواه احمد والطبراني ورحال ثقاب"

ئای بۆ خاتری خودای گەورە چۆن دەروونی پێغەمبەر ((ﷺ)) لەگەڵ ئەم رەوشتە بەرزو بێ وێنانەدا تێکەڵکێش و لەیەکنەبڕاوە بووە.. !؟

ئەگەر ئەم نموونانە بزانین ئەو کات سەرمان سوڕنامێنێ لەوەی کە چۆن پێغەمبەر ((ﷺ)) توانیویەتی دڵی گەورەو بچووك بۆ خۆی کۆنتڕۆڵ بکات..

بۆچوونێك..

لە باتی ئەوەی قسە بە تاریکی بڵێیت...هەوڵ و تێکۆشانی بێوچان بدە بۆ چاککردنەوەی چرا و گڵۆپەکە..

| With poor | مع الفقراء |
| --- | --- |

## لەگەڵ هەژاراندا..

زۆرن ئەو کەسانەی ئەمڕۆ رەوشتیان بازرگانییە.. هەر بۆیە لەلای ئەوان تەنها دەوڵەمەندەکان قسە خۆشن وخەڵك بە پێکەنین دەخەن
بۆیە پێدەکەنن کاتێك گوێبیستی دەبن.. هەڵەکانیشیان هەرچەندە گەورە بن هەر بە بچووکییان دەزانن وچاوپۆشییان لێ دەکەن..
بەڵام هەژارەکان: قسەیان قورسە..گاڵتەیان پێ دەکەن کاتێك گوێ بیستییان دەبن..
هەڵەکانیان با زۆر بچووکیش بن بەڵام لێخۆشبوونی نیە و زۆر گەورەیە لە پێش ئەواندا. کاتێك ئەم هەڵەیە بکەن هاواریان بەسەردا بەرز دەکەنەوە..
بەڵام پێغەمبەر ((ﷺ)) سۆزی یەکسان بوو بەسەر هەژاران ودەوڵەمەنداندا.. ئەنەسی کوڕی مالیك دەفەرمووێت: کابرایەکی دەشتەکی ناوی زاهیری کوڕی حیرام بوو..
جاروبار دەهاتە شاری مەدینەوەو کاروپیشەی خۆی دەکردو دەگەڕایەوە .. لەگەڵ خۆیدا هەندێك کەشك ورۆنی گوندی دەهێنا بە (دیاری) بۆ خزمەت پێغەمبەر ((ﷺ)) ..کاتێکیش بگەڕایەتەوە بۆ گوندەکەی پێغەمبەر ((ﷺ)) هەندێك خورماو شتی تری تایبەتی لەگەڵ بەڕێ دەکردەوە...
پێغەمبەر ((ﷺ)) ئەم کابرایەی زۆر خۆش دەویست.. دەیفەرموو ((ﷺ)) : (ان زاهرا بادیتنا.. ونحن حاضروه).
واتە: (زاهیر گوندە بۆ ئێمە ... ئێمە شارین بۆ ئەو ..) .
ئەم کابرایە هەتا بڵێی ناشیرین وهەژار بوو.. دەمو چاوی رەش بوو. پرچی ئاڵۆزبوو..سەری خواروخێچ بوو.. لاواز وبێ هێز بوو....

رۆژێك لە گوندەکەی خۆیەوە دەرچوو.. هاتە ماڵی پێغەمبەر ((ﷺ))..

بەڵام پێغەمبەر ((ﷺ)) لەماڵ نەبوو.. ئەویش هەندێ شتی گوندی هێنابوو بۆ فرۆشتن، بۆیە ڕووی لە بازاڕ کرد بۆ فرۆشتنیان..

کاتێك پێغەمبەر ((ﷺ))ئەمەی زانی بەرەو بازاڕ بەدوایدا چوو وگەڕا بەدوایدا ...

هەتا پێی گەیشت ئەوسەرقاڵی فرۆشتن بوو.. ئارەقی گەرمی هاوینی لێ دەچۆڕایەوە... جل وپۆشاکی لادێیی لەبەردابوو بە شێوازو بۆنی ناشیرین وناخۆشەوە..

لەنا ئەو بازاڕەدا پێغەمبەر ((ﷺ)) لە پشتەوە گرتی، زاهیریش پێغەمبەری ((ﷺ)) نەدی .. نەی زانی ئەوە پێغەمبەرە ((ﷺ)) کە گرتوویەتی..

بۆیە ترساو دەیوت بەرم بدە.. تۆ کێیت؟

پێغەمبەریش ((ﷺ)) بێ دەنگ بوو خۆی ئاشکرا نەکرد. زاهیریش هەر هەوڵی ئەوەی دەدا خۆی رزگار بکات لەو گرتنە.. ڕووی کردەوە دواوە.. پێغەمبەری ((ﷺ))دی ئەو کات دڵی دڵنیابوو لە پێغەمبەر ((ﷺ)) ترسەکەی لێ ڕۆیشت..

بۆیە پشتی خۆی بەسینگی پێغەمبەرەوە ((ﷺ)) دەنا کاتێك زانی ئەوە پێغەمبەرە ((ﷺ)).

بۆیە پێغەمبەر ((ﷺ))دەستی کرد بە سووعبەت وگاڵتە کردن لەگەڵ زاهیردا.. بە دەنگی بەرزەوە بەخەڵکی دەفەرموو ((ﷺ)):(من يشتري العبد؟.. من يشتري العبد؟..

واتە: (کێ بەندەو کۆیلە دەکڕێت؟ کێ بەندەو کۆیلە دەکڕێت؟..

زاهیریش وا جوان سەیری حاڵی خۆی دەکات .. کە هەژارێکی زۆر بی دارەو بێ نەوازە.. نەماڵ.. نە جوانی..

بۆیە وتی: کەواتە ئەی پێغەمبەری خودا((ﷺ)) سوێند.. بە خودا کەس من لە تۆ ناکڕێت.. کەم بەهام..

بەڵام پێغەمبەر ((ﷺ)) فەرمووی :((بەڵام تۆ لەلای خودای گەورە بێ بەهانیت بەڵکو زۆر بەسەنگ و بە بەهایت لەلای خودای گەورە..))

بۆیە هیچ سەرسوڕامینێ کاتێك دڵانی هەژاران وبێ نەوازان بە پێغەمبەرەوە ((ﷺ)) بەسترابوو چونکە ئەو بەم ڕەوشتە بەرز بێ وێنانە دڵی ئەوانی بەلای خۆیدا ڕاکێشابوو..

زۆرێك لە هەژاران..

لەوانەیە رەخنەیان نەبێت لەدەوڵەمەندو سەرمایەدارەکان بە هۆی چاوچنۆکی وپێ نەدانی سامان بۆیان. بەڵکو رەخنەی ئەوەیان لێ دەگرن بێ سۆزن بەرامبەریان هەڵسوکەوتی جوانیان بە پێی پێویست لەگەڵ ناکرێت..

چەندان لە هەژاران بە روویانەوە پێ کەنیویت وخەندەدار بوویت بە رووياندا.. هەستی ئەوەت تیادا درووست کردووە کە نرخ وبەها و رێزی هەیە..
ئەوکات ئەویش لە تاریکیی شەودا دەستی پاڕانەوەو نزاو لاڵانەوە بەرز دەکاتەوە بۆ ئەوەی خودای گەورە سۆزو رێزی تۆ بگرێت..
هەر بەو هۆیەوە میهرەبانیی خودا دادەبەزێتە سەر سەری تۆ لە ئاسمانەوە..

لەوانەشە کەسێك دەربکەوێت و دەرگای لێ نەکرێتەوە سەرو پرچ تێکچوو بێ.. تەپ وتۆزی لەسەر نیشتبێ..
بەڵام ئەگەر سوێند بە خودای گەورە بخوات کە ئەبێت بۆی بەجێبهێنێ بۆی بەجێ دەهێنێ، ئەمەش دەقی فەرموودەیە..
بۆیە هەردەم بە خەندە بە لە گەڵ بێ نەوازو هەژاراندا..

ئاماژەیەك...
((لەوانەیە خەندەیەکت بە رووی هەژارێکەوە..
پلەو پایەیەکانت لەلای خودای گەورە پایەدار تر بکات..))

| With Women | مع النساء |
|---|---|

## ئافرەتان.. یاخود (ژنان)

لە باپیرمەوەن گوێم لیٚ بووە دەیوت قسەیەکی نەستەقی کۆن هەیە دەڵێت: (من غاب عن عنزه جابت تیس)..

واتە : ((هەر پیاوێك سۆز بە ئافرەتەکەی خۆی نەدات ئافرەتەکە بەدوای سۆزدادەگەڕێت..))

ئەگەر بە قسەی خۆش وشیرین بانگی بکەن..

ئەگەر خودای گەورە شان وشەوکەتی داوە بە پیاو .. سۆزو خۆشەویستی داوە بە ئافرەت..

زۆرمان لە گەورە پیاوانی ژیان وجیهان دی کە هێزو بازوویان دەپۆرتکیٚ لەبەرامبەر سۆزو خۆشەویستی ئافرەتدا..

لە لیٚزانی و تەکنیکی هەڵسوکەوت لەگەڵ ئافرەتان ئەوەیە بزانیت بەکام کلیلە تۆ دەتوانی کاریگەری خۆت بکەی لەسەری.

ئەویش سۆزە.تۆش بەم چەکەی ئافرەت خۆی لەگەڵی بکە..

هەر بۆیە پێغەمبەر ((ﷺ)) ئامۆژگاریت دەکات کە چاکەکارو سۆزداربیت بەرامبەر خێزانەکەت سۆزەکەیش بگرێت..

بۆ ئەوەی بەختەوەرو کامەران بیت لەگەڵی..

بەهەمان شێوە ئامۆژگاری باوکان دەکات کە چاکەکار بن لەگەڵ کچانیان سۆزیان بۆیان هەبێت.. بۆیە دەفەرمووێت : ((من عال جاريتين حتى تبلغا جاء يوم القيامة انا وهو ، وضم اصابعه))(رواه مسلم ).

واتە هەرکەسێك دوو کچ پەروەردەو بەخێو بکات من و ئەو لە قیامەتدا وەك ئەم دوو بەنجەواین..

بەهەمان شێوە ئامۆژگاری منداڵانیش دەكات كە ئەو پەڕی چاكەكار بن لەگەڵ دایكان و باوكانیاندا كاتێك پرسیاری لێكرا(من احق الناس بحسن صحبتي؟ كێ لە هەموو كەس زیاتر پێویستی بە هاوەڵی وچاكەكردنی من هەیە؟

پێغەمبەر ((ﷺ)) فەرمووی:( ( امك.. دایكت . ثم امك.. لە پاشاندا دایكت، ثم امك.)). لە پاشاندا دایكت.. ثم ابوك لە.. (متفق علیه )

لە پاشاندا باوكت هەتا ئامۆژگاری بۆ ئافرەتانیش دەكات كە ئێمە لەگەڵیان لەوپەڕی چاكی وباشیدابین.. یان لێیان تووڕە نەبین..بڕوانە پێغەمبەر ((ﷺ))كە هەستا بێ لە كاتی حەجی ماڵ ئاواییدا.. ئەوا زیاتر لەسەد هەزار حاجی راوەستاون چاوەڕوانی دوائامۆژگاریەكانی پێغەمبەر ((ﷺ)) دەكەن..

لە ناویاندا پێست رەش وپێست سپی.. گەورەو بچووك .. هەژارو دەوڵەمەند.. بەدەنگێكی زۆر بەرز هاواری كرد و ئامۆژگاری كردن و پێی فەرموون: (الا واستوصوا بالنساء خیرا.. الا واستوصوا بالنساء خیرا..رواه مسلم

واتە: (ئاگاداربن ئامۆژگاریی خێری ئافرەتان بكەن.. ئاگادار بن ئامۆژگاریی خێری ئافرەتان بكەن..) رۆژێك لە رۆژان هەندێك لە ئافرەتان هاتنە ماڵی پێغەمبەرو ((ﷺ)) شكات و سكاڵای خۆیان بەخێزانەكانی پێغەمبەر ((ﷺ))راگەیاند. ئەوانیش پێغەمبەریان ((ﷺ)) لێ ئاگادار كردەوە.. كاتێك ئەمەی زانی .. هەستاو.. فەرمووی بەخەڵكی: (لقد طاف بآل محمد صلی الله علیه وسلم نساء كثیر یشتكین ازواجهن.. لیس اولئك بخیاركم..

واتە: (بەراستی زۆرێك لە ئافرەتان هاتوونەتە ((ﷺ))ماڵی من سكاڵای حاڵی خۆیان لەلای خێزانەكانی من كردووە كە پیاوانیان بۆیان چاك نین.. بزانین ئەوانە چاكە كانتان نین.. بزانین ئەوانە چاكەكانتان نین..

تەنانەت .. رێزو بەهای ئافرەت لە ئاییندا گەیشتووەتە ئەو رادەیەی كەسەر و گەردەنیان لە پیاودا بۆ بپەڕێت و جەنگی لە پێناودا بەرپابێت لە پێناو ئەوەی هەتك وحورمەت وئابڕووی تەنیا یەك ئافرەت چووە یان سووكایەتییان پێ كردووە..

رۆژێك لە رۆژان ئافرەتێكی داوێن پاكی داپۆشراو پارچە زێڕێكی پێ دەبێ بۆ فرۆشتنی روو لەبازاڕی زێڕینگرەكان دەكات بۆ فرۆشتنی )) ئەو بازاڕەش دوكانەكانی زیاتر یەهودییەكان

بوون. زۆریش نابێت ئایەتی داپۆشین و بالاّ پۆشی دابەزی بوو بۆیە یەهودییەکان زۆر لەسەر دڵیان گران بوو. . چاو تێرکردنیان نەما لە ئافرەتانی بیّ تاوانی بەستەزمان..

بۆیە حەزیان بەوە دەکرد ئەم ئافرەتە داوێن پاك و بالاّپۆشە دەموچاو رووی خۆی دەرخات بۆ ئەوەی گاڵتەی پیّ بکەن وپێی رابوێرن بەلاّم ئافرەتەکە بەرهەڵستی کرد ئەوانیش زیاتر توانییان سووکایەتی بکەن بە جەستەی ئافرەتەکە بۆیە ئەویش هاواری کرد وتی: ((خۆزگە ئەو جەستە تان بکوشتایە نەك سوکایەتی پیّ بکەن)) موسوڵمانێکیش لەویّ گوێی لیّ بوو غیرەت گرتی .. دەستی دایە شمشێرەکەی کابرای دەستدرێژیکاری کوشت کۆمەڵە یەهودییەکیش توانیان شەهیدی بکەن..

کاتێك پێغەمبەر ((ﷺ)) ئەمەی زانی کە یەهودییەکان سۆزو پەیمانی خۆیانیان شکاند.. تەنانەت دەستدرێژیش دەکەنە سەر ئابڕوی ئافەرتانی موسوڵمانان.. بۆیە ئابلوقەی دان.. ئەوانیش خۆیان دابەدەستەوە.. کاتێك پێغەمبەر ((ﷺ)) ویستی تۆڵەیان لیّ بکاتەوە... سەربازێك لەسەربازەکانی شەیتان لە جل و بەرگی مرۆڤدا ..

ئەو کەسانەی کە هیچ گرنگی نادەن بە ئابڕوی موسوڵمانان.. نە بۆ پاراستنیشی هەولّ دەدەن.. تەنها گرنگی و هەوڵدانی خۆشی ئارەزووەکان و تێرکردنی سکیەتی..

کە سەرۆکی دووڕووەکانی شاری مەدینە بوو عەبدوڵلاّ کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول ..

وتی: ئەی (محمد) ((ﷺ))چاکەت هەبیّ لە گەلّ ئەو کەسانەی کە هاوسۆزو پەیمانی من بوون.. بەلاّم پێغەمبەر ((ﷺ))رووی لیّ وەرگێڕا.. دوو رووەکە ئەوەی کە دەیەوێت داوای لێبوردن بکات بۆ کەسانێك کە دەیانەویّ داوێن پیسی بلاّوبکەنەوە لەناو موسوڵماناندا!!

دووبارە هەستایەوە.. وتی:چاکەیان لەگەڵ بکە ئەی (محمد).. پێغەمبەریش دووبارە پشتی لیّ کردەوە.. چونکە ئابڕووی موسوڵمان سووکایەتی پێکراوە.. پاکیەتی سنووری بەزێنراوە..

کابرای دوو روو زۆر تووڕە بوو دەستی خستە ناو درعەکەی پێغەمبەر ((ﷺ)) ورایکێشا بۆ لای خۆی وتی چاکەت هەبیّ لەگەڵ سۆزدارانم بۆیە پێغەمبەر ((ﷺ)) تووڕە بوو چونکە ئەگەر چاوپۆشیی لە وکارە بەدرەوشتیە یان بکات ئەوا هی تریش بەدوادێت..

فەرمووی درعەکە بەردەو لێی تووڕە بوو بەلاّم کابرای دوو روو هەروازی نەهێنا.. هاوارو تکای

زۆری کرد لە پێغەمبەر ((ﷺ))ئازادیان بکات و بە تۆڵەی عادیلانە نەگەن. پێغەمبەریش ((ﷺ)) رووی کردە کابرای دوو روو و فەرمووی : ((ئەوان بۆ تۆن..)).

واتە: (( نەگەیشتن بە تۆڵەی خۆیان..))

بەڵام نەبێت لەشار دەربەدەر بکرێن ولەوێ نەمێنێن.. بەڵێ ئافرەتێکی لاواز بێ کەس لە ئیسلامدا شیاوی زیاتری بۆ هەیە بۆی بکرێت. .

(خەولە) ئافرەتێکی لەخودا ترس بوو.. پیاوەکەی زۆر زوو توورە دەبوو..

رۆژێك هاتەوە و داوای شتێکی لە خێزانەکەی کرد.. ئەویش بۆی بەجێ نەهێنا، کێشە کەوتە نێوانیانەوە ..

پیاوەکەی وتی:(( تۆ وەك پشتی دایکم وایت بۆ من)). توورە بوو رۆیشت وو لەماڵ دەرچوو..

ئەم سوێنەش پێشتر وەك جیابوونەوەو تەڵاقدان بوو لەلای ئەوان.. بۆیە ئافرەتەکەی خۆی دوورتر دەخستەوە لە پیاوەکەی ووتی سوێند بە خودای گەورە لەمن نزیك نابیتەوە هەتا خودای گەورە حوکمی خۆی لە نێوان من و تۆدا نەکات..

بۆیە (خەولە) هاتە خزمەت پێغەمبەر ((ﷺ)) باس وسکاڵای لە پیاوەکەی خۆی کرد.. بەڵام پێغەمبەر ((ﷺ)) هەر دەیفەرموو:

(( دان بە خۆتا بگرەو ئارام بە: ئەی (خەولە) ئەوە ئامۆزای خۆتە.. کابرایەکی بەتەمەنترە لە تۆ.. تۆیش لەخودا بترسە هەق ومافی رەوای خۆی بەجێبهێنە..)).. ئەویش دەیوت ئەی پێغەمبەری خودا بە گەنجی لەگەڵی بووم سکی خۆم بۆ کوڵی..

هەتا بە تەمەندا کەوتم ئێستا لێم جیادەبێتەوە..کە منداڵم نابێت.. ئەی خودایە من سکاڵای خۆم بۆ لای تۆ دەهێنم..

بۆیە پێغەمبەریش ((ﷺ)) چاوەڕوانی نیگای خودای کرد لەسەری ..

هێشتا هەر (خەولە).. لە خزمەت پێغەمبەردا بوو ((ﷺ)).

جبریل نیگای خودای بۆ پێغەمبەر ((ﷺ)) هێنا پێغەمبەر ((ﷺ)) رووی لە (خەولە) کردو فەرمووی: (( ئەوا خودای گەورە نیگای دەربارەی تۆو پیاوەکەت ناردووە..)) ..

لە پاشاندا ئەم سورەتەی خوێند: ((قد سمع الله قول التي تجادلك في زوجها وتشتكي الى الله والله يسمع تحاوركما ان الله سميع بصير)) هەتا ئەو ئایەتانە لە سورەتی (المجادلة))دا.

لەپاشاندا پێغەمبەر ((ﷺ)) فەرمووی بە پیاوەکەت بڵێ: (( بابەندەیەك (کۆیلەیەك) رزگارو سەربەست بکات..))ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ((ﷺ)) .. هیچ شتێکی نیە کە کۆیلەی پێ ئازاد بکات.. پێغەمبەر ((ﷺ)) فەرمووی: با رۆژووی دوو مانگ بەڕۆژوو بێت بەدوای یەکدا بەبێ نێوان خستن تیایدا..

(خەولە) وتی: سوێند بەخودا کابرایەکی پیرەو بەساڵدا چووە ناتوانێ بەڕۆژوو بێت.. پێغەمبەر ((ﷺ)) فەرمووی:(( با خواردنی شەست هەژار بدات لەخورما..))

(خەولە)وتی: ئەویشی نییە.. پێغەمبەر ((ﷺ))فەرمووی: (( ئێمە یارمەتی دەدەین بەنیوەی..)) ئافرەتەکەش وتی منیش بەنیوەکەی تر یارمەتی دەدەم. پێغەمبەر ((ﷺ))فەرمووی: چاك دەکەیت، خێرە بۆت.. برۆ لە جیاتی ئەو بەو خورمایە خێر بکە.. لەپاشاندا تۆ چاك بە لەگەڵ کوڕی مامەکەت..رواه ابو داود وهو صحیح.

پاك وبێگەردی بۆ ئەو خودایەی کە سۆزو میهرەبانیی خستبووە دڵی پێغەمبەرەوە ((ﷺ)) بۆ هەموو خەڵکی .. تەنانەت بۆ کێشەی تایبەتی خۆیشیان.. هەر چارەسەری بۆ دەکردن..

بەڵێ بە راستی من خۆم ئەمەم تاقی کردۆتەوە.. هەڵسوکەوت بە نەرم ونیانی لەگەڵ خەڵکی و سۆزو بەزەیی لەگەڵ کچانم و خێزانەکەمدا. لەپێش ئەمانیشدا نەرمونیانی لەگەڵ دایك وخوشکدا..

ئەمەم بە چاوی خۆم دی.. کاریگەری زۆر گەورەی هەبوو.. کە بەراستی چاوەڕوان نەکراوە تەنها بۆ ئەو کەسە نەبێت کە خۆی پێیان هەستا بێت.. ئافرەتان ڕێزیان لێ ناگرن ئەگەر ئەو کەسە نەبێت کە خۆی ڕێزدار بێت.. هەر کەس سووکایەتییان پێ بکات ئەوە خۆی سووك وچروکە..

هەڵوێستێك..

لە وانەیە ئافرەت دان بە خۆیدا بگرێت لە سەر هەژاری و نەداری پیاوەکەی..یان ئەگەر پیاوەکەی زۆر جوانیش نەبێت..
یان لەسەرقاڵی پیاوەکەی.. بەڵام کەم جاری وادەبێت کە بتوانێت دان بەخۆیدا بگرێت لەسەر رەوشتی خراپی پیاوەکەی بەرامبەری.. ((واتە ئافرەت بۆ سۆزیی پیاوەکەی پێ پەسەند ناکرێت و نابێت....))

| With slaves | مع الخدام |
|---|---|

## لەگەڵ خزمەتکاراندا..

**پێغەمبەر ((ﷺ)) شارەزاو پسپۆڕ بوو بۆ چوونە ناودڵەکانیان بەو شێوازەی کە دەرئەنجامی دەستکەوتنی خۆشەویستیی ئەوانە بۆ پێغەمبەر ((ﷺ))..**

**کاتێك مامی پێغەمبەر وەفات وکۆچی دوایی دەکات .. زیاتر ئەشکەنجەو ئازاریان توندتر بوو بۆ پێغەمبەر ((ﷺ))..**

**پێغەمبەریش ((ﷺ)) چوو بۆ شاری (تائیف) بۆگەیاندنی بانگەوازی خودای گەورە بۆ ئەوەی ببنە پاڵپشت بۆی بۆ بانگەوازەکەی..**

**هیوای ئەوەی هەبوو کە ئەو پەیامە پیرۆزەی لێ وەرگرن کە لەلای خوداوە پێی هاتووە..بۆیە پێغەمبەر ((ﷺ)) گەیشتە شاری (الطائف)(تائیف)..**

**لەگەڵ سێ کەسیان کۆبووەوە لە هۆزی سەقیفییەکان بوون کە ئەوانیش سەرگەورەی خێڵەکانی خۆیان بوون و براش بوون.. (عبد یالیل).. و(سعود).. (حبیب).. نەوەکانی (عەمری )کوڕی (عومەیر) بوون.. بۆیە پێغەمبەر ((ﷺ))دانیشت لەگەڵیاندا..**

**بانگی کردن بۆ بانگەوازی خودای گەورە.. باسی ئەوەی کرد بە نیازی ئەوە هاتووە وهیوای وایە پشت گیری لێ بکەن.. بەڵام ئەوان زۆر بە ناشیرینی وەڵامیان دایەوە..**

**بەم شێوەیە یەکێکیان وتی: ئەگەر خودا پێغەمبەری((ﷺ)) ناردبێ ئەوا ئەو لەسەر خۆی فەرز کردووە پەردەی کەعبە بدڕێنێ!!..**

**دووەمیان دەڵێ: بۆ خودا کەسی تری نەدیتەوە کە بینێرێ وبیکاتە پێغەمبەر((ﷺ)) بێجگە لە تۆ!!..**

سێیەمیان: زۆر بە فە لسەفەوە دەستی بەقسەکردن کرد: سوێند بە خودای گەورە هەرگیز قسەت لەگەڵ ناکەم! ئەگەر تۆ پێغەمبەر((ﷺ)) بیت وەك ئەوەی خۆت دەیڵێی زۆر لەوە گەورەتری کە من بتوانم وەڵامت بدەمەوە.. ئەگەر بەناوی خودای گەورەشەوە درۆبکەیت هەر پێویست ناکات من وەڵامت بدەمەوە..

کاتێك پێغەمبەر ((ﷺ)) ئەمەی لەئەوان گوێ لێ بوو.. کە هەڵوێستیان زۆر ناشیرین بوو.. بەڵام زۆر ترسا لەوەی ئەم هەواڵە بگاتەوە لای قورەیشییەکان داوای لێ کردن کە ئەم دانووستانە نەگەیەنرێنە قورەیشیەکان نەوەك زیاتر دژایەتی پێغەمبەر((ﷺ)) و بانگەوازەکەی بکەن..

بۆیە پێغەمبەر((ﷺ)) ئەمەی بە زمانی خۆی پێ وتن: ئەگەر باوەڕم پێ ناهێنن ئەوا ئەم هەواڵە بانهێنی بێت.. بەڵام بەداخەوە ئەمەشیان نەکردوو بەڵکو منداڵ و شێتەکانی خۆیانیان لە پێغەمبەر((ﷺ)) بەردا بەرد بارانیان کرد بە قسەو بەجنێو بە دووای دەکەوتن..

هەتا پێغەمبەریش ((ﷺ))خۆی کرد بە بێستانی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە.. شەیبە کوڕی ڕەبیعە.. ئەوانیش لەناو باخەکەی خۆیان بوون .. بۆیە منداڵ و شێتەکانیش وازیان لێهێناو گەڕانەوە.. لەدوای ئەوەش پێغەمبەر ((ﷺ)) زۆر هیلاك وماندوو بوو بۆیە لە ژێر سێبەری دار مێوێکدا هەندێك حەوایەوە..

هەردوو کوڕەی ڕەبیعەش سەیری پێغەمبەریان ((ﷺ))کرد کە چۆن جنێو و بەردباران کرا لەلایەن منداڵان وشێتەکانی تائیفەوە.. کاتێك ئەم حاڵەتە یان دی کە بەسەر پێغەمبەردا ((ﷺ))هاتووە سۆزیان بۆ پێغەمبەر چوو..

خزمەتکارێکیان هەبوو.. گاور بوو.لەسەر دینی پێغەمبەر عیسا ((ﷺ)) بوو ناوی عەداس بوو وتیان هەندێك هێشووە ترێ ببە بۆ ئەو کەسەی کە لە سێبەری ئەودار مێوەدا دانیشتووە بۆ ئیسراحەت وەرگرتن بەڵام بەهیچ شێوەیەك قسەی لەگەڵ نەکەیت پێی بڵێ بالەوترێیە بخوات..ئەویش ئەوەیکرد..

هەتا پێغەمبەر((ﷺ))دەستی برد بۆ ترێیەکەو فەرمووی: ((بسم الله))، لە پاشاندا لێی خوارد.. بۆیە عەداس بیریکردەوە وتی ئەم وتنە زمانحاڵی خەڵکانی ئەم شارە نییە..

**پێغەمبەر((ﷺ)) فەرمووی: ئەی تۆ خەڵکی کوێیت؟ ئەی ئاینت چییە؟ وتی: من نە سرانیم .. کابرایەکی خەڵکی شاری نەینەوام.. پێغەمبەر((ﷺ)) فەرمووی:**

**(( لە گوندی برام یوونسی کوڕی مەتای؟..**

**عەداس وتی چۆن یونس دەناسی؟.. پێغەمبەر((ﷺ)) فەرمووی ئەو برامە پێغەمبەر ((ﷺ))بوو..**

**منیش پێغەمبەرم((ﷺ)).. بۆیە عەداس یەکسەر سەرو دەستەکان وپێیەکانی پێغەمبەری((ﷺ))**

**ماچ کرد.. هەردوو کوڕەی ڕەبیعە واسەیریان دەکەن.. برایەکیان بە براکەی تریانی وت: ئەوە خزمەتکارەکەی لەسەر خراپ کردی..**

کاتێک **عەداس هاتەوە بۆ لای گەورەکەی..کاریگەری وشوێنەواری بینینی پێغەمبەر ((ﷺ))گوێ بیستی وشە شیرینەکانی ئەوی پێوە دیار بوو..**

**گەورەکەی پێی وت: ئەوە چ بوو عەداس سەرو دەست وپێی ئەو کابرایەت ماچ کرد؟.. ئەویش وتی:(( ئەوە کەسێکە چاکترین مرۆڤە لەسەر ڕووی زەوی..)).**

**ئایا ئێمە ئەمڕۆ دەتوانین هەڵسوکەوتی جوان بکەین بە پێی پێویست بەرزو بڵندبێت ولە ئاست خۆیدا بێت لە گەڵ هەموو کەسێك .. یا هەرچی وچۆن بێت چینەکەیان؟**

## دیار خستن و ئاشکراکردنێك...

هەڵسوکەوتت لە گەڵ مرۆڤەکان بەو شێوە و شێوازە بێت کە مرۆڤن نەك لە سەر شێوە و روخساریان ..یان لەسەر ماڵیان.. بەپێی موچەکانیان و فەرمانبەرییەکانیان..

| Marcy full for anima | الرحمة بالحيوان |
| --- | --- |

## هەڵسوکەوت لەگەڵ بێ زمانەکان !! ئاژەڵان!!

هەر کەسێك لێهاتوویی بۆ چاکەوخێر بێت دەبێتە سروشت تێکەڵ بە گیان و بەخوێن وهۆشی دەبێت.. بەهیچ شێوەیەك لێی جیانابێتەوە.. هەردەم نەرم و لەسەر خۆ دەبێت ودان بەخۆدا گر و سۆزدار دەبێت..لەگەڵ هەموو کەسێك تەنانەت لەگەڵ بێ زمان ئاژەڵانیشدا وبەهەمان شێوە لەگەڵ رووەك ودارەکانیشدا.. پێغەمبەر ((ﷺ)) لەکاروانێکدا دەبێت لەگەڵ هاوەڵانی.. بۆ هەندێك ئیش وکاری خۆیان دەچن.. هەندێ لە بێچوە باڵندەیەکیان گرتبوو، لەلایەن منداڵانی هاوەڵانەوە یان هەر لەلایەن هاوەڵان خۆیانەوە ..

بۆیە پێغەمبەر ((ﷺ)) دایکە بێچووەکانی دەبینی دەهات ودەچوو بەسەریاندا..

رووی کردەوە هاوەڵانی فەرمووی: (( من فجع هذه بولدها؟ ردوا ولدها اليها))..

واتە ((کێ کۆسی ئەم دایکەی خستوە بە منداڵەکەی؟ بێچووەکەی بۆ بگێڕنەوە..

لەرۆژێکی تردا شارە مێروولەیەکی دی سووتا بوو. فەرمووی((ﷺ)) : ((کێ ئەم سووتانەی کردووە؟ )). هەندێك وتیان ئێمە...بۆیە پێغەمبەریش((ﷺ)) تووڕە بوو: فەرمووی((ﷺ)): (لا ينبغي ان يعذب بالنار الا رب النار)).واتە (نابێت هیچ کەسێك سزا بە ئاگر بدات بێجگە لە خودای گەورە خۆی نەبێت..

لە سۆزو میهرەبانی پێغەمبەر((ﷺ)) کاتێك دەست نوێژی دەگرت وپشیلە دەهاتە لایەوە پێغەمبەریش ((ﷺ))قاپە (کاسەکەی) بۆ خوارو نزیك دەکردەوە بۆ ئەوەی ئاوی لێ بخواتەوە لە ئاوەکەی دەخواردەوە.. لەپاشاندا پێغەمبەر((ﷺ)) لەو ئاوەکەی کە ماوەتەوە لە پشیلەکە دەست نوێژەکەی پێ تەواو دەکرد..

جارێك پێغەمبەر((ﷺ)) بەلای کابرایەکدا تێ پەڕەبێ کابراش پێی لەسەر ملی بەرخێك

داناوە چەقوەکەی بەدەستی خۆیەوەتیژ دەکاتەوە.. ئەو بەرخەش وا سەیری ئەو چەقۆ تیژکردنەوەیە دەکات ..بۆیە پێغەمبەر((ﷺ)) تووڕە دەبێت کاتێك ئەمەی لە کابرا بینی.. فەرمووی: (( ئەتەوێ دووجار بمرێنیت؟ ئایا نەدەکرا پێش تر چەقۆکە تیژ بکەیتەوە.. پێش ئەوەی ئەو بەرخە پاڵ بخەیت؟...))

رۆژێك پێغەمبەر((ﷺ)) تێپەڕ دەبێت بەلای دووکابرادا کە سوارییەکەی سەر پشتی حوشتریان وەك کورسی لێ کردبوو لەسەری پاڵ کەوتبوون.. کاتێك ئەمەی لێ دین.. بەزەیی وسۆزی بەدوو حوشترەکەدا هاتەوە. فەرمووی((ﷺ)): (( نابێت ئاژەڵەکان وەك کورسی تەماشا بکرێن..)).واتە : تەنها لەکاتی پێویست نەبێت نابێت سواری حوشتر وهەر سوارییەکی تر بین.. کاتێك پێویستییەکەت تەواو بوو ئەوا تۆش ئەبێت لەسەری دابەزیت و بۆ ئەوەی ئەویش ئیستراحەی پشووی خۆی بدات.. هەر بە هەمان شێوە قەدەغەی فەرمووە((ﷺ)) کە ناوچاوانی ئاژەڵان داخ بکرێت بە ئاسنی گەرم..

چیرۆکێکی سەیرو خۆش دەگێڕنەوە.. کۆمەڵە کەسێك لە کافرەکان هاتن لەدەرووبەری شاری مەدینەدا هەندێك حوشترو ئافرەتێکیان غارەکردو راپێچان کردن..

کاتێك کە زۆر دوور کەوتنەوە لە شاری مەدینە حوشترەکانیان بەرەڵا کرد بۆ ئەوەی خواردنی خۆیان بخۆن بۆ رێگەی دوورتر.. خۆیشیان لە مەترسی دوور کەوتوونەتەوە بۆیە پێویستە پشوویەك بدەن..

ئافرەتەکەش کاتێك ئەوان لە خەوی زۆر خۆشدا بوون هەوڵی دا سواری یەکێك لە حوشترەکان ببێت بۆ ئەوەی خۆی پێ رزگار بکات.. بەڵام هەرچ حوشترێکی دەگرت دەنگی لێوە دەهات خۆی نەدەدایە دەستی ئافرەتەکەوە کە سواری ببێت هەتا گەیشتە حوشترێك ئەو بێ دەنگ بوو.. بۆیە ئافرەتەکە سواری بوو.. زۆر بە خێرایی رووەو شاری مەدینە خۆی خستەوەڕێ..

لە رێگەدا لەسەر خۆی نەزرکرد کە ئەگەر خودا رزگاری بکات ئەوا ئەم حوشترە دەکاتە خێر!..

بەڵام کاتێك هاتەوە شاری مەدینە خەڵکەکە حوشترەکەیان ناسیەوە کە ئەوە حوشترەکەی پێغەمبەرە((ﷺ)) و ناوی (العضباء).. بۆیە حوشترەکەیان هێنایەوە خزمەت پێغەمبەر ((ﷺ)) لەبەیانیدا ئافرەتەکە داوای حوشترەکەی کرد بۆ ئەوەی نەزرەکەی بەجێ بهێنێ و حوشترەکەسەرببڕێت!! ..پێغەمبەریش فەرمووی((ﷺ)): بە خراپترین شێوە پاداشتی ئەو

حوشترە دەدەیتەوە کەرزگاری کردویت.. لە پاشاندا فەرمووی(( ﷺ )) (لاوفاء لنذرٍ في معصية الله ولا فيما لا يملك ابن آدم)).واتە (لەسەر مرۆڤ پێویست نییە وەفاداری کردن بۆ نەزرێك کە فەرمانی خودای گەورەی تیادا شکابێت یان مرۆڤ نەتوانێ بە جێی بهێنێ بەهۆی ئەوەی کە موڵکی ئەو نەبێت..

بۆچی توانایی ولێهاتوویی خۆت ناگۆڕیت بۆ هەڵسوکەوتت لەگەڵ خەڵکی وەك لەسەر خۆیی ومیهرەبان وسۆزداری و خەندەو سەخاوەت- هەردەم لەگەڵت بێت لێت جیا نەبێتەوە..

بە هیچ شێوەو شێوازێك .. لەگەڵ هەموو شتێکدا کە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکەیت.. هەتا ئاژەڵ و بێ گیانەکانیش داروبەردەکانی چوار دەورت..!!

پێغەمبەر(( ﷺ )) لە رۆژی وتار خوێندندا پاڵی دەدایەوە بە بنە دارخورمایەکەوە.. بۆیە ئافرەتێك وتی بە پێغەمبەر(( ﷺ )): ئایا شتێکت بۆ دروست نەکەین کە پشتی پێوەبدەیت.. چونکە خزمەت کارێکی دارتاشم هەیە.. پێغەمبەریش (( ﷺ )) فەرمووی ئەگەر حەزت لێیە..

بۆیە مینبەری بۆ درووست کرا.. کاتێك رۆژی هەینی هات.. پێغەمبەر(( ﷺ )) چووە سەر مینبەرەکەی کە بۆیان درووست کردبوو..

کاتێك دانیشت لەسەری.. بنەدارخورماکە دەنگێکی وەك دەنگی جوانەگایە دەینالأند.. دار خورماکە هاواری لێ بەرز بوویەوە.. هەتا خەریك بوو مزگەوت پارچە پارچە ببێت لەبەر ئەو دەنگە گەورەیە.. مزگەوت بەیەك جار هەژا.. بۆیە پێغەمبەر(( ﷺ )) دابەزی لەسەر مینبەرەکەی.. بنە دارخورماکەی بەخۆیەوە گوشی.. ئەو کات وەك گریانی منداڵ گریانەکەی وردە کەم بکاتەوە تەواو ببێت هەتا هێمن بووەوە.. لە پاشاندا پێغەمبەر(( ﷺ )) فەرمووی: (اما والذي نفس محمد بيده لولم التزمه لما زال هكذا الى يوم القيامة..) واتە(سوێند بەو خودایەی کە دەروونی منی بەدەستەوەیە ئەگەر لە ئامێزو باوەشی خۆمم نەگرتایە هەتا رۆژی قیامەت هەر نرکەو ناڵەی دەهات..

## ئاماژەیەك..

خودای گەورە ریزی تەواوی مرۆڤی بە سەر هەموو درووستکراوەکاندا داوە... بەلأم ئەمەش ئەو دەرگایە و دەرفەتە ناکاتەوە و فادات بۆی و پێی بۆ ئەوەی سەرجەم درووستکراوانیتر بچەوسێننەوە بە دەستی مرۆڤەکان..

| Way for get the hearts for you | ١٠٠ طريق لجلب القلوب اليك |
| --- | --- |

## ١٠٠ رێگە هەیە بۆ دڵگیری دڵەکانی خەڵکی بەلای خۆتدا..

هەر هەمووخاوەن پیشەیەك تەكنیكی خۆی بەكار دەهێنێ ودەخاتە گەڕ بۆ ئەوەی ئەو نێچیرەی كە خۆی دەیەوێ بە تۆڕەكەیەوە بێت.. عاشقی ماڵ وسامان تەكنیكی جۆراوجۆر دەكات بۆ كۆكردنەوەی ماڵ وسامان گەشە پێكردنی سوورە لەسەر فێربوونی توانایی و بەهرەكانی بازرگانی وسوود لێ وەرگرتن..

بڕوانە كەناڵە ئاسمانیەكان هەموو تەكنیكی شیاو و ناشیاو دەكەن بۆ ئەوەی بتوانن زۆرینەی رای خەڵكی بۆ خۆیان بكێشن بە جۆراوجۆر كردنی بەرنامە وپرۆگرامەكانیان وهەڵبژاردنی شێوەو شێوازی تازەو نوێ بە ئەو مەبەستە.. راهێنان وفێكردنی پێش كەش كارانی بەرنامە وپرۆگرامەكان بۆ شێوازی سەرنج راكێشانی خەڵكی بە خۆیدا..

بۆ ئەوەی بەردەوام بێت لەسەیر كردنی ئەم بەرنامەیە.. بەهەمان شێوە بڵێ بۆ هەموو هۆكارەكانی راگەیاندنی ..خوێندنەوەیی بێت .. یان بیستراوی..

بەهەمان شێوەنە ئەو كەسانەی كە دەیانەوێ پڕو پاگەندە بكەن بۆ كاڵاو بەرهەمەكانیان جا حەڵاڵ بێت یان حەرام بێت..

هەر هەموویان سوورن وهەوڵی ئەوە دەدەن بۆ ئەوەی لەو پەڕی شارەزایی و پسپۆڕیدا بن ولێهاتوویی خۆیان گەشە پێ بكەن بۆ ئەوەی سودیان پێ بگەیەنێ لەو بوارەی كە ئەوان حەزیان لێیە و خۆشییان پێیەتی.. راكێشانی دڵانیش تەكنیكێكە لە تەكنیكەكان رێگەو شێوازی تایبەتی خۆی هەیە.. وا دابنێ كە تۆ دەچیتە ناو كۆڕێكەوە نزیكەی چل كەسی لێیە.. تۆش یەكە بەیەكە بەلایاندا تێپەڕ دەبی و تەوقەیان لەگەڵ دەكەیت..

یەکەمیان.. کاتێك تۆ تەوقەی لەگەڵ دەکەیت تەنها بە سەرەپەنجەکانی تەوقەت لەگەڵ دەکاتەوە.. بە ساردییەکەوە: بەخێربێیت.

دووەمیان... لەبنەڕەتدا هەر خۆی سەرقاڵ بوو بەقسەی ئەم لاو ئەولای خۆی.. تۆش لەم کاتەدا سەلامت لێ کرد.. ئەویش بەساردی وەڵامی تۆی دایەوەو تەوقەی لەگەڵ کردی بەبێ ئەوەی هەر بۆت بڕوانێت..

سێیەمیان.. بە مۆبایل قسەی دەکرد.. تەنها دەستی درێژ کرد بەبێ ئەوەی هیچ بەزمانی بەخێر هاتنت بکات.. یان هیچ گرنگییەکت پێ بدات..

بەڵام چوارەمیان.. کاتێك تۆی بینی بەرەو ئەو دەچیت یەکسەر هەستاو خۆی ئامادەکرد بۆ وەڵام دانەوە سەلامەکەت .. کاتێك چاوی تۆ بەچاوی ئەو کەوت خەندەی بە رووەوە کردیت وخۆشحاڵیی خۆی بەگەیشتن بە تۆ دەربڕی.. تەوقەی لەگەڵ کردی زۆر بەگەرمییەوە.. گرنگیی زۆری بە هاتنت دا..

تۆش نایناسیت نە ئەویش تۆ دەناسێ!! لە پاشاندا سەلامەکەت بۆ هەموو خەڵکی تەواو بوو.. دانیشتیت.. سوێندت دەدەم بەخودای گەورە!

ئایا دڵت بەلای ئەو کابرادا ناڕوات؟بەڵێ.. دڵت بە لایدا دەچێت با تۆ نەیشی ناسی.. ناوی نەزانی .. پلەو پایەی فەرمان بەرییەکەی نەزانی.. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو توانی دڵی تۆ بە لای خۆیدا رابکێشێت.. نەك سەروەت و سامان..نە بە پلەوپایەی.. نە بە رەگەزو تیرەی ..

بەڵکو بەلێهاتوویی لە هەڵسوکەوتییدا لەگەڵت.. کەواتە دڵەکان بەهێزو بازوو وماڵ وسامان و جوانی و فەرمانبەری راناکێشرێن بەلای خۆیدا.. بەڵکو لە ئەمانە سووك و ئاسانترە.. لەگەڵ ئەوەشدا کەسێك دەتوانێ دڵەکان بەلای خۆیدا بکێشێت.. نەماڵ وسامانی نە بە پلە وپایەی نەبە رەگەزی.. بەڵکو بە لێهاتوویی لە هەڵسوکەوت کردنی لەگەڵ تۆدا..کەواتە من و تۆش دەتوانین دڵانی خەڵکی بەلای خۆماندا رابکێشن.. قوتابییەکم لە کۆلێژ تووشی نەخۆشیی دەروونی بوو.. نەخۆشیەکەی زۆر زەحمەت بوو.. باوکی زۆر جار دەهات بۆ لام بۆ کۆلێژ لەوێ رێك کەوتین لەسەر ئەوەی کۆمەکی یەکتر بکەین بۆ چارەسەری نەخۆشیی کوڕەکەی.. زۆر جار کە دەچوومە ماڵیانەوە.. وا سەیرم دەکرد ماڵیان زۆر قەرەباڵغ بوو.. چونکە ئەو کابرایە پلەو پایەیەکی سەربازیی گەورەی هەبوو.. خەڵکیش لە دەوری کۆدەبوونەوە بۆ ئیش وکارێك.. بەڵام پاش چەند ساڵێك چوومە سەردانیان.. واسەیر دەکەم پەنجا کورسی ڕێز کراوە..

تەنها یەك پیاوی لێیەو خۆی سەرقاڵی تەماشاکردنی تەلەفزیۆن دەکات.. کابرایەکی تری خزمەتکار چایی وقاوەی بۆ تێ دەکات.. چونکە تەقاعود بوو بوو..

بۆیە زانیم سەردانی ئەو خەڵکە بۆ ئەم کابرایە تەنها لەبەر پلەو پایە بوو نەك لەبەر جوانیی رەوشتی کە خەڵکی بەلای خۆیدا راکێشا بێ..

بۆیە داوا ئەکەم کە تۆش لەم برادەرەمان پەندو ئامۆژگاری وەرگریت.. هەڵسوکەوتت لەگەڵ خەڵکی بە لێهاتوویی چوونە ناو دڵیانەوە بێت بۆ ئەوەی تۆیان خۆش بوێت لەبەر کەسایەتییەکەت .. قسە و وتەکانی تۆیان خۆش بوێ.. خەندو پێکەنین وزمان شیرینیی تۆیان خۆش بوێ. جوانی هەڵسوکەوت و رەوشتی تۆیان خۆش بوێ..

ئەوەیان لە تۆدا خۆش بوێ کە تۆ چاوپۆشی لە هەڵەو نەنگییەکانیان دەکەیت.. و هەڵوێستت لەگەڵیان هەبێ لەکاتی ناخۆشیەکاندا ...

دڵەکانیان وا لێ مەکە گرێ بەستی کورسی و پلەو پایە گیرفانت بن!!.ئەو کەسەی کە بەتەنها خواردن و خواردنەوە بۆ خێزان و منداڵەکانی پەیدا دەکات.. ئەوە دڵی ئەوانی بەلای خۆیدا رانەکێشاوە بەڵکو سکی ئەوانی بەلای خۆیدا راکێشاوە..

ئەوەی بە ماڵ و سامان منداڵەکانی خۆی داپۆشیوە.. هەڵسوکەوتی لەگەڵیان ناشیرینە.. ئەوە دڵیانی بەلای خۆیدا نەکێشاوە..

بەڵکو تەنها گیرفانی ئەوانی بەلای خۆیدا کێشاوە..

بۆیە هیچ بەلاتەوە جێی سەرسوڕمان نەبێت کاتێك گەنجێك دەبینی دەکەوێتە کێشەیەکەوە سکاڵای خۆی دەبات بۆ لای برادەرێکی یان پێشنوێژ خوێنی گەڕەك، یان مامۆستای قوتابخانە.. هەر باوکی لێ تێ ناگەیەنێ .. چونکە ئەو باوکە دڵی منداڵەکەی بەلای خۆیدا نەکێشاوە..

نێوانە پۆ لایینەکانی نێوان خۆی و منداڵەکانی نەشکاندووە.. بەلاّم ئەم دڵەی بۆ خۆی راکێشاوە پێش نوێژخوێنەکە یان مامۆستای قوتابخانەکە .. لەوانەشە دوژمنێکی ناحەز بۆ خۆی راکێشابێ!!

## شتێکی تری گرنگ...

ئەی تۆ تێبینی ناکەیت کاتێك هەندێکەس دێنە کۆڕو کۆمەڵێکەوە کە قەرەباڵغ بێت ئەملاولا دەکات و دەگەڕێت بەدوای جێگەیەکدا بۆ ئەوەی تیایدا دابنیشێ! .. بۆچی؟ ئایا جارێك بانگ

کراویت بۆ دەعوەتێك هەرکەسەو خواردنی خۆی بە دەستەوە.. کەسانێك هێشتا راوەستاون بەڵام زۆربەی دانیشتتوانی بانگی لێوە دەکەن بۆ ئەوەی لە پاڵی خۆیاندا جێگەی بۆ بکەنەوە..

بەڵام کەسێکی تر خواردنەکەی بەدەستەوەیە هەر دەگەڕێ بەم لاولادا چاوەڕوانە کەسێك بانگی بکات..

بەڵام کەسێ هەر خۆی لێ ناکات بە خاوەن.. هەتا خۆی جێگەیەکی خاڵی دەدۆزێتەوەو لەسەری دادەنیشێ..

بۆچی خەڵکی هەوڵی ئەوەیان دەدا کە کابرای یەکەم بێت لە گەڵیان دابنیشێ بەڵام بۆ دووەم بە پێچەوانەوە..

ئایا هەست ناکەیت هەندێك کەس دڵان روویان تێ دەکەن بۆ هەر کوێ بڕۆن و لەکوێ بن، وەك ئەوەی لە دەستییدا موغناتیس هەبێت و خەڵکی بۆ رابکێشێ!!

جێی پرسیار و سەرسوڕمانە!!

چۆن توانیویانە و دەتوانن دڵی ئەم هەموو خەڵکە بە لای خۆیاندا رابکێشن؟!..

بەراستی رێگە گرتنە بەری بەزیرەکانەیە کە مرۆڤ پێی دەتوانێ دڵی خەڵکی پێ راوبکات بۆ خۆی ..

## بڕیارێك..

لێهاتوویی و توانایی‌مانی بۆ بەندکردنی دڵانی خەڵکی.. بەدەست هێنانی خۆشەویستیی راستەقینەی خەڵکی زۆر لایەن و رووی گەوردمان پێ دەبەخشن کە بتوانین چێژ و تام لە ژیاندا بکەین..

| Be good entention and sincer et to allah | احسن نيتك و أخلصه لله |
| --- | --- |

## نیازت ریك بخە.. با تەنها بۆ خودای گەورە بێت..

وامن خۆم سەرقالْ کردووە بەوەی بیردەکەمەوە.. شێوازەکانی هەڵسوکەوتی هەندێك لە مرۆڤەکان.. دەیەها سالْ لەگەڵیان ژیاوم.. نایەتە یادم کە بۆ تەنها جارێك خەندەیەکم لە روویان دی بێ.. بەڵکو تەنانەت ئەگەر بۆ موجامەلەش بێت کە خەندەیان بەقسەیەکی خۆش کردبێ.. یان لەگەڵ وتەبێژ تێکەڵ یەکیان نیشان دابێ.. منیش وام گومان دەبرد ئەوانە بەوشێوەیە گەورە بوون وپەروەردەکراون و وەبەهیچ شێوەیەك ناتوانن گۆڕانکاریی تیادا بکەن..لەپاشاندا بەلامەوە سەیر بوو لەهەندێ جێگەی تایبەت دەم دین..
لە گەڵ هەندێك خەڵکی تایبەت لەدەوڵەمەندەکان و کەسانی دەست رۆیشتوو زۆر بەجوانی وتەواوی دەزانن پێ بکەنن ونەرمونیان بن.. بۆیە بۆم دەرکەوت ئەم کارەیان تەنها بۆ بەرژەوەندیە.. هەر بۆیە پاداشتێکی زۆر گەورەیان لەدەست خۆداوە.
چونکە باوەڕدار تەنانەت بەرەوشت وهەڵسوکەوتی لەگەڵ خەڵکی چاوەڕوان پاداشتە لەلایەن خودای گەورەوە.. لەگەڵ هەموو خەڵکیدا.. نە بۆ سەروەت وسامان.. نە بۆ پلەوپایەی دونیایی.. نەبۆ ئەوەی خەڵك باسی خەندەدایی ئەو بکەن.. نە بۆ ئەوەی ژنێکی بدەنێ.. نە بۆ ئەوەی سوولفەیەك وەرگرێت.. تەنها و تەنها بۆ ئەوەیە خودای گەورە خۆشی بوێ لە پاشاندا لە لای خەڵکیش خۆشەویستی بکات..
بەڵێ.. هەر کەس رەوشتی جوان وبەرز بەپەرستن بژمێرێ و لە پێنووس بدات..
دەبێتە لێهاتووترین مرۆڤ و بە جوانترین شێوە لە هەڵسوکەوتی بەرامبەر خەڵکی لەگەڵ دەوڵەمەندو لەگەڵ هەژاردا.. لەگەڵ بەڕێوەبەرو خزمەتکاردا..

ئەگەر رۆژێك تێپەڕبووی بەلای كرێكارێكدا خزمەتی جادەكانی دەكرد بە پاككردنەوەیان دەستی خۆی بۆ درێژكردی بۆ ئەوەی تەوقەت لەگەڵ بكات؟

رۆژێكی تر چوویتە لای بەرپرسێكی گەورە دەستی درێژ كرد بۆ ئەوەی تەوقەت لەگەڵ بكات.

ئایا ئەم دووتەوقەكردنە یەكسانن بەلای تۆوە؟ لەوەی چۆن گرنگی و بایەخیان پێ دەدەیت لەوەی چۆن خەندەو ڕووخۆشییان لەگەڵ دەكەیت؟ نازانم!!

بەلای پێغەمبەری خوداوە ((ﷺ)) هەردوو دەستەكە بەلایەوە یەكسان بوون لە گرنگی وبایەخ پێدانیان . لە خەندەو ڕووخۆشی لە گەڵیان . بە ئامۆژگاری و دڵسۆزی بۆیان.

تۆ نازانیت لەوانەیە ئەوەی تۆ بە كەمی دەزانیت خۆت لە ئەو بە گەورەتر دەژمێریت لەلای خودای گەورە چاكتربێ بە پڕاو پڕی زەوی لەو كەسەی لەتۆ ڕێزی زیاتری لێ دەنێی و گرنگی و ڕۆڵ و بایەخی پێ دەدەیت.

پێغەمبەر((ﷺ)) دەفەرموێت: (ان من احبكم ان من احبك الی واقربكم مني مجلسا يوم القيامة احاسنكم اخلاقا)([1]). واتە لەهەموو كەس خۆشەویستو نزیكتر لەمنێوە بۆلای من لەرۆژی دواییدا ڕەوشت بەرزترینتانە...... )

بۆ ئەشەجی كوڕی قەیس ((ﷺ))فەرمووی: ان فيك خصلتين يحبهما الله الحلم والاناة.. دوو ڕەوشتی جوانت تیادایە خودای گەورە خۆشی دەوێن هێمنی و لەسە رخۆیی..

پرسیاری لێ كرا باشترین كارە مرۆڤ پێی لێ رازی بێت (خلق حسن)([2])

لە كاتێكا لە پێغەمبەر ((ﷺ))پرسیار كرا چی باشترین چاكەیە فەرمووی (ڕەوشتبەرزی وجوانییە)؟....

وسئل عن اكثر ما يدخل الناس؟سوء الخلق).

واتە:پرسیاركرا لەزۆرینەی دۆزەخییەكان فەرمووی: بەدڕەوشتییە......

وقال (اكمل المؤمنين ايمانا احسنهم خلقا)([3])

واتە : (( تەواوترین باوەڕدار لە باوەڕەكەیدا ئەوەیانە كە ڕەوشتی بەرز و جوان بێت)).

---

[1] صحيح ابن ماجة (٣٤٣٦) كتاب الطب من حديث اسامة بن شريك ، صححه العلامة الالباني في صحيح الجامع (٢٣٢١).

[2] - صحيح رواه الترمذي (١٩٧٥) كتاب البر والصلة من حديث عبدالله بن عمرو وصححه الالباني رحمه الله تعالى في السلسلة الصحيحة (٢٨٦).

[3] -صحيح ابو داود (٤٦٨٢) كتاب السنة والترمذي (١١٦٢) كتاب الرضاع وصححه الالباني في صحيح الجامع (١١٢٨).

زانا ئیبن ئەلقەیم دەڵێت. رەحمەتی خودای لێ بێ : (ئایین هەر هەمووی رەوشتە، هەر کەسێك رەوشتی زیادبێ لە تۆ ئەوا لە ئاییندا لە تۆ زیادی هەیە ..)).

وقال: ما من شيء ثقل في ميزان العبد المؤمن يوم القيامة من حسن الخلق)([1])

واتە (هیچ شتێك گرانتر نییە بۆ كێشانی كردەوەكانی بەندەی باوەڕدار لە رۆژی قیامە (زیندووبوونەوە) وەك رەوشتی جوان و بەرز.)..

پێغەمبەر((ﷺ)) دەفەرموێ : (ان العبد ليبلغ بحسن خلقه درجة الصائم القائم)([2])

واتە: (مرۆڤی باوەڕدار بە رەوشت بەرزی دەگاتە پلەی رۆژووەوان و شەونوێژكاران..

ئەگەر حەز دەكەیت بڕوانە دایكی سەلەمە رەزای خودای لێ بێ.. لەگەڵ پێغەمبەردا دانیشتووە. دوا رۆژی بەبیرهاتەوەو خودای گەورە چ خۆشییەكی ئامادە كردووە بۆ بەهەشتییەكان. .

وتی ئەی پێغەمبەری خودا((ﷺ)).. ئافرەتێك لەدونیادا دوو مێردی كردووە بۆ كامیان دەبێت لە دوا رۆژدا.. كاتێك هەردوو مێردەكەی وخۆشی بەهەشتی بێت..

ئافرەتەكە بۆ كامیان دەبێت؟ پێغەمبەر چی فەرموو؟ دەفەرمووێت ئەوەیان زیاتر شەونوێژی كردووە؟

یان بۆ ئەو كەسەیان كە زۆر بەرۆژوو بووە؟ یان بۆ ئەو كەسەیان كە زانا بووە؟ نەخێر، بەڵكو فەرمووی: تكون لا حسنهما خلقا.. بۆ ئەو كەسەیان دەبێت رەوشتەكەی جوانتر بێت بۆیە دایكی سەلەمە سەری سوڕ دەمێنێ.. كاتێك پێغەمبەر ((ﷺ)) دەبینێ واقی وڕماوە فەرمووی: (( يا ام سلمة.. ذهب حسن الخلق خيري الدنيا والآخرة..واتە ئەی دایكی سەلمە. كەسی رەوشت بەرز و جوان خێری هەردوو دونیا بۆ خۆی دەبات..بەڵێ خێری هەردوو دونیا دەبات .. خێری دونیا ئەوەیە خەڵك خۆشیان دەوێ.. خێری دوارۆژیش ئەو پاداشتە گەورەیە كە خودای گەورە بەبەشی دەكات ..

مرۆڤ هەرچەندە كاری چاك وباشی هەبێت.. ئەگەر رەوشتی بەد بێت كارە چاكەكانی پووچەڵ دەبنەوە..كاتێ رەوشتی ناشیرین بێت.

---

[1] صحيح: رواه ابو داود (٤٧٩٩) كتاب الاداب والترمذي (٢٠٠٢) كتاب البر الصلة من حديث ابي الدراء رضي الله عنه وصححه الالباني رحمه الله في صحيح الجامع (٥٧٢١).

[2] صحيح: رواه ابو داود (٤٧٩٨) كتاب الادب واحمد (٢٣٨٣٤) من حديث عائشة رض الله عنها وصححه الالباني

ئافرەتێـک باسـکرا نوێـژو رۆژی زۆری هبـوو بـەلآم ئـازاری خـەڵکی دەدا پێغەمبـەر ((ﷺ))فەرمووی ئەو دۆزەخییە )).

چونکە نوێژو رۆژووەکەی بۆ مافی خودایە بەلآم ئازار دانی خەڵکی سنووری خەڵك بەزاندن و مافخواردنی خەڵکییە!؟...پێغەمبەر((ﷺ)) خۆی سەر مەشق وماموٚستا کاروانی رەوشت بەرزانـە.. لەهـەموو رەوشـتێکی بـەرزدا.. سـەخی تـرین مـرۆڤ بـوو.. ئـازاترین مـرۆڤ بـوو.. لێبوردەترین مرۆڤ بوو.. زۆر بەشەرم بوو لە کچێك لە چوار چێوەی ماڵەکەی خۆیدا..

دەست پاکترین کەس بووە... تەنانەت کافرەکان شایەدی و گەواهی دەستپاکی و راستگۆیی پێغەمبەریان((ﷺ)) دەدا... هەتا خەدیجە فەرمووی: (( والله لا یحزیك الله والله انك لتصل الرحم وتصدق الحدیث وتحمل الکل وتکسب المعدوم، وتقری الضیف، وتعین علی نوائب الحق)([1])

واتە : (( سوێند بە خودای گەورە خودای گەورە تۆ سەر شۆڕ ناکات چونکە تـۆ خزمایـەتی بـەجێ دەهێنی و راست گۆیت، فریای خەڵك دەکەویت و ئیش و کاری پێویست بوان دەکەیت و ریزی میوان دەگریت، هاریکارو پشتیوانی هەر لیقەوماوێك دەکەیت)).

( انك لعلی خلق عظیم )..واتە (بە راستی تۆ لە سەررەوشتی بەرزی).

بەڵکو خودای گەورە باسی رەوشی کردووە... عائیشە دەفەرموێت: (( کان خلقە القرآن..

واتـە: ((رەوشتی پێغەمبـەرقورئان بوو.. کاتێك خودای گـەورە دەفـەرموێت: (واحسنوا ان الله یحب المحسنین). واتە چاکە بکەن چونکە خودای گـەورە چاکەکارانی خۆش دەویٚ.. چاکەی کرد.. بەڵێ چاکەی کرد لەگەڵ گەورە وبچووك.. دەوڵەمەندو هەژار.. گەورە بێت لەناو خەڵکدا یـان دیـار نـەبێت..کاتێـك گـوێی لـێ بـوو خـودا فـەرمووی:((فـاعفوا واصـفحوا) لێخۆشـبوون ولێبـوردنی کـرد. کاتێـك خـودای گـەورە فـەرمووی: ((وقولـوا للنـاس حسـنا) .. بـە جـوانترین شێوەو شێواز

دەهاتـە گفـت وقسـەکردن..مـادەم ئـەو پێغەمبـەرە((ﷺ)) پێـشەواو رابـەرو مامۆسـتاو پـەیام هێنەری خودا بێت بۆ ئێمەیە.. پەیرەوو پرۆگرامەکەی بۆ ئێمە.. جوان بیرو هزرو تێرامان بکە لـە ژیـانی پێغەمبـەر ((ﷺ)) .. چـۆن هەڵـسوکەوتی لەگـەڵ خـەڵکی دەکـرد؟.. چـۆن هەڵـە ولادانەکانی بۆ چارەسەر دەکردن.. چۆن ئارام و خۆراگر و دان بە خۆدا گربوو لەسەر ناخۆشی

---

[1]-متفق علیە رواە البخاري (٤)بدء الوحي، ومسلم (١٦٠) الایمان من حدیث عائشة رض الله عنها.

و ئازار و ئەشکەنجە یان بۆی..چۆن هەموو هەوڵێکی بۆ ئەوە بوو ئەوان بحەوێنێتەوە؟.. خۆی ماندوو و هیلاك دەکرد بۆ بانگەوازیکردنیان..

رۆژێك دەتبینی بەدوای بەجێهێنانی ئیش وکاری هەژارێك دەکەوت.. رۆژێکی تر کێشە وگرفتی نێوانیانی چارەسەر دەکرد.. رۆژێکی تر بانگەوازی کافرەکانی دەکرد..

هەتا پیری زۆری بۆ هێنا.. ئێسکەکانی نەرم بوون..

بۆیە دایکمان عائیشە دەفەرموێت:(( کان اکثر صلاته بعدما کبر جالسا..)؟ لماذا؟؟.. واتە زۆربەی نوێژەکانی پێغەمبەر((ﷺ)) لەدوای پیربوونی بەدانیشتنەوە دەیکرد.. بۆچی؟؟..چونکە خەڵکی شکستەیان و پۆرتکاندیان .. بەڵێ تێیان شکاندو پۆرتکاندیان.. چونکە لە خەم وپەژارەی ئەواندا ئیسراحەتی لە خۆی هەڵگرتبوو..

واذا کانت النفوس کباراً..          تعبت في مرادها الاجسام

ئەگەر دەروونەکان گەورەبن .....          بۆ مەبەستی لاشەکان ماندوو دەبن.

بەڵێ .. ئەوەندە سوور بووە لەسەر رەوشتی جوان و بەرز.. تەنانەت لە پاڕانەوەکانیشدا هەر نزاو پاڕانەوەی بۆ رەوشت جوانی وبەرزی بووە.: ((اللهم کما حسنت فحسن خلقي)).

واتە :ئەی خودا تۆچۆن روخسارت جوا.ن کردووم بەهەمان شێوە رەوشتم جوان بکە..

دەفەرموێت((ﷺ)): (اللهم اهدني لاحسن الاخلاق) .

واتە: تۆ ئەی خودایە من رێنموویی بکە بۆ جوانترین رەوشت....

کەواتە ئێمە پێویستمان بەوە هەیە کە شوێنپێی هەڵگرینەوە لەرەوشتە بەرزەکانی لەگەڵ موسوڵمانان بۆ ئەوەی دڵیان بۆ خۆمان رابکێشین وبانگەوازیان بکەین بۆ ئایینی خودا.. تەنانەت لەگەڵ کافرو بێ بڕواش بۆ ئەوەی دەرفەتی پێناساندنی راستێتی ئیسلامیان پێ بگەیەنین..

## ئامۆژگاریەك...

نیازی خۆت رێك و خاوێن بێت بۆ خودا. بۆ ئەوەی پاڕانەوەیەکانت لەگەڵ خەڵکانی رەدا پەرستن بێت.. خودای گەورە پێ رازی بکەیت و نزیك ببیتەوە لە پەروەردگارت.

| With a first look | مع أول نظرة |
|---|---|

## لە یەکەم بینین و بەیەک گەیشتندا نەرم بە:

هەواڵێك لە هەندێ گوندەکانی میسر بڵاوبووەوە کە کابرایەکی زاوا پێش بە زاوا بوونی لە هۆدەی بەزاوابوونی پشیلەیەك دەشارێتەوە.. کاتێك بووکەکەی هێنا..
کورسییەکی جووڵاند بۆ ئەوەی ئەو پشیلەیەدەربچێت.. لەپاشاندا زاواش گرتی و خنکاندی چونکە هێزو توانای خۆی بۆ دەربڕی لەپێش چاوی بوکەکەی..
بۆ ئەوەی لە مێشکی ئافرەتە داماوەکە ترس وزاڵبوون دەربڕێت لەیەکەم پێ گەیشتنی...
منیش ئەوەم دێتەوە یاد کاتێك دەرچووم لە زانکۆ.. دامەزرام بە (موعید) لەیەکێك لە کۆلیژەکان.. یەکێك لە مامۆستا کانم وەسێت و ئامۆژگاری کردم:
لەیەکەم وانەتدا بە قووتابیان زۆریان لەسەر توووند بکە.. چاویان لێ سوور بکەوە!! هەتا لێت بترسن وکەسایەتی خۆت هەر لە سەرەتاوە بسەلمێنی ئەمەم بەبیر هاتەوە..
کاتێك ئەم باسە دەنووسم.. بۆیە دڵنیام لەوەی کە هەموو شتەکان لەلای هەموو خەڵکی بۆ یەکەم بەیەکگەیشتن لە ٧٠٪ی لە مێشکدا دەمێنێتەوە روخسارو وێنەی تۆ.. ئەوەش ئەوەیە کەناو دەنرێت بە وێنەی هزرو مێشکە دەمێنێتەوە.. ئەوەشم دێتەوە یادکە کۆمەڵێك لە ئەفسەرەکان کاروانی دەکەن بۆ ئەمریکا لە راهێنانێکدا بۆ ماوەیەکی تایبەت..
ئەم راهێنانەش بۆ فێرکردنی هەڵسوکەوتە لە فەرمانبەری.. لەیەکەم رۆژدا.. ئامادەی هۆڵی راهێنان بوون.. بۆیە دەستیان بە قسەو لێ پرسینەوە لەیەکتر.. خۆناساندن کرد.. و مامۆستا یەك لەناکاو خۆی کرد بە ژووری هۆڵەکەدا ئەوانیش یەکسەر بێ دەنگ بوون..

مۆستاکە چاوی بە قووتابییەك کەوت هێشتا هەر خەندەی لەسەر لێوان بوو.. مامۆستاکە هاواری بەسەرداکرد: ئەوە بۆ چی پێ دەکەنی؟ قوتابییەکە داوای لێبوردن دەکەم پێ ناکەنم..

مامۆستاکە: بەڵێ پێ کەنیت.. لەپاشاندا بەردەوام بوو لە لۆمەو سەر زەنشتکردنی:

تۆ هەر لە بنەڕەتدا مرۆڤێکی کار بەکاڵ وکرچی دەگریت..

پێویستە تۆ لەگەڵ یەکەم فڕۆکە دەفڕێ دەچێتە وڵاتی تۆ، تۆی پێ بگەڕێنرێتەوە بۆ ماڵەوەتان.. هیچ خۆشحاڵ نیم بە وانەوتنەوەلەگەڵ کەسێك تۆ بیت..

قوتابییە هەژارو داماوەکەش ڕەنگی تێکچوو.. هەر سەیری مامۆستاکەی دەکرد.. ئاوڕیشی دەدایەوە بەلای هاوەڵەکانیدا .. هەوڵی ئەوەی دەدا چۆن هەندێك لە ئارەقی ناوچاوانی بۆ بگێڕێتەوە..

لە پاشاندا هێشتا مامۆستاکە لەقسەنەبوو بوە وە ئەو واسەیری قوتابییەکە دەکات بەدەم وچاوگرژیەکەوە ئامارەی بۆ دەرگاکە کرد کە لێی بچێتە دەرەوەو بە قوتتابییەکەی وت: بڕۆ دەرێ.. قوتابییەکەش بەلەرزو تێکچووییەوە.. بەپەلە چووە دەرەوە..

ئەوجا مامۆستا دەستی بە روانین کرد بۆ یەکەی یەکەی قوتابییان وتی: من دکتۆر فلأنم.. فلأن وانەتان پێ دەڵێمەوە.. بەلأم پێش ئەوەی دەست بە وانەکە بکەین ..ئەمەوێت ئێوە ئەم ئیستمارەیە پڕ بکەنەوە.. بەبێ ئەوەی ناوی خۆتان بنووسن.. لە پاشاندا ئیستمارەیەکی بەسەردا دابەش کردن کە بۆ هەڵسەنگاندنی مامۆستاکە ..

پێنج پریساری تیادایە:-

١- بۆچوونت بەرامبەر رەوشتی مامۆستاکەت؟

٢- بۆ چوونت چۆنە بۆ رێگەی لێکدانەوەی وانەکەی؟

٣- ئایا بۆچوونی بەرامبەر وەردەگیرێت؟

٤-تا چەند تۆ حەز دەکەیت وئامادەیت تیادایە بۆ ئەوەی جارێکی تر دەرسی لەلا بخوێنی؟

٥-ئایا خۆشحاڵی بەوەی بەرامبەر وپێی بگەیت لەدەرەوەی پەیمانگە؟

بۆ هەر یەك لەم پرسیارانە هەڵبژاردن هەیە:-

نایاب.. باشە..پەسەندە.. لاوازە... قوتابییەکانیش ئیستمارەکانیان پرکردەوە دایانەوە دەستی.. ئەویش لەلایەکییەوە داینا..

دەستی کرد بە لێکدانەوەو وتنەوەی وانەکەی دەربارەی کاریگەریی تەکنیکی هەڵسوکەوت لە کاتی فەرمانبەریدا.. لە پاشاندا وتی: ئێوە! بۆچی برادەرەکەی ئێوەش بێ بەش بێت لە سوود وەرگرتن.. چووە دەرێ بۆ لای قوتابییەکە .. تەوقەی لەگەڵ کردو بەروویەوە پێ کەنی..

هێنایەوە هۆڵی وانە وتنەوە..

لە پاشاندا داوای لێ بوردنی بۆ قوتابییەکە هێناویەوە.. وتی لەوانەیە من هەڵسوکەوتم لەگەڵ تۆ ناشیرین بوو بەبێ هیچ هۆکارێکی رەواو گونجاو.. بەڵام من داوای لێبوردنت لێ دەکەم.. من خۆم هەندێك کێشەی تایبەتیم هەبوو..

ئەمەش وای لێ کردم جامی تووڕەیی خۆم بەسەر تۆدا خاڵی بکەمەوە.. دووبارە داوای لێ بوردنت لێ دەکەم.. تۆ قوتابییەکی سوور بووی بۆ فێربوونی زانست.. بەڵگەشم ئەوەیە کە تۆ ماڵ و کەس ونیشتمانی خۆت بەجێ هێشتووە بۆ فێربوونی زانست ئەمەش خۆی گەورەترین بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە تۆ قوتابییەکی لێهاتوویی.. سوپاست دەکەم..

بەڵکو سوپاسی هەمووتان دەکەم بۆ هاتنتان بۆ ئێرە .. زۆر شەرفمەندییە کە من وانە بەئێوە بڵێمەوە.. لە پاشاندا نەرمی وپێکەنینی لەگەڵ دەربڕین بۆ ئەندازەیەك..

لەپاشاندا چەند ئیستماریەکی تری بەسەر ئەواندا دابەش کرد وتی: لەبەر ئەوەی برادەرەکەتان ئەوەی لە کیس چوو ئیستمارەکە لەگەڵ ئێوە پڕ بکاتەوە پێتان چۆنە ئەگەر ئێوەش لەگەڵی دووبارە ئیستمارەکە پڕ بکەنەوە ئەوانیش دووبارە پڕیان کردەوەو پێیاندایەوە..

مامۆستاکەش ئیستمارەی جاری یەکەم و دووەمی دەرهێنا بەراوردکارییەکی لە نێوانیاندا کرد.. وا سەیر دەکات ئەو خانەیەی کە (لاوازە) لە ئیستمارەکانی جاری یەکەمدا پڕبووەتەوە.. بەڵام بۆ جاری دووەم زیاتر (لاوازە) بوو بەڵام جاروبار پەسەندیشی تیابوو.. بۆیە دەستی کرد بە پێکەنین وتی: ئەوەی کە ئێوە دیتان بەڵگەیەکی کاری بوو بۆ کاریگەریی شوێنەواری هەڵسوکەوتی خراپ لەکەش وهەوایەك کە خراپ بێت لە نێوان بەڕێوەبەرو فەرمانبەرەکانیدا.. ئەوەی من بە سەری برادەرەکەی ئێوەمداهێنا تەنها نواندن بوو ویستم لە پێش چاوی ئێوەدا بەجێی بهێنم.. بەڵام ئەو قووتابیە هەژارە بوو بە قووربانی..

بۆیە بڕوانن چۆن بۆچوونیان گۆڕا بە تەنها بەوەی کە من هەڵسوکەوتم لەگەڵ گۆڕین.. ئەمەیە سروشتی مرۆڤ.. بۆیە پێویستە چاودێری ئەم سروشتەی مرۆڤ بکرێت.. بە تایبەت لەگەڵ ئەو

کەسەی کە یەکەم جار پێی دەگەیت بۆ تەنها یەك جار..مامۆستاو پێشەوای یەکەم محمد((ﷺ))دڵەکانی بەند دەکرد بە یەکەم بینین ویەکەم پیْ گەیشتن پێی..
لەدوای رزگارکردنی شاری مەککە.. ئیسلام جێی خۆی گرت.. نوێنەرانی گەلان و

هۆزان پێش بڕکێی یەکتریان دەکرد بۆ هاتن بۆ لای پێغەمبەر((ﷺ)) پابەند بوونی خۆیان بە ئیسلامەوە راگەیاند.. بۆیە نوێنەری عبدالقیس- هاتنە لای پێغەمبەر((ﷺ)) ..
کاتێك بینی ئەوان هێشتا هەر لە سواری حوشترەکان نەهاتبوونە خوارێ پێغەمبەریش چاوی بە ئەوان کەوت بۆ سەلام کردنیان بەخێرهاتنیان فەرمووی((ﷺ)):
(( مرحبا بالقوم..غير غزايا..ولاندامى.. ))
واتە:(( زۆر بەخێرهاتنی ئەم کەسانە دەکەین سەربەرزتان دەکەین وکارێك دەکەین کە ئێوە پەشیمان نەبن لە هاتنتان بۆ ئێرە..)).
ئەوانیش دڵیان خۆشبوو.. هەر بەپەلە خۆیان لە سواریەکانی ولأخەکانیان دابەزین.. بەپەلەبوون بۆ ئەوەی لە پێش یەکتر بکەون بۆ تەوقە کردن لەگەڵ پێغەمبەر ((ﷺ))..
لە پاشاندا وتیان ئەی پێغەمبەری خودا .. لە نێوان ئێمە وتۆدا فلأن هۆزی ( کافر) هەن.. ئێمە ناتوانین سەردانت بکەین ئەگەر لە مانگە قەدەغەو حەرام کراوەکاندا نەبێت.. کاتێك کە شەڕکردن رادەوەستێ.. دەی بۆیە داوا دەکەین کورت ترین شتمان فێر بکە.. ئەگەر کارمان پیْ کرد پێی بچینە بەهەشتەوە.. بانگەوازو بانگێشەی ئەوکەسانەشی بۆ بکەین کە لەپاش ئێمە جێماون..پێغەمبەر فەرمووی((ﷺ)) :

(آمركم باربع.. وانهاكم من اربع...امركم بالايمان بالله ،اتدرون ما الايمان بالله؟قالوا :الله ورسوله اعلم..قال :شهادة ان لا اله الا الله ..واقام الصلاة وايتاء الزكاة .وان تعطواالخمس من الغنائم وانهاكم عن اربع ..عن نبيذ في الدباء والنقير والحنتم .والمزفت.زرواة البخاري .
واتە: (( من فەرمانتان پێدەکەم بەوەی باوەڕبەخودا بهێنن ئایا دەزانن باوەڕ بەخودا چۆنە ؟وتیان خوداو پێغەمبەری ((ﷺ))خودا دەزانیْ: فەرمووی وتنی هیچ خودایەك نیە بێجگە لە ئەڵلأ(الله)بەجێهێنانی نوێژ دانی زەکاتە و پێنج یەکی دەستکەوتە قەدەغەتان لی دەکەم لە چارشتە -کەهەرچواریان ئامێرن بۆدرووست کردنی ئارەق..)).

لە هەڵوێستێکیتردا.. پێغەمبەر((ﷺ))وهاوەڵان شەو رەوی دەکەن.. دوای ئەوەی کە زۆر ماندوو دەبن.. هەتا دوا کۆتایی شەو.. خۆیان لادا لە رێگە بۆ ئەوەی بخەون.. خەو زووری بۆ هێنان هەتا خۆریان لێ هەڵ هات و بەرزبووەوە.. یەکەم کەسێك کە بە هۆش هاتەوە لە خەوەکەی ئەبوو بەکر بوو.. لە پاشاندا عومەر بوو ئەبوبەکر دانیشت لەلاسەری پێغەمبەرەوە ((ﷺ))دەیوت (الله اكبر) دووبارەی دەکردەوەو دەنگی پێ بەرز دەکردەوە.. هەتا پێغەمبەر((ﷺ))

هەستا لەخەو .. بۆیە دەستیان بەنوێژی بەیانی کرد.. کاتێك لە نوێژەکەیان بوونەوە پێغەمبەر ((ﷺ)) کابرایەکی بینی نوێژی لەگەڵ نەکردن..

پێغەمبەر((ﷺ))فەرمووی: ئەی فلان کەس چی وایلێکرد نوێژمان لەگەڵ نەکەیت؟

ئەویش وتی:لەش پیس بووم.. ئاویش نییە.. پێغەمبەر((ﷺ)) فەرمانی پێ دا تەیەممووم بکات.. لە پاشاندا نوێژەکەی بکات..

لە پاشاندا پێغەمبەر((ﷺ)) فەرمانی بە رێکردن پێ کردن.. هیچ ئاویان پێ نەمابوو.. بۆیە تینوو بوون.. هیچ بیرێکیان دەست نەکەوت یان هیچ ئاوێك..

عمرانی کوڕی حصین دەڵێت: ئێمە رێمان دەکرد واسەیر دەکەین ئەوە پیرەژنێکە لەسەر حوشترێك دوو گۆزەی ئاوی پێ بوو.. وتمان: ئاو لە کوێیە؟!..

وتی: ئاونییە.. وتمان ئاو لە ئێمە چەندە دوورە ؟.. ووتی شەوو رۆژێك..

وتمان :وەرە بۆلای پێغەمبەر. ((ﷺ)). وتی پێغەمبەر((ﷺ)) کێیە..!!؟

ئێمەش لەگەڵ خۆمان بردمان بۆ لای پێغەمبەر بۆ ئەوەی رێگەی ئاومان پێ نیشان بدات.. هەتا چووینە خزمەت پێغەمبەر((ﷺ))پرسیاری ئاوی لێکرد.. بەهەمان وەڵام کە وەڵامی ئێمەی پێ دابووە... وەڵامی پێغەمبەریشی((ﷺ))پێدایەوە.. ئەوەندەشی وت ئەو دایکی چەند منداڵێکی هەتیووە.. پێغەمبەر ((ﷺ))ئاوەکەی لێ وەرگرت.. ناوی خودای لێهێنا.. دەستی بەسەر ئاوو گۆزە کەدا هێنا.. لە پاشاندا پێغەمبەر((ﷺ)) بەدەستی خۆی لەو گۆزە ئاوی دەکردە ئەو قاپ ومەنجەڵەی ئێمە پێمان بوو.. ئێمە هەموومان خۆمان پێ تێر ئاو کرد چل کەس بووین.. هەتا هەموومان تێر بووین.. هەر چیشمان پێ بوو لێمان پڕ کرد. لەپاشاندا

هەردوو گۆزەی ئافرەتەکەمان بەجێ هێشتەوە بۆ ئافرەتەکە.. لەوپەڕی پڕپیدابوون.. لەپاشاندا پێغەمبەر ((ﷺ))فەرمووی: دەی خواردنەکانتان بهێنن.. هەندێك نان و خورمامان بۆ ئافرەتەکە کۆکردەوە.. لەپاشاندا پێغەمبەر((ﷺ)) بە ئافرەتەکەی فەرمووی:- ئەم خۆراکە ببەوە بۆ منداڵەکانت.. ئەوەش بزانە ئێمە هیچ ئاومان لەجەوانەکەی تۆ کەم نەکرد.. ئەوە نەبێ کە خودا رۆزی ئێمەیدا..

لەپاشاندا ئافرەتەکە سواری حوشترەکەی بوو.. زۆر پێ خۆشحاڵ بوو.. بە وخواردن وخورمایە. هەتاگەیشتە لای منداڵەکانی..

وتی: من لەلای ساحیرترین بە مرۆڤەوە هاتووەمەتەوە.

یان راست دەکات پێغەمبەری ((ﷺ))خودایە وەك چۆن خۆیان وتیان..

خزمانی سەریان سوڕما لەو رەوشتە بەرزەی پێغەمبەر((ﷺ)) لەگەڵ ئەو ئافرەتە.. بۆیە زۆری پێ نەچوو هەتا ئافرەتەکەو خزمانی مۆسوڵمان بوونی خۆیان راگەیاند(متفق علیه).

بەڵێ... ئەم ئافرەتە سەرسام بوو بە هەڵسوکەوت. سەخاوەتی پێغەمبەر((ﷺ))بۆ یەکەم جار بینی..

ئەنەس رۆژێك لە رۆژان کابرایەك هاتە خزمەت پێغەمبەر و داوای ماڵ وسامانی لە پێغەمبەر کرد کۆمەڵە مەڕێکی زۆری پێ بەخشی لەنێوان دوو چیادابوون..

کابرا گەڕایەوە بۆ ناو خزمانی.. وتی: ئەی خزمان وەرن باوەڕ بهێنن.. چونکە پێغەمبەر((ﷺ)) بەخشینێك دەدات هەرگیز لە هەژاری ناترسین..

ئەنەس دەڵێت: کابرابەك دەهاتە خزمەت پێغەمبەر ((ﷺ))تەنها دونیای دەویست بەلأم کە دەگەڕایەوە ئێوارەی لێدادەهات ئایینەکەی دەبووە خۆشەویسترین شت بۆی.. بەرزترین شت لەسەری .. لە دونیاو هەر چیشی تیادابێ.(رواه مسلم)

## پێش نیاریك..

**بەیەکەم گەیشتن بەخەڵکانی تر لە ٧٠٪ وێنەی تۆ لەسەر مێشکیان تۆمار دەبێت. کەواتە هەڵسوکەوتت لەگەڵ خەڵکی بەڕشێوەیە بێت کە ئەمە یەکەم پێ گەیشتنە و دوابە یەکگەیشتن بێت لە نێوانتاندا..**

## تەنها موویەك..!!

مامۆستایەك وانەی بیركاریی ئامادەییی دەوتەوە .. هەستی دەكرد زۆریان فەرامۆشییان هەیە بۆ مادەكەیان.. ئەویش ویستی فێری ئەوەیان بكات گرنگی بدەن بە وانەو مادەكەیان ..
بۆیە رۆژێك لە ناكاو پێی وتن ئەمرۆ تاقیكردنەوە.. قوتابیان زۆرباری دەروونییان ئاڵۆز بوو.. چۆن ئەمرۆ ئەزموونمان دەكات ئێمە هیچمان نەخوێندووە؟!ئەویش وتی تەواو بڕیارم داوە ئەزموونە..

قوتابییەكی زەبەلاح بالاّ بەرزی بە گرفت وتی: من ئەزموون ناكەم..

مامۆستاكە: ئەبێت تاقیكردنەوە بكەیت پێت خۆش بێت یان پێت ناخۆش بێت ..

قوتابی: ئاخر من تاقیكردنەوە ناكەم ..

مامۆستاكە: نزیك دەبێتەوە لە قوتابییەكە ئاخر تۆ بە دەستی خۆت نییە تاقی كردنەوە نەكەیت..

قوتابییەكە: ئاخر هیچ مامۆستایەك بۆی نیە بە زۆر تاقیكردنەوە بەمن بكات..

مامۆستا: ئەریّ تۆ ئەزانیت زۆر دەم درێژیت! دەبڕۆ دەریّ..

قووتابییەكە: تۆ ئەبێت بڕۆیتە دەریّ..

بۆیە: قوتابییەكە هەتا بۆی كرا لە مامۆستاكەی دا..چونكە مامۆستاكە قسەی پیّ وت و سوكایەتیی پیّ كرد..

هەر پرسیار مەکە چی لێ بە سەرهێنا!! ئەمەش گەیشتە بەڕێوەبەرایەتیی قووتابخانە ..
قوتابییەکە سزا درا بەوەی دوو پلەی لێ شکا، سۆزداری ئەوەیان پێ کرد کە جارێکی تر
دەست بە زمان درێژی نەکات..

بەلاَم .. مامۆستاکە بوو بەباس وخواسی گەورە و بچووك نزیك ودوور.. وای لێهات خەڵك
نموونەی پێ دەهێنایەوە.. بوو بە گاڵتە جاڕ هەموو قوتابییان.. لە هەر کوێوە تێپەڕبووایە
ئاماژەیان پێ دەکرد گوێی لە تانە وتەشەری ئەوان بوو . هەتا چاری ناچار بوو لەو
قوتابخانەیە خۆی گواستەوە بۆ قوتابخانەیەکی تر.
بەلاَم مامۆستایەکی تر بەهەمان هەڵویستدا چوو بەپەلەو لەناکاودا ئەزموونە..
بەهەمان شێوە قوتابییەکی تری تیادابوو.. ئاژاوەچی. بەدەنگی بەرز هاواری کرد: مامۆستا
بەدەستی تۆ نییە ئەزموون بەبێ ئاگاداری کردنەوە نییە!!
بەلاَم مامۆستاکە کێوێك بوو نە هەژا نەوکەسە هەست بەگرانبەهایی دەکات کاتێك ئەیەوێت
بەسەریدا سەرکەوێت بۆیە مامۆستاکە دەزانێ توڕەیی بەرامبەری !!.. ناکرێت بە تووڕەیی..
خەندەی کردو بە قوتابییەکەی وت کەواتە تۆ ناتەوێ تاقی کردنەوە ئەنجام بدەیت؟
قووتابییەکە: بەهاوار ودەنگی بەرزەوە وتی: نەخێر..
مامۆستاکە زۆر بە لەسەر خۆییەوە..باشە.. هەرکەسێك نایەوێ تاقیکردنەوە بکات ئێمە بە
یاسا لە گەڵی دەڕۆین..
بۆیە مامۆستاکە پرسیاری یەکەمی نووسی ئەم هاوکێشەیە بنووسن. س +ص -ع+ ١٥
بۆچی..؟ چوو نموونەی تری هێنایەوە.. بەلاَم قوتابییەکە ئارامی نەگرت و وتی ئاخر مامۆستا
من نامەوێ تاقی کردنەوە ئەنجام بدەم..
مامۆستاکەش زۆر بە لەسەر خۆییەوە...و..
وتی: ئایا زۆرم لێ کردوویت.. تۆ خۆت بەرپرسیاری هەڵسوکەوتی خۆتی..
قوتابییەکە هیچ شتێکی دەست نەکەوت کە تووڕەی بکات.. بۆیە هێمن ولە سەر خۆ بوویەوەو
پێنووس و پەڕاوی دەرهێنا چاری ناچار بوو تاقیکردنەوەی خۆی دەست پێ بکات..
لەپاشاندا لێپرسینەوەی لێ کرا لەسەر بەدرەوشتییەکەی لەرێگەی بەڕێوەبەری قووتابخانەوە.
ئەم چیرۆکە داهێنراوەم هاتەوە بیر، بەرا ورد کردنم کرد لەگەڵ ئەوەی کە مرۆڤ توانای هەبێت

لەسەر هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ هەڵوێستەکان منیش تێرامان و بیرکردنەوەم ئەوەیە کە لێهاتوویی وشارەزایی مرۆڤەکان دەتوانێت ئاگر هەڵگیرسێنێت و خامۆشی بکات زیلکەی لێببڕێ..

هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ مرۆڤی تووڕە وعەسەبی بە تووڕەیی و عەسەبیەت سەربۆ ئەوە دەکێشێ لەوکات وشوێنە بتەقێتەوە ولێکدان دروست بێت.. لەو شتانە کە لەلای هەموو هۆشمەندان زانراوە.. ئەوەی ئاگر بە ئاگر بگەیەنێ زیاتر بڵێسە داری دەکات زیاتر خۆش دەبێ و گڕو کڵپە دەسێنێ..

لەبەرامبەری ئەوەشدا ئەوەی ساردی بەرامبەر ساردی ئەنجام بدات.. کارەکان ڕێك ناکەون.. کەواتە پەیوەندی و هەڵسوکەوتت لەگەڵ خەڵکی بە پێی پێویست بێت وەك موعاویە-ڕەزای خودای لێبێت-بە وشێوەیە بێت..

(کە لێی پرسرا چۆن توانیوتە کە خەڵکی بەڕێوەبەری بۆ بیست ساڵ وەك سەرکردەیەك بۆ سەربازەکان لە پاشاندا ببێتە جێنشینی مسوڵمانان بۆبیست ساڵی تر؟.

ئەویش وتی: هەڵسوکەوتم لەگەڵیان ئەوەبوو موویەکم لە نێوان خۆم وئەواندا دانابوو سەرێکی مووەکە بەدەستی منەوە بوو.. سەرەکەی تریش بەدەستی ئەوانەوە بوو.

ئەگەر ئەوان رایان کێشایە بەرەو خۆیان منیش دەستم بۆ شل دەکرد بۆ ئەوەی نەپسێت .. ئەگەر ئەوان دەستیان شل بکردایە من دەستی خۆمم توند دەکرد..ڕاستی فەرمووە. ڕەزای خودای لێ بێ زۆر دانابووە!!)

وا گومان دەبەم لەم ژیانەی ڕۆژانەی خۆماندا هیچ ژن وپیاوێك ناتوانن بە خۆشی ژیان ببەنە سەر ئەگەر هەردووکیان تووڕە وعەسەبی بن..وەك چۆن هیچ دوو برادەرو هەڤاڵ و دۆستێکیش بەهەمان شێوە ناتوانن ژیان ببەنەسەر ئەگەر هەردووکیان عەسەبی وتووڕە بن..

هەر بەم بۆنەوە دێتەوە یادم موحازەرەیەکم دا لە گرتووخانەیەکدا بەناوی هۆکارەکانی کوشتن دوای کۆتاییهاتنی موحازەرەکە هەر هەموویان چوونەوە سەر جێگەی خۆیان..کابرایەکیان هاتە لام، وتی : سوپاست دەکەم بۆ موحازەرەکەت..

لەپاشاندا خۆی پێ ناساندم کە بەرپرسی باڵێکە لە گرتووخانەکە وەك لایەنی ڕۆشنبیری .. منیش لێم پرسی هۆی جێبەجێکردنی کوشتن چییە بۆچوونی تۆ لەلای ئەم گیراوانە وتی: تووڕەیی.. تووڕەیی.. سوێند بەخودای گەورەی مامۆستا تیاندایە کەسێکی کوشتووە لە پێناو چەند پارەیەکی هەر زۆر کەم کە کێشەکەوتووتە نێوان ئەو کابرایەکی دووکاندار یان بەنزین

فرۆشی. ئا لەوکاتەدا فەرموودە گەورەکەی پێغەمبەرم((ﷺ)) دێتەوە یاد کە دەفەرموێت:( لیس الشدید بالصرعة ولکن الشدید من یملك نفسه عندالغضب ...(متفق علیه).

واتە: (( پاڵەوان ئەو کەسەنیە کەپاڵەوانی بازبێت بەڵکو ئەو کەسە یە کەلەکاتی توورەییدا کۆنتۆڵی خۆی پێ دەکرێت..بەڵێ راستە ئازاو لێهاتو ئەوەنیە لەشو لاری بەهێزبێت بەڵام ئازاو لێهاتو ئەوەیە مرۆڤ دان بەخۆدا گریێت..)).

ئەگەر وانەبێ ئاژەڵ ودڕندەکان بە هێزترو لێهاتووتر دەبوون لەمرۆڤ بەڵکو لێهاتوو ئازاو دلێر ئەوەیە بزانیت چۆن هەڵسوکەوت دەکات لەگەڵ خەڵکی..لەگەڵ خێزانی ..لەگەڵ منداڵەکانی.. هاوەڵ وبرادەرەکانی..

بەبێ ئەوەی ئەوان لەدەستی خۆی بدات بەهۆی توورەبوونییەوە.

لە فەرموودەداهاتووە :(لا یقض القاض وهو غضبان ))(رواه ابو داود والترمذي وقال حدیث حسن صحیح) .

واتە: ((با هیچ دادوەرێك فەرمان نەدات لەکاتی توورەییدا)).

فەرمان دراوە بەراهێنانی دەروون لەسەر لێبووردەیی خۆڕاهێنانی لەسەر ئارامگری وەك پێغەمبەر ((ﷺ))دەفەرمووێت: (((انما العلم بالعلم (رواه الدار قطني في الافراد وهو حسن)..

واتە : ((زانستەکان بەفێربوونەو هێمنیی و لەسەرخۆییش بەخۆڕاهێنانە)).

بەڵێ بە خۆڕاهێنان لەسەر ئارام گری بۆ جاری یەکەم ١٠٠٪ ئەو زەحمەتە.. لە جاری دووەمدا٩٠٪ لەجاری سێیەمدا ٨٠٪ زەحمەتە.. هەتا وردە وردە دەبێتە رەوشت ونەریت لە تۆدا..

چیرۆکێکی خۆشیان بۆ باس کردم ئەویش لە شاری (املج) کە ٣٠٠ کم لە خوارووی جدەوەیە کابرایەکیان بۆ باس کردم کە زۆر توورە و عەسەبییە بەڵام رۆژێك زۆر بەهێواشی ولەسەرخۆ دەڕوات لەناو سەیارەکەیدا..

سەیارەی لەدوای ئەویش هەر هۆڕن و (هێمای)رماشی بۆ دەکات بۆ ئەوەی دەرفەتی بدات بەڵام ئەو هەر بە هێواشی دەڕوات و بەدەستیش ئامارەدەکات بۆ ئەوەی سەیارەی پاش خۆیشی بە هێواشی بڕوات.

بۆیە سەیارەی پاش ئەو زۆر توورە دەبێ .. پێش ئەو دەکەوێت خۆی دەداتە پێش سەیارەکەیخەریك بوو بەیەکدابکێشن.. بەڵام تووشی زیان نابن..

فرۆشی. ئا لەوکاتەدا فەرمووده گەورەکەی پێغەمبەرم((ﷺ)) دێتەوه یاد کە دەفەرموێت:(
ليس الشديد بالصرعة ولكن الشديد من يملك نفسه عندالغضب ...(متفق عليه).
واتە: (( پاڵەوان ئەو کەسەنیە کەپاڵەوانی بازبێت بەڵکو ئەو کەسە یە کەلەکاتی توورەییدا کۆنتۆڵی خۆی پیٚ دەکرێت..بەڵیٚ راستە ئازاو لێهاتو ئەوەنیە لەشو لاری بەهێزبێت بەڵام ئازاو لێهاتو ئەوەیە مرۆڤ دان بەخۆدا گربێت..)).
ئەگەر وانەبیٚ ئاژەڵ ودڕندەکان بە هێزترو لێهاتووتر دەبوون لەمرۆڤ بەڵکو لێهاتوو ئازاو دلێر ئەوەیە بزانیت چۆن هەڵسوکەوت دەکات لەگەڵ خەڵکی..لەگەڵ خێزانی ..لەگەڵ مندالەکانی.. هاوەڵ وبرادەرەکانی..
بەبیٚ ئەوەی ئەوان لەدەستی خۆی بدات بەهۆی تووڕەبوونییەوه.
لە فەرموودەداهاتووه :(لا يقض القاض وهو غضبان ))(رواه ابو داود والترمذي وقال حديث حسن صحيح) .
واتە: ((با هیچ دادوەرێك فەرمان نەدات لەکاتی توورەییدا)).
فەرمان دراوه بەراهێنانی دەروون لەسەر لێبووردەیی خۆراهێنانی لەسەر ئارامگری وەك پێغەمبەر ((ﷺ))دەفەرمووێت: (((انما العلم بالعلم (رواه الدار قطني في الافراد وهو حسن)..
واتە : ((زانستەکان بەفێربوونەو هێمنیی و لەسەرخۆییش بەخۆراهێنانە)).
بەڵیٚ بە خۆراهێنان لەسەر ئارام گری بۆ جاری یەکەم ١٠٠٪ ئەو زەحمەتە.. لە جاری دووەمدا٩٠٪ لەجاری سێیەمدا ٨٠٪ زەحمەتە.. هەتا وردە وردە دەبێتە رەوشت ونەریت لە تۆدا..
چیرۆکێکی خۆشیان بۆ باس کردم ئەویش لە شاری (املج) کە ٣٠٠ کم لە خوارووی جدەوەیە کابرایەکیان بۆ باس کردم کە زۆر تووڕه و عەسەبییە بەڵام رۆژێك زۆر بەهێواشی ولەسەرخۆ دەڕوات لەناو سەیارەکەیدا..
سەیارەی لەدوای ئەویش هەر هۆڕن و (هێمای)رماشی بۆ دەکات بۆ ئەوەی دەرفەتی بدات بەڵام ئەو هەر بە هێواشی دەڕوات و بەدەستیش ئاماژەدەکات بۆ ئەوەی سەیارەی پاش خۆیشی بە هێواشی بڕوات.
بۆیە سەیارەی پاش ئەو زۆر تووڕە دەبیٚ .. پێش ئەو دەکەوێت خۆی دەداتە پێش سەیارەکەیخەریك بوو بەیەکدابکێشن.. بەڵام تووشی زیان نابن..

بۆیە کابرای تووڕە.. زۆر تووڕە دەبێ.. خێرایی سەیارەکەی زۆر زیاتر دەکات بەلایتی سەیارەکەی ئاماژەیان بۆ دەکات بۆ ئەوەی دەبێ راوەستن.. هەتا راوەستان..

بۆیە جامانەکەی سەری خۆی لادا.. پارچە ئاسنێکی بەدەستەوە گرت کە بۆ کردنەوەی تایەی سەیارەکەی هەڵی گرتبوو.. دابەزی لە سەیارە بەپەلە بەرەو سەیارەکەی تر رۆیشت.. زۆر تووڕەیی پێوە دیار بوو ئاسنەکەشی بەدەستەوەیە..

کاتێك نزیك بووەوە لە سەیارەکە وا سەیر دەکات سێ کەس بازوویان لە جلەکانەوە هاتبقووە دەرو ماسولکەکانیان هێزیان لێوە دیاربوو.. شان وشەوکەت پان و بەرین ئەوانیش بەرەو ئەو غاردەدەن زۆر تووڕە تر لە ئەو..

واسەیر دەکات ئەوان خۆیان ئامادەکردووە بۆ شەڕکردن!! کاتێك ئەوانی بینی راچڵەکی.. تف لە قوڕگیدا وشك بوو..

کە ئەوان دەڕواننە ئەوو ئاسنەکەیش کە بەدەستییەوەیە ...

کاتێك ئەمەی لێ تێبینی کردن کە ئەوان جوان دیقەت دەدەنە ئاسنەکەی دەستی..

ئەویش زۆر بەهێواشی و لەسەر خۆییەوە ئاسنەکەی بۆ درێژ کردن ..

وتی: داوای لێبوردنم هەیە ویستم ئەوەتان پێ بڵێم ئەم پارچە ئاسنە لە سەیارەکەی ئێوە کەوتووەتە خوارەوە..!!

بۆیە کەسێك لە ئەوان لێی وەر گرت زۆر بە تووڕەییەوە..گەڕانەوە بۆ سەیارەکەیان .. ئەویش بەدەستی خۆی خواحافیزیی لێ کردن..!!

## هاوکێشەیەك..

تووڕەیی وعەسەبی + تووڕەیی وعەسەبی = بە تەقانەدنەوە و تەقینەوە.

| مفتاح القلوب | Hearts key |
|---|---|

## کلیلی کردنەوەی دڵەکان...

**بۆ هەموو دەرگایەك کلیلی کردنەوەی خۆی هەیە .. کلیلی گونجاوو لەبار بۆ کردنەوەی ولەکاتی بیینیی مرۆڤەکان بریتییە لە ناسینی سروشتە کانیان..**
**چارەسەرکردنی کێشاکانی خەڵکی.. چاکسازی کردنی نێوانیانە.. سودیان لێ وەرگری چۆن لەبەد وخراپە یان خۆ بپارێزیت.. ئەمانە هەموو ئاسان دەبن ئەگەر تۆ سروشتیان بزانیت..**
**وادابنێ کێشەکەوتە نێوان گەنجێك وباوکیەوە کێشەکە گەورەبوو هەتا باوکەکە کوڕەکەی خۆی دەرکرد لەماڵی خۆیدا، کوڕەکە چەند جار هەوڵی گەڕانەوەی دا بەڵام باوك دڵرەق بوو بەردەوام بوو لەسەر ئەوەی کە نەهێڵێ کوڕەکەی بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە..**
**تۆش خۆت لێ هەڵقورتاند بە نیازی ئەوەی رێکیان بخەیتەوە.. هەر ئاوڕی بۆ نەدایتەوە.. زۆر پڕبوو لە هەموو توڕەییەك.. تۆش ئایەتت بۆ هێنایەوەو فەرموودەی پێغەمبەر ((ﷺ))وترساندن بە گەورەیی تاوانی کەسێك کە صیلەی رەحم بپچڕێنێت..**
**بەڵام هەر هیچ ئاوڕی بۆ نەدایتەوە هەوڵت دا شێوازەی جیاجیان لەگەڵ بەکاربهێنی بۆ گوێدانی ئالێرەدا بۆت دیار دەبێ کە ئەو کابرایە لە سروشتییەوە تووڕەیی هەیە یان ئەوەتا زۆر سۆزدارییە چونکە ئەگەر مرۆڤی سۆزدار تووڕە بێت زۆر بەزەحمەت وەك خۆی لێ دێتەوە وئاشت دەبێتەوە..**

ئەو کات تۆ دێیت دەڵێت ئەی فڵان کەس.. ئەوە منداڵی خۆتە سۆزت بۆی نابیٚ..
ئەوە لەسەر زەوی دەخەویٚ.. ئاسمان پیٚ خەفیەتی..!! تۆ خۆت دەخۆیت ودەخۆیتەوە.. بەڵام هەژارەکەی کوڕت شەو دەکاتەوە وا لەسەرمادا رەق دەبێتەوە.. رۆژ دەکاتەوە ولەبرسادا قوڕەی گەدەو ناوسکی دێت ..

بۆ ئایا تۆ ئەو کوڕەی خۆتت بە بیرنایەتەوە کاتێك پارچە پاروە نانێك بەدەستی خۆت بەرز دەکەیتەوە بۆ دەمی خۆت.. ئایا بە بیرت نایەتەوە ئەو بەوگەرما دەڕوات ودێت لەبەر هەتاودا شوێنێك نییە لێی بحەوێتەوە..؟ بۆ ئایا نایەتەوە بیرت لەکاتی منداڵیدا چۆن لە باوەش وئامێزی خۆتت دەگرت ..بۆنت دەکرد وماچی زۆر بەگەرمیت لیٚ دەکرد.. ئایا تۆ رازیت بەوەی ئەو منداڵەت پێویستی خۆی ببات و بخاتە لای خەڵکی تر کە تۆی باوکی هێشتا لە ژیاندای و زیندووی!!..

ئا لێرەدا هەست دەکەیت سۆزی باوکایەتی دەجوڵیٚ بەم وشەو وتانە.. وردە وردە نزیك دەبێتەوە لە خاڵی بەیەك گەیشتن..بەڵام ئەگەر بۆت دەرکەوت باوکەکە چاوچنۆکەو زۆر زیاد لە سنوور ماڵ وسامانی خۆش دەویٚ..

تۆ ئەوکات پێی دەڵێیت: ئەی فلاٚن کەس ئاگات لە خۆت بێت خۆت نەگلێنیتە کێشەو بێشەیەك کە لە توانای تۆدا نەبێت..

کوڕەکەی خۆت بگێڕەوە و با لە ژێر چاودێریی خۆت بێت چاکترە.. کابرا لەوە دەترسم دزییەك یان زیادە ڕەوییەك بکات لە کەسێك .. ئەو کات حکومەت ومەحکەمە قەرەبووەکەی لە تۆ وەربگرێتەوە.. یان ئەوەی ئەو کوڕە زیانی بە خەڵك گەیاندبیٚ بە تۆی ببێژن..
ئەوەت لەبیر نەچێت تۆ هەر باوکی ئەو کوڕەی هەر چۆنێك بێت..
ئاگات لەخۆت بیٚ..

ئالەم کاتەدا تۆ هەست دەکەیت باوکە چاوچنۆکەکە دەست بە وە دەکاتەوە کە پێوەرەکانی دووبارە رێك دەخاتەوە.. بەڵام ئەگەر قسەت بۆ کوڕەکە کرد.. وا هەستت کرد کوڕە زۆر تەماعبازە.. پێی دەڵێت: ئەی فلاٚن کەس.. کەس سوودت پیٚ ناگەیەنیٚ بێجگە لە باوکت.. سبەینیٚ تۆ ژن دەخوازی و پێویستت بە ژنهێنان هەیە.. کیٚ مارەییەکە و خەرجی ئەم زەماوەندەت بۆ دەکات بێجگە لە باوکت؟

تەنانەت ئەگەر تایەی ماشێنەکەت خراپ ببیٚ و پێویستی بە خەرجی لێکردن بێت کیٚ بێجگە لە باوکت خەرجیت بۆ دەکات؟ ئەگەر نەخۆش بوویت ..

کیَ بێجگە لە باوکت خەرجی خەستەخانەکەت بۆ دەکات براکانت بە حەزو ئارەزووی خۆیان لاف وگەزاف بە پارەی باوکت لیَ دەدەن تۆش خۆت دوورە پەرێزدەکەیت لەو هەموو نازو نیعمەتانە.. خەرجییەکان بەخشین ودیارییەکان.. تۆش لێرەدا بۆ من دانیشتووی وکەوتووی!

ئەی تۆ چ زەرەرو زیانێك دەکەیت ئەگەر بچیت دەست لە ملی باوکت بکەیت ناوچاوانی باوکت ماچ بکەیت.. یان داوای لێبوردنێکی لیَ بکەیت و بەگوێی باوکی خۆتیا بهێنی..
بەهەمان شێوە ئەگەر تۆ هەوڵی ئەوەت دا چاکسازی بکەیت لەنێوان ژن و مێردێکدا.. بەهەمان شێوە هەڵسوکەوت تەندرووست ڕێگەی خۆی دەگریتەبەر و.. دەرگای هەر کام لە ژن و مێردەکە بە کلیلی تایبەتی خۆی دەکاتەوە..
بەهەمان شێوە ئەگەر ویستت مۆڵەتێك وەرگریت لە بەرێوەبەرەکەت لەکاردا..
تۆش دەزانی کە بە هیچ شێوەیەك رۆڵ و گرنگی بەداواکەت نادات و هەرلاناکاتەوە بۆ لایەنی سۆزداری نە بۆ کۆمەلأیەتی.. تەنها ئەو کاری دەویَ و((هیچی تر))..
ئەو کات تۆ پێی دەڵێیت: من پێویستم بە مۆڵەتی سیَ رۆژ هەیە بۆ ئەوەی تواناو وزەکانی کارکردنم بۆ بگێڕێتەوە.. هێزو بازووی کارکردنم بۆ تازە ببێتەوە..
چونکە بە راستی من خۆم لەخۆمدا هەستم کردووە توانای بەرهەم هێنانم هێواش هێواش کەم بووەتەوە دەرفەتم پیَ بدە بۆ ئەوەی هەندێك ئیسراحەت بدەم بە "سەرو مێشکم" تەنها بۆ سیَ رۆژ، بۆئەوەی بگەڕێمەوە بەهێزو بازووی زیاترەوە بۆ ئیش کردن...
بەڵام ئەگەر بەڕێوەبەرەکەت کابرایەکی کۆمەلأیەتی بوو، بە ئەوەی تۆ تێبینیت کردووە لەکاتی هەڵسوکەوتی..
کە ئەو سوورە لەسەر ئەوەی خێزان و خانەوادە دەرفەتی گونجاوی خۆیان وەرگرن.. تویش پێی دەڵێیت: مۆڵەتم دەوێت بۆئەوەی باوك و دایکم ببینم.. منداڵەکانم ببینم ..
من واهەست دەکەم ئەوان لەشیوو دۆڵێکن، منیش لە شێوو دۆڵێکی ترم.بێجگەلەم قسانەش ..
کەواتە شارەزاو پسپۆر بە لەم جۆرە لێهاتوویانەدا.. ئەو کات دەبینی کە خەڵك پێت دەڵێن: کە هیچ کەسمان وەك فڵان کەس نەدیوە کە توانای ئیقناعکردن و رازی کردنی هەبێت..

## دەرئەنجامێك...

بۆ هەموو مرۆڤێك کلیلی کردنەوەی تایبەتی خۆی هەیە..
شارەزایی لە سۆز و رەوشتی هەر مرۆڤێك ڕێگە نیشاندەرتە بۆ سەر

| Feel that you Like them | أشعرهم بأنك تحبهم |
|---|---|

## چاودێریکردنی جیاوازییەکان لە دەروونەدا..

خەڵکان بە تێکڕا زەوقیان لە ژیاندا لەنێوان کەساری و خۆشی دایە.. تەندروستی و نەخۆشیدا.. دەوڵەمەندی و هەژاریدا .. راگیربوون و دڵەراوکێیان..

لە پاشاندا شێوازی هەڵسوکەوتیان بۆیە پەسندکردنی ئەم جۆرەها بەسەرهاتە دەگۆڕێت "یان بۆبەر پەرچدانەوەی ئەم جۆرە لێ بەسەرهات و ڕووداوەکان هەر کەسە و لەسەر ئەو شێوازەی کە دەتوانێ ئەم کارە پەسەند بکات یان پێی رازی نەبێت ئەمەش بە روون و ئاشکرا رەنگدەداتەوە لەکاتی هەڵسوکەوتەکاندا لەگەڵ خەڵکانی تر..

بۆیە جاری وادەبێت نوکتەیەکت لێ وەردەگرێ و حەزی بە گاڵتە و سوعبەت کردن لەکاتێکا راگیرو دڵنیایە لە دەروونی خۆیدا.. بەڵام هەر هەمان کەس نە نوکتەی خۆشیت لێ وەردەگرێ نە سوعبەت کردنت لێ پەسەند دەکات کاتێك دڵتەنگ و پەژارەو کەسار ڕووی لە دەروونی کردووە..

بۆیە هیچ گونجاو نییە کە تۆ پێبکەنیت لەکاتی "تەعزیە" و مردوو لێ مردووان..!!

بەڵام قسەی نەرم و لەسەرخۆت لێ وەردەگرێ باتێکەڵ بێ بەکەمێ پێکەنین و زەردەخەنە..

ئەمەش لەلای هەموو هۆشمەندانی دونیا پەسەندە با ئەمەش مەبەستی تایبەتیم نەبێت لە هێنانەوەی ئەم قسەو باسەدا لێرەدا..بەڵکو مەبەستم لێرەدا ئەوەیە کە مرۆڤ لەسەریەتی

چاودێری بارودۆخی خەڵکان بکات و هەستەکانیان رابگرێت لەکاتی قسە کردن لەگەڵیان یان لەکاتی هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکیدا..

وا دابنێ کە ئافرەتێک جیا بووبێتەوە لە پیاوەکەی لەکاتێکا باوک و دایکیشی نەمابن.. ئەوانیش لەوەو پێشتر مردو بن.. بۆیە ئافرەتەکەش چاری ناچارە کە شتوومەکەکانی خۆی کۆبکاتەوە بۆئەوەی لە گەڵ براو خێزانی براکەی بژی.. ئەوان ئا لەو حاڵەتەدا بوون دراوسێیەکیان بەسەردان هات بۆلایان..

ئافرەتە تەڵاقدراوەکەی پێش پێشوازی لێ کردو بەخێرهاتن و خزمەتی کرد بە پێشکەش کردنی چایی و قاوە بۆی.. بۆیە کابرا سەردانیکار بیری لەوە دەکردەوە کە قسە و باسێك بدۆزێتەوە بۆئەوەی دڵنەوایی ئەوەی پێ بداتەوە بەڵام ئافرەتە تەڵاقدراوەکەی لەوی پرسی.. دوێنێ تۆم دی لە ماڵی خۆتان دەرچووی..

کابرای سەردانی کار "دراوسێ" وتی ئا بەڵێ.. باوکی فلان –مەبەست پێی مێردەکەیەتی کە ئەو ئافرەتەی تەڵاقدراوە– زۆری لێکردم بۆئەوەی بچینە دەرێ بۆ پیاسە کردن ئێمەش دەرچووین و چووینە بازار بۆیە جلێکی جوانی کڕی بۆ خوشکەکەم کە بە مێرددەدرێت..

لەپاشاندا لەدووکانێکی زێڕ وەستاین و ئەڵقەیەکی زێڕی کڕی بە دیاری بۆ من بۆشاییەکە..

کاتێکیش گەڕاینەوە بۆماڵ منداڵەکان بێ تاقەت بوون سۆزی ئەوەیشیدا کە لە حەفتەی ئایندەدا ئەوانیش بۆ گەشتێك ببات..

ئافرەتە تەڵاقدراوە داماوەکەش هەر گوێ دەگرێ و زۆر بێ تاقەت بووە خەیاڵ و داڵغە دەیباتەوە کە ئێستا ئەو لە ماڵی برایەتی!!..

پرسیار لێرەدا ئەوەیە ئایا باسکردنی ئەم جۆرە قسەو باسە گونجاوو لەبارە لەگەڵ ئافرەتێك کە سەرکەوتوو نەبووە لە پرۆسەی هاوسەرایەتی لەگەڵ ئەو پیاوەی خۆی؟!!..

ئایا گومان دەبەیت ئەم ئافرەتە تەڵاقدراوە خۆشەویستی و رێزی بۆ ئەم کابرایەی دراوسێ زیاد بکات؟.. حەزی بەوە بێت کە لەگەڵی دانیشێ؟.. شادو دڵخۆش بێت بە سەردان ئەم کابرایەش بۆ ماڵی ؟ با هەموو کۆبین لەسەر یەك وەڵامی ئەم پرسیارە و بەڕاشکاوی بڵێین نەخێر..بەڵکو دڵی پڕ رق و کینە دەبێت لەو کابرایە..

کەواتە ئەی چارە؟ ئایا ئەو کابرایە درۆ بکات؟نەخێر..

بەڵام با کورتی ببڕێنێتەوە.. وەك ئەوەی بڵێت ئێمە هەندێك ئیش و کارمان هەبوو بۆ جێبەجێ کردنیان چووین.. لە پاشاندا قسەی لابداو بگۆڕێ بۆ قسەو باسێکی تر کەباس و

دڵنەوایی ئافرەتەکە بداتەوە لەسەر ئارامگری و خۆڕاگری لەسەر ئەو ناخۆشیانەی کەلە ناویاندایە. یان وادابنێ.. دوو هاوەڵ و برادەری قوتابخانە بە ئەزموونی کۆتایی ساڵدا تێپەڕبوون. قوتابییەکیان سەرکەوتوو بوو بە پلەیەکی زۆر باشەوە.. بەڵام دووەمیان لە چەند وانەیەکدا مایەوە.. یان ئەگەر دەرچوو بێت پلەکانی بەرز نییە بەڵکو لاوازە جێی ئومێدی ئەوەی لێ ناکرێت کە پەسەندی بدرێتێ لە هیچ زانکۆیەکدا.. ئایا تۆ بەگونجاو و لەباری دەزانیت کاتێك برادەرە سەرکەوتووەکە بە بە دەستهێنانی پلەی بەرز باس لە زانکۆکان بکات چۆن تیایدا وەرگیراوە یان ئەو تایبەتمەندیانەی کە پێی دەدرێت تیایاندا..

بێ گومان وەڵاممان ئەوەیە: نەخێر.. کەواتە ئەی چارە؟چارە ئەوەیە هەندێ شتی گشتی بۆ باس بکات کە ئەو ناخۆشیەی ئەوی تیادایە لەسەری سووك ببێت.. وەك ئەوەی باس لەزۆری قەرەباڵغی بکات لە کۆلیژەکاندا.. کەم کەسێك وەردەگیرێ..

تەنانەت ئەوانەش کە دۆسیەکانیان لێ وەرگیراوە ترسی ئەوەیان هەیە وەرنەگیرێن.. هەتا بۆئەوەی هەندێك قورسایی لەسەر برادەرەکەی ئاسان بکات.

بۆیە بەم شێوەیە ئەویش حەزی لەوە دەبێت زیاتر لەگەڵی دابنیشێت.. زیاتر خۆشەویستی بۆ بەردەوامتر دەبێت.. دڵی بەلایدا دەچێت.. هەست ئەکات کە ئەو لێیەوە نزیکە..

بەهەمان شێوە بڵێ ئەگەر دوو گەنج یەکێیان باوکی زۆر دڵی کراوەیەو پارەو پوول بەسەریدا دەڕژێنێ ئەویتریان باوکی زۆر چاوچنۆکە دەستی لەگەردەن و ملی خۆی گرێ داوە و نایکاتەوە..

تەنانەت ئەوەندەی پارە ناداتێ کە بە تێرو تەسەلی شتە پێویستییەکانی پێ بکڕێت.. کەواتە گونجاو نیە کوڕی کابرای سەخی باس لەو سەروەت و سامانە بکات کە باوکی بەسەریدا دەڕژێنێت.. چەندە دەوڵەمەندەو چی مەبەست بێ پێی دەدات.. و چونکە ئەم جۆرە قسەیە دڵی برادەرەکەی پێ تەنگ دەبێت..

ئەوەی بە بیر دێنێتەوە کە باوکی چەند خراپە لە گەڵی.. بەم کارەش ئەو برادەرە حەزی بە دانیشتن و هەڵسوکەوت لەگەڵ برادەرەکەی کەم دەبێتەوە یان هەر حەز ناکات بیبینێ و هەست بەوە دەکات ئەم برادەرەی دوورە لە هەست کردن بە کێشەو ناخۆشیەکانی..

هەر لەبەر ئەوە پێغەمبەر ((ﷺ)) ئێمەی ئاگادار کردەوە بۆ چاودێری کردنی هەست و نەستی خەڵکانیتر و لایەنی دەروونییان لەبەرچاو بگیرێت..ئەوەی فەرمووی: ((لا تطيلوا النظر الى المجذوم)) رواه ابن ماجة وهو صحيح.واتە "ئێوە لە روانینتان بۆ ئەو کەسە کە گەڕبووە درێژ

خایەن مەبن.. گونجاو و لەبار نییە کاتێك ڕەتدەبێ بەلای کەسانێکدا ئەوان چاوی تێبڕێ چونکە ئەمە خۆی بەڵاو موسیبەتەکەی بەسەریەوەیەتی بەبیری دەهێنێتەوە ئەمەش وای لێ دەکات نیگەران و دڵتەنگی بکات.

لە هەڵوێستێکی سەرنج ڕاکێشی پێغەمبەر((ﷺ)) کە چۆن هەڵسوکەوتی جوان و بێ وێنەی لە گەڵ باوکی ئەبووبەکری صدیقداکرد.. کاتێك سوپای ئیسلام بەسەرکردایەتی پێغەمبەر((ﷺ)) نزیك دەبێتەوە لە شاری مەککەو باوکی ئەبوبەکر دەڵێت :

((مبەنەوە ماڵێ بۆ ئەوەی لەوێدا هەست بە دڵنیایی بکەین دڵنیایان دەکەنەوە چونکە پێغەمبەر((ﷺ)) فەرمووی ((من دخل داره فهو آمن)).

بەڵام ئەوان هێشتا لەم قسەو باسەدابوون سوپای ئیسلام خۆی گەیاندە شاری مەککەی پیرۆز بۆیە ئەبو بەکری کوڕی چووە خزمەتی باوکی زۆر بەگەرمییەوە خۆشحاڵی خۆی دەربڕی بە بینینی باوکی و هێنایە خزمەت پێغەمبەر((ﷺ)) بۆ مزگەوت کاتێك پێغەمبەر((ﷺ)) باوکی ئەبوو بەکری بینی ..

وا سەیر دەکات لەوانەیە مردنیش لێی نزیك بووبێتەوە.. ئەبوبەکریش زۆر بەتام و چێژەوە دیقەتی داوەتە باوکی.. چونکە ئەوا چەندەها ساڵە لە یەك دابڕاون و.. نەیتوانیوە خزمەتی بکات وەك باوك و کوڕ لەبەر خزمەتکردنی ئەم ئایینە پیرۆزە..

بۆیە پێغەمبەر((ﷺ))رووی کردە ئەبوو بەکر بۆئەوەی دڵنەوایی و دڵخۆشی ئەبوو بەکر بکاتەوە.. نرخ و بەهای گەوهەری ئەبوبەکر بۆ ئەبووبەکر و خەڵکانی تریش دەربخات لەلای پێغەمبەر ((ﷺ)): ((هلا تركت الشيخ في بيته حتى اكون انا آتية فيه؟!))..

ئەی ئەبوبەکر نە ئەکرا کە ئەم باوکە بە ساڵاچووەت لەماڵ دابنیایە بۆ ئەوەی من خۆم بچوومایە بۆلای بۆ ماڵی؟!..

ئەبوبەکر ڕەزای خوای لێ بێ- دەزانێ ئەوان وا هێشتا لە جەنگدان.. ڕابەرو پێشەوایان پێغەمبەرە((ﷺ)).. کاتی زۆر لەوە کەمترە.. کاروباری زۆر زیاترە لەوەی لە دەرفەت و مۆڵەتی هەبێت بۆ ئەوەی بچێتە ماڵی باوکی و لەوێ بانگەوازی بکات بۆ ئیسلام..

بۆیە ئەبوبەکر سوپاسی پێغەمبەری((ﷺ)) کرد: ئەی پێغەمبەری((ﷺ))خودا ئەو شیاو ترە کە بە پێی خۆی بێتە لای تۆ.. لەوەی کە تۆ بڕۆیت بۆ لای ئەو.. بۆیە پێغەمبەر بەدەستی خۆی

باوکی ئەبووبەکری، دانیشاند فەرمووی((ﷺ)) ئەی باوکی قوحافە و لەنێوان هەردوو دەستی خۆیدا..
بە هەموو نەرمییەك و سۆزێکەوە.. لەپاشاندا دەستی بە سینگیدا هێناو.. لەپاشاندا فەرمووی((ﷺ)): موسوڵمان بە.. بۆیە دڵی باوکی ئەبوبەکری خۆش و شادکرد و رووی پێ گەش بوو.. یەکسەر وتی: گەواهی وشایەدی دەدەم کە هیچ خودایە نییە بێجگە لە ئەڵلاّ لەپاشاندا تۆیش ئەی محمد پێغەمبەر((ﷺ))و بەندەی خودای..
ئەبوبەکر راچڵەکی لە خۆشیاداو دڵخۆش بوو.. لەخۆشیادا لەدونیا جێگەی نەدەبوویەوە..
پێغەمبەر((ﷺ))ووردبوویەوە لەرووی باوکی ئەبوو بکر.. ئەوا سەیر دەکات ریش و سەری یەکپارچە سپی بووە.
بۆیە فەرمووی((ﷺ)): ((غيروا هذا الشيب من راسه واجتنبوا السواد..)) .
واتە : ((ئەم رەنگە سپییە بگۆڕن.. بەلاّم دوور بن لە رەنگی رەش.)).
بەڵێ پێغەمبەر((ﷺ))چاودێری لایەن و باری دەروونی دەکرد لە هەڵسووکەوت کردنی..
بەڵکو کاتێك تەشریفی هاتە ناو شاری مەککە سەربازەکانی کردبووە چەند بەشێکەوە..
هەر ئالاّیەکی دابووە دەستی پاڵەوانێك لە پاڵەوانەکانی هاوەلاّنی.. ئالاّو بایەخێکی دایە دەست سەعدی کوڕی عووبادە رەزای خوای لێ بێ چونکە ئەمەش جێی ئەو پەڕی شانازیە بۆ سەعدو خزمانیش..
بۆیە سەعد وا سەیر دەکات و دەڕوانیتە خەڵکانی شاری مەککە.. ئەوە ئەو کەسانە بوون کە دژایەتی پێغەمبەریان((ﷺ)) لەشاری مەککەدا دەکرد..
هەموو رێگەیەکیان لە پێغەمبەر((ﷺ)) گرتبوو.. خەڵکانیان لەدژی هاندەدا.. هەر ئەوان بوون سوممەیەو یاسری دایك و باوکی عەمماریان شەهید کرد..
لەپاش ئەو هەموو ئەشکەنجەو ئازارەیان بۆیان.. هەر ئەوان بوون سزاو ئەشکەنجەی بیلال و خەبباب و کەسانی تریان دابوو..
بۆیە ئەم جۆرە کەسانە پێویستیان بەوە هەیە تۆڵەی کرداری خراپیان لێ وەرگیرێتەوە.. بۆیە سەعد ئالاّو بایەخەکەی راوەشاند وتی: اليوم يوم الملحمة اليوم تستحل الحرمة.

واتە: (( ئەمڕۆ رۆژی تۆڵەیە ئەمڕۆ حەڵاڵ دەبن حەرامەكان كاتێك قورەیشییەكان ئەمەیان گوێ لێ بوو زۆر لەسەر دڵیان گران بوو))..

دونیایان لێ تەسك بووەوە.. ترسان كە دواییان ببڕێت-واتە بن بڕبن- بە شەڕكردن لە گەڵ پێغەمبەر((ﷺ))..

بۆیە ئافرەتێكیان وەڵامی سەعدی دایەوە و هاتە خزمەت پێغەمبەرو((ﷺ)) .. سكاڵای خۆی لە لای پێغەمبەر ((ﷺ))كرد و وتی:

ئەی پێغەمبەری((ﷺ)) رێگەی راست..
بۆ لای تۆیە هیواو مەبەست...
هیچ پەنا دەر نییە بۆمە بەست ..
بێجگە لە تۆ و بە هیوا و ئاوات و مەبەست..
رێگەی فراوانمان لێ تەسك بووە مەبەست ..
خودای گەورە لە ئاسماندا جەنگی ئەوانی كرد مەبەست..
سەعد دەیەوێ كەسانی ئەم شیوەو دۆڵە ی مەبەست..
چونكە لە هۆزو خێڵی خەزرەجییە بۆیە ناتوانێ بێ مەبەست..
رق و كینەی خۆی بۆ ئێمەی لێ كردووە مەبەست..
دەسا ئێوە قەدەغە و رێگەی لێ بگرن بۆ مەبەست ..
چونكە ئەو شێرە دلێرە هەڵكەوتوو بۆ خوێن مەبەست..
ئەگەر بایەخەكانی تر وەك خۆی لێ بكات مەبەست..
هاوار بكات ئەی پارێزەرانی ئاڵاو بایەخ !ئێوەم مەبەست..
ئەو كات لەم نشیوو دۆڵە دەبێتە وێران بەمەبەست ..
تەنها دەكەوێتە لەپی ئەو ئافرەتە لێی دەبێت مەبەست..
ئەو سەعدە دلێرە و شێرە شیری دەرهێناوە بەمەبەست..
دەیەوێت ئەم خەڵكە بكوژێت بۆ ئەو بێتەجێی مەبەست..
گوێی نابیستێ بۆ ئێمە هیچ هیواو مەبەست ..
وەك ماری كەڕ وایە تێناگات لە هیچ مەبەست..

کاتێك پێغەمبەر ((ﷺ)) تەشریفی نامەو هۆنراوەی لەو ئافرەتەوە گوێ لێ دەبێت..
میهرەبانی و سۆزی دەکەوێتە دڵەوە بەرامبەریان..
بۆیە پێی خۆش بوو ئومێد و هیوای ئافرەت و قورەیشییەکانیش لە خۆی بێ ئومێد نەکات..
حەزی نەکرد سەعدیش لەخۆی زویر و تووڕە بکات لەدوای ئەوەی کە رێزی گەورەی لێنا..
بۆیە فەرمانی دا کە سەعد ئاڵاکە بداتە دەستی کوڕەکەی خۆی لەدوای ئەوەی کە رێزی گەورەی لێنابوو.. هەمان رێزیش لە کوڕەکەی نا..

بۆیە قەیسی کوڕی سەعد ئاڵاکەی بە دەستەوە بوو پێی چوونە ناو شاری مەککەوە.. باوکیش لەپەنای کوڕەکەیەوە بوو..
ئافرەتەکەشی رازی کرد و قورەیشیەکان دڵنیا کردەوە کاتێك کە بینیان ئاڵاکەی لەسەعد وەرگرتەوە و ئاڵاکەی بەدەستەوە نییە..

سەعدیش تووڕە نەبوو چونکە هەر خۆی بە رابەری مایەوە لەگەڵ ئەوەشدا لە قورسی و سەنگی و بارگرانی ئاڵاو بایەخەکەش رزگاری بوو و منداڵ و کوڕەکەی ئەم بارگرانیەی لەسەر سووك کرد..
ئای چەندە جوانە ئێمە چەند نێچیرێك بە یەك نێچیر بکەیت..
بۆیە هەوڵ بدە هیچ کەست لە دەست و لە کیس نەچێت..
خۆت بکە بە کەسێکی سەرکەوتوو هەموو خەڵکان بۆ خۆت رابکێشە کۆنترۆڵی سۆزو دڵیان بەلای خۆتدا رابکێشە یا هەموو مەبەستەکانیشیان جێبەجێ نەکەیت..

## رێکەوتن نامەیەك..

ئێمە هەڵسوکەوت لەگەڵ دڵانی خەڵکانی تردا دەکەین.. نەك لە لاشەکانیاندا..

| أشعرهم بانك تحبهم | Feel that you Like them |
|---|---|

## هەستیان بۆ ئەوە راکێشە کە تۆ خۆشیت بە خێرو خۆشیی ئەوان هەیە..

**هەرچەندە دڵت پڕ بە خۆشی و خۆشەویستی بێت بۆ خەڵکی ئامۆژگاری و دڵسۆزیت بۆ ئەوان هەبێت ئەوەندە راست و راستگۆ تر دەبیت لە لێهاتوویی و بەهرەکانتدا بۆ هەڵسوکەوت کردنت لەگەڵ ئەواندا..**

**ئەوەندەش خەڵك هەست دەکات و هەستی دەبزوێ کە تۆ ئەوانت خۆشدەوێ و خێری ئەوان بۆ تۆ دەبێ و پەسەند دەبیت و خۆشی تۆیان مەبەست دەبێت..**

**دکتۆرەیەکی خاوەن عیادە زۆر خۆشەویست دەبێ لەلای نەخۆشەکانی بەوەی کە لەگەڵ سکرتێرەکەی رێککەوتووە هەر نەخۆشێك هات بۆ لای ناوی بنووسێ زۆر بەخێرهاتنی دکتۆرەی پێ بگەیەنێ داوای مۆڵەتی ئەوەی لێ بکات کە چاوەڕوانی بکات و دکتۆرەیش پێی خۆشە چارەسەری ئەو بکات..**

**بەهەمان شێوە لەگەڵ سکرتێرەکەی رێککەوتووە کە فایلێکی بۆ درووست بکات ناونیشانی کەسایەتیی ئەوی تیادا بێت..و تەنانەت ناوی منداڵەکانی لە گەورەوە تا بچوکیان باس بکات..**

**بۆیە کاتێك نەخۆش دەچووە لای دکتۆرە بۆ پشکنین ئەویش زۆر بە گەرمی پرسیاری چۆنیەتیی منداڵەکانی لێ دەکرد لە بچوکەوە بۆ گەورە بەناوهێنانیشیانەوە..**

**بۆیە نەخۆشەکە زۆر دڵی خۆش دەبوو دەیوت ئەم دکتۆرە زۆر منی خۆش دەوێ و پرسیاری هەموو لایەنێك لە لایەنەکان باری ژیانی کەسێتی خۆمم لێ دەکات هەر لەبەرئەوە هەستی دەکرد ئەم دکتۆرە وەك دکتۆری خێزانی و خانەوادەیی خۆی بێت.بۆیە هەردەم بۆ هەر نەخۆشییەك خۆی دەگەیاندە لای هەمان دکتۆرە!!..**

**ئایا بۆت دەرکەوت چۆن توانی دڵەکان بەلای خۆیدا رابکێشێت؟**

ئەمەش هیچ تاوانێك نییە ئەگەر بەڕاشکاوی خۆشەویستیی خۆت بە خەڵکان رابگەیەنی..با ئەگەر باوك بێت یان دایك بێت یان خێزان یان منداڵەکانت بن. یان هاوەڵانی کارو سراوسێیەکانت بن..

هەستی خۆت مەشارەوە بەرامبەریان.. هەرکەسێکت خۆش دەوێ پێی بڵێ: خۆشم دەوێیت.. تۆ بەرێزی لەلای من لەسەر دڵی من.. با تەنانەت جاروبار سەرپێچیکاریش بێت پێی بڵێ: تۆ لەلای من لە زۆر کەس خۆشەویستتری.. ئەمەش راستە و هیچ درۆ تیادانیە ئەو خۆشەویسترە لە هەزارەها کەسی بێ باوەڕ بەو پێغەمبەر ((ﷺ)) .. ئایا وانییە؟..

بۆیە زیرەك بەو ئەم بەهرەیە لەدەست خۆت مەدە..

ئەوەم دێتەوە یاد کە چووم بۆ گەشتی عومرە لەکاتی "الطواف والسعی" دوعام کرد بۆ هەموو موسوڵمانان بەوەی کە خودا سەریان بخات و کاریان بۆ ئاسان بکات.. لەوانەیە وتبێتم خودایە لەخۆم و برادەرانم خۆش بیت..

لەپاشاندا سوپاسی خودام کرد کە کارەکانی بۆ ئاسان کردم..لە پاشتر چوومە ئوتێلێك بۆ ئەوەی تیایدا بخەوم.. لەکاتێکدا سەرم لەسەر سەرینەکە دانا بۆ ئەوەی خەوم لێ بکەوێت نامەیکم بە کورتە نامە نارد بۆ هەموو ئەو برادەرانەی کە ناویان لەسەر مۆبایلەکەم هەبوو.. ژمارەیان زۆر بوون.. تیایدا وتم: ئا ئێستا لە واجباتی عومرە تەواو بووم هاوەڵ و برادەرانی خۆمم لەبیر بووە تۆیش یەکێك بووی لە ئەوان تۆم لەبیر نەچوو بوو.. کە دوعات بۆ بکەم خودای گەورە بت پارێزێ و سەرکەوتووت بکات..

نامەکە کۆتایی پێ هات بە ئەوەندە دەربڕینە..

من لە گومانم دا نەبوو.. ئەوەندە کاریگەری و شوێنەوار لەناو دڵیاندا بەجێ بهێڵێ.. تیایاندا بەم شێوە وەڵامی منی دایەوە: سوێند بە خودای گەورە من چاوم بە گریان بوو کاتێك نامەکەتم خوێندەوە.. سوپاست دەکەم کەمنت لەبیر بووە لە پاڕانەوەکانتدا..

کەسێکی تر نووسی و وتی: سوێند بە خودای گەروە ئەی باوکی عەبدول رەحمان نازانم چۆن وەڵامت بدەمەوە! لەوەندە نەبێ بڵێم خودای گەورە پاداشتت بداتەوە.. سێیەمیان نووسی و وتی: داوا دەکەم خودای گەورە پاڕانەوەت لێ وەربگرێت.. سوێند بە خودای گەورە ئێمەش تۆ

لەیاد ناکەین..لەڕاستیدا ئێمە ناو بەناو پێویستمان بەوە هەیە کە بە بیری خەڵکی بهێنینەوە کە ئێمە ئەوانمان خۆش دەوێت.. زۆریی سەرقاڵی و بێ دەرفەت بوون لەم دونیایەدا

ئەوان لە بیری ئێمە ناباتەوە..

خراپیش نییە ئەگەر ئەم شێوازە بە کورتە نامەی مۆبایل بێت.. دەتوانیت بنووسیت بۆ برادەرەکان و خۆشەویستانت: بۆتان پاڕاومەتەوە لەنێوان بانگدان و قامەتکردندا.. یان لەکاتەکانی ڕۆژی جومعەدا..

ئەگەر نیازت خاوێن بێت ئەمە نابێتە هۆی لەبەرچاو و بیستنی خەڵکی بۆت.. بەڵکو دەبێتە هۆی ئەوەی کە زیاتر تۆ خۆشەویست بیت لەناو موسوڵماناندا.. موحازەرەیەکم دا لە خێوەتگایەکی هاوینیدا لە شاری ((الطائف)).. کە قوتابیان و خوێندکارانی زۆرجار لێ کۆدەبنەوە .. زۆربەی ئەو کەسانەی کە ئامادەی موحازەرەکە بوون.. لەو کەسانە بوون کە چاکەکاروچاکە خوازبوون.. بەڵام ئەو گەنجانەی تر کە بەم شێوە نەبوون ئامادەی موحازەرەکە نەبوون پەیوەست بوونیان بە ئایینەوەکاڵ وکرچ بوو. تەنانەت خۆیان سەرقاڵی یاری کردن خۆ لەسەرقاڵی دان کردبوو لە دەرەوەی تاوڵگاکەدا..

کاتێك موحازەرەکە تەواو بوو.. هەندێك گەنج هاتن بۆ تەوقەکردن لەگەڵم.. لەناویاندا گەنجێکیان تیادابوو پرچی بەشێوەیەکی نامۆ و پانتۆڵێکی کابۆی تەسکی لەبەردابوو.. ئەویش هات و تەوقەی کردو سوپاسی کردم.. منیش سەلامم لێ کرد زۆر بەگەرمیەوە.. سوپاسی ئەوەم کرد بۆ ئامادەبوونی دەستەکانم ڕاوەشاند و پێم وت: ڕووت لەڕووی بانگەوازی کار دەچێت.. ئەویش پێ کەنی و ڕۆیشت..

لەدوای دوو هەفتە تەلەفۆنێکم بۆ هات وتی: ها نام ناسیت.. ئەی شێخ من ئەو کەسەم کە پێت وتم ڕووت لەڕووی بانگەوازخواز دەچێت.. سوێند بەخوای گەورە دەبێت ببم بە بانگەوازیکار.. لەپاشاندا دەستی بەوە کرد کە هەستی خۆی دەربڕی بەوتنەکەم ڕووت وەك ڕووی بانگەواز کارە!..

ئایا نابینی چۆن خەڵکی کاریگەری و شوێنەوار لەسەر دڵیان دەمێنێ بەوەی تۆ وتەی ڕاستیان بۆ دەربڕیت.. خۆشەویستیان پێ ڕابگەنیت..!

بەرزی تەواوی و بەلام پێغەمبەری خودا((ﷺ))دڵەکان بەلای خۆیدا رادەکێشان بە جوانی و بەرزی تەواوی و گەورەیی رەوشتەکانی.. بە تواناو لێهاتوو بوو بۆ ئەوەی خۆشەویستی و رێزی راستی خۆی بۆ ئەوان دەربڕێت..

ئەبوبەکر و عومەر رەزای خوایان لێ بێت گەورەترین و بەرێزترین هاوەڵی پێغەمبەر((ﷺ)) بوون..

هەردەم لە پێشبڕکێی یەکتردابوون بۆ بەدەستهێنانی خێرو چاکەکردن.. هەردەم ئەبوبەکر لەپێش بوو.. ئەگەر عومەر زۆر زوو بهاتایە بۆ نوێژ وا سەیری دەکرد ئەبوبەکر پێش ئەو کەوتووە..

کاتێك خواردنی بە هەژارێك بدایە ئەبوبەکر پێشتر بەم کارەی هەستابوو.. ئەگەر شەونوێژی بکردایە.. ئەبوبەکر لەپێشیەوە بوو..

رۆژێك لە رۆژاندا پێغەمبەر ((ﷺ)) فەرمانی بە هاوەڵانی کرد کە خێر و چاکە بکەن بۆئەوەی ئەو کەلێنە و پێویستییەی ناو موسوڵمانان پڕ بکرێتەوە..ئا لەو کاتەدا عومەری کوڕی خەتتاب ((داراو))هەبوو بوو لە ماڵ و سامان.. بۆیە وتی ئەمڕۆ پێش ئەبوبەکر دەکەوم.. ئەگەر رۆژێك بێت پێش بکەوم تەنها ئەمڕۆیە.. بۆیە عومەر نیوەی ماڵەکەی هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەر((ﷺ)).

خستیە پێش پێغەمبەر((ﷺ))ئەبێت پێغەمبەر((ﷺ)) چ وشەیەکی بە عومەر فەرموو بێ کاتێك ماڵ و سامانەکەی بەخشی و خستە بەردەم پێغەمبە((ﷺ))ر؟ ئایا لە جۆرەکەی پرسیاری کرد زێڕە یان زیو؟

نەخێر.. بەڵکو کاتێك ئەو ماڵە زۆرەی عومەری دی کە بەخشی وشەیەکی فەرمووی((ﷺ)) کە عومەر لێی تێ بگات کە ئەو خۆشەویستە لەلای پێغەمبەر((ﷺ))فەرمووی بە عومەر ئەی چیت بۆماڵ و خێزان و منداڵەکانت بەجێ هێشتووە ئەی عومەر؟.. ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خودا((ﷺ)).. هەمان ئەوەندەم بۆ ئەوانیش هێشتووەتەوە.. عومەر دادەنیشێ لە خزمەت پێغەمبەردا((ﷺ)) بەخۆشیەکەوە.. چاوەڕوانی ئەبوو بەکر دەکات.. کاتێك ئەبوبەکر دێت بە ماڵ و سامانێکی زۆرەوە خستیە خزمەت پێغەمبەر((ﷺ)). عومەریش لە جێی خۆی راوەستاوە.. بەخشینەکان دەبینێ و گوێبیستی دایەلۆك و قسەو باسەکان دەبێ.. سەیر

دەکات پێغەمبەر((ﷺ)) پێش ئەوەی سەیری ئەو پێویستیانەی خۆیان بکات بۆ ماڵ و سامان.. پرسیار لە ئەبوبەکر دەکات: ئەی ئەبوبەکر چیت بۆ خێزان و ماڵ و منداڵت هێشتووەتەوە؟.. بەڵێ پێغەمبەر((ﷺ)) زۆر ئەبوبەکری خۆش دەویست.. تەنانەت کەس و کاری ئەبوبەکریشی خۆش دەویست لەبەر خاتری ئەبوبەکر.. حەزی بەوە نییە ئەوان زەرەرو زیان بەخۆیان بگەیەنن یان زیانیان پێ بگات..ئەبوو بەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خودا..خوداو پێغەمبەرم بۆ هێشتوونەتەوە..

بەڵام وەکو سەروەت و سامان هەرچیم هەبوو هێناومە.. نیوەیم نەهێناوە.. نە سێیەك و نە چواریەك بەڵکو هەموو ماڵ و سامانەکەم هێناوە..

بۆیە عومەر وتی تەواو.. هەرگیز پێش ئەبوبەکر ناکەومەوە بۆ چاکەکردن نە پێشبڕکێی ئەوم بۆ دەکرێت هەتا ماوم..

خەڵکی هەستیان دەکرد کە پێغەمبەر((ﷺ)) ئەوانی خۆش دەوێت بۆیە ئەوانیش پێغەمبەریان((ﷺ)) خۆش دەویست..

جارێك نوێژی بۆ کردن.. وەك ئەوەی پەلەی کردبێت لە نوێژەکەیداو کورتر لە نوێژی جاران.. کاتێك نوێژەکە تەواو بوو..

پێغەمبەر((ﷺ))هاوەڵانی خۆی دی سەریان سوڕماوە چۆن ئەم جارە نوێژەکەی کورت تر بوو.. بۆیە فەرمووی((ﷺ)): لەوانەیە ئێوە سەرتان سوڕمابێ لەوەی کە نوێژەکەم کورتتر کردەوە لە جاران؟!.ئەوانیش وتیان: بەڵێ!..

پێغەمبەر((ﷺ)) فەرمووی: من گوێم لە گریانی منداڵێك بوو بۆیە بەزەیی وسۆزم بە دایکدا هاتەوە!!.. نوێژەکەم کورت کردەوە..

ئایا نابینیت چۆن خەڵکانی تری خۆش دەویست..

ئەم خۆشەویستییەی بۆ دەردەبڕین لە کاتی هەڵسوکەوت کردنی لە گەڵیاندا.

## تۆ تەنها نیت لەم گەردوونەدا.....

لێهاتووییەکانی خۆت ئاشکرا بکە.. هەردەم راشکاو بە و بڵێ: من خۆشم دەوێیت.. دڵشادم بە پێ گەیشتنت.. تۆ زۆر بە بەهاو بەڕیز بۆ لای دڵی من..

| Keep nowise | أحفظ الأسماء |
|---|---|

## ناوەکان بزانە و لە بەریان بکە..

ئەمەش خۆی لەخۆیدا گرنگیدانە بە خەڵکی.. ئای چەندە جوانە کە چاوەڕوانی کەسێك بکەیت لە شوێن و کاتێکی ناچاوەڕوان کراودا.. وەك ئەوەی لەنزیك بەنکێك.. بازار.. لەناو فرۆکەیەك.. یان لە دەعوتکردنێکی گشتیدا.. تۆ پرسیاری ناوەکەی بکەیت لە پاشاندا لە جێگەیەکی تردا.. کە پێی بگەیت بەناوی خۆی بانگی بکەیت سلاّوی گەرمی لیّ بکەیت.. بیّ گومان بەم کارەت – لە دڵیدا جێگەی خۆت دەکەیتەوە–..

کە ناوەکان لەبەر بکەیت ئەمە رێزت بۆ زیاد دەکات..

جیاوازییەکی زۆری هەیە لەنێوان مامۆستایەك کەناوی قوتابیان بزانێت لەگەڵ مامۆستایەك کە ناوی قوتابیانی نەزانێت..

کاتێك بە قوتابیەکت دەڵێیت: هەستە ئەی فلاّن کەس.. چاکترە لەوەی کە بڵێی هەستە..ئەی قوتابی..

هەتا لە تەلەفۆندا.. کامیانت بەلاوە خۆشترە.. کە وەلاّمت بداتەوە بڵیّ:.. بەڵیّ.. یان ئەلوو یان بڵێت:– ئەی کاك فلاّن کەس و ناوت بهێنیّ بە گەرمی ئەحواڵت بپرسێت..

بیّ گومان گوێبیستی ناوی خۆت بیت لە دڵدا دەنگی خۆی دەداتەوە پێش ئەوەی گویّ وەلاّمی بداتەوە.وا باوە لەپاش موحازەرە گشتیەکاندا خەڵك قەرەباڵغی درووست دەکات بۆ ئەوەی کە خەڵکانز تەوقە لەگەڵ یەکتر بکەن.. منیش بەردەوام سوور بووم لەسەر وتنەوەی وشەی: ناوی تۆی بەرێز چیە؟

یاخود بەخێربێیت ئەم برایەم کێیە؟..
ئەمەم دووبارە دەکردەوە بۆ هەر کەسێك کە تەوقەم لەگەڵ بکردایە وەك گرنگی پێدان بێت بۆی. هەموویان زۆر بە خۆشحاڵییەوە وەڵامیان دەدایەوەو دەیانوت: برات فلان کەسە..

ئەوەم دێتەوە یاد رۆژێك لەدوای ئەوەی خەڵکێکی زۆر بەخێرهاتن و خودا حافیزییان لێ کردم و چوون.. کەسێکیان گەڕایەوە بۆ پرسیارکردن.. هەر کە هاتەوە بۆ لام منیش پێم وت: خودا بە خێرت بهێنێتەوە کاك خالید..بەم وتەیە زۆر دڵخۆش بوو وتی: ماشاءالله!! ناویشم دەزانیت!! خەڵکی بەگشتی خۆش و حەزیان بەوەیە کە بانگیان لێوە بکرێت بەناوی خۆیان..
ئەوەی کە ئاشکرایە فەرمانبەری عەسکەری تکتێك کە پێناسەی ئەوی تیادا لەسەر سنگیانە لە جێگەیەکی سەربازگەیی موحازەرەیەکمدا.. قەرەباڵغی درووست بوو لە هاتنیان بۆ بەخێرهاتنی من لەپاش موحازەرەکەدا..
کەسێکیان لێم نزیك دەبووەوە و دووبارە دوور دەکەوتەوە.. وەك ئەوەی بیەوێ بەخێرهاتن و سەلامم لێ بکات بەڵام لە بەر قەرەباڵغییەکە شەرمی دەکرد کە خەڵکانی تر نارەحەت بکات..منیش رووم وەرگێڕا و سەیری ناوەکەیم کرد..
دەستم بۆ درێژ کرد و وتم: بەخێربێیت فلان کەس!! یەکسەر رەنگی گۆڕاو سەری سوڕما..
ئەویش دەستی درێژ کرد بۆ تەوقەکردن و پێکەنی وتی: ها!! چۆن ناوی منت زانی؟منیش وتم: برام ئەو کەسانەی کە خۆشمان دەوێن ئەبێت ناویان بزانین.. ئەم کارە کاریگەری زۆری هەبوو لەسەری.. کەسانێکی زۆریش ئەمە دەزانن و ئاواتە خوازن کە زۆربەی ناوەکانیان بۆ لەبەر بکرایە..
بەڵام هۆکارەکانی لەبەرنەکردنی ناوەکان یان لەبیرچوونەوەی ناوەکان زۆرن..
لەوانە.. گرنگی نەدان بەو کەسانەی کە بەرامبەرییان لەگەڵ دەکەیت..
لەوانە.. سەرقاڵیبوون لە کاتی خۆناساندنەکەدا و وردنەبوونەوە لەکاتی گوێبیست بوونی ناوەکە..
لەوانە.. هەڵوێستی تۆ بۆ کەسی بەرامبەر بوو..
وەك ئەوەی گومانت وا بێت کە جارێکی تر بەرامبەری لەگەڵ ناکەیتەوە.. بۆیە لە دەروونی خۆیدا دەڵێت: هیچ پێویست ناکات ناوەکەی لەبەر بکەیت..
یان لەوانەیە مرۆڤێکی سادە بێت کەجێی گرنگی دانی تۆ نەبێت..

یان کاتێك ناوەکەی دەهێنێت تۆ بەباشی گوێت لە ناوەکە نەبووە پێشت شەرمە دووبارە داوای ناوەکەی لێ بکەیتەوە.. ئەمانە کۆمەڵە هۆکارێك بوون کە وا لە خەڵکی دەکات ناوەکان لەبەر نەکات..

بەڵام چارەسەری بۆ لەبەرکردنی ناوەکان.. چەند هۆکارو رێگەیەکی هەیە..لە وانە:

١. = قەناعەت بۆ خۆ دروست کردن بە گرنگی ئەو ناوە.
٢. = هەست بکەیت تۆ بە گوێبیستبوونت لە دوای چەند خولەکێکی تر پێویستت پێ دەبێ و پرسیاری لێ دەکەیت..
٣. = گرنگی و تەرکیز بکەیتە سەر رووی کابرا کاتێك گوێ بیستی قسەی دەبی و ناوەکەی خۆیت پێ دەڵێ..
٤. =هەوڵ بدە جوان و رێك و پێك بە وردی دیقەت بدەیتە کەسی بەرامبەر.
٥. = سروشتی قسەکانی بزانیت خەندە بە روویەوە بکەیت بۆئەوەی لەمێشك و هزرت جێی خۆی بکاتەوە کەواتە..
٦. = لەکاتی قسەکردنت لەگەڵی بۆ چەند جارێك بەناوی خۆیەوە بانگی لێوە بکە.. وەك ئەوە بڵێ راستەکەی کاك فلان کەس..؟ گوێم لێ بووە کاك فلان..؟ تۆ لەگەڵمی ئەی فلان کەس..؟ چەند جارێك دووبارە و سێ بارەی بکەرەوە..ئەمە زۆر گرنگە..

ئەگەر تۆ لە گەڵم بە وردی بیر بکەیتەوە ئەوا خودای گەورە زۆر جارێك ناوی پێغەمبەرەکان بەناوی خۆیانەوە بانگیان لێ دەکات..

ئەمەش بۆئەوەیە ئێمە فێری ئەوە بکات ناوەکان فێربین وەك ئەم شوێنانە ((یا ابراهیم اعرض عن هذا))

واتە: (( ئەی ابراهیم تۆ پشت لەم بەرەڤانی کردنەت بکە بۆ قەومی لووت.. فەرمانی خودایە ئەبێت لەناوبچن.((یا نوح انە لیس من اهلك))سورە هود..

واتە: (( ئەی نووح ئەوە لە کوڕی تۆ نییە کاتێك پاڕانەوەی کرد خودای گەورە کوڕەکەی رزگار بکات چونکە خودای گەورە لەوەوپێش سۆزی دابوو کە کەسانی ئەو رزگار بکات کەسانی ئەو مەبەست پێی موسوڵمانان بوو.. نەك مەبەست پێی منداڵەکانی بێت..

بە کورتی ..

هەستم ببزوێنە کە تۆ گرنگیم پێ دەدەیت بەوەی ناوەکەم لەبەر بکەیت.. بەو ناوەم بانگم بکەیت.. بۆ ئەوەی تۆم خۆش لە ێ.

| Becaeful and strict to become good behavior person | إنتبه وكن مدققا لحسن أخلاقهم |
|---|---|

## ئاگادار بە.. دیقەت و وردبینی تۆ تەنها بۆ لایەنی جوانی و چاکی و باشی بێت..

**هەندێك لە خەڵکی زۆر بەگەرمی و حەماسەوە تێبینی و دیقەت دەدات.. تەنانەت کاتێك نابێ بێ دەنگ بێ لە تێبینییەکانی و دەربڕینیشیان.. بەڵام لەدێر زەمانەوە وترا(( الشيء اذا زاد عن حده.. انقلب الى ضده.. ومن تعجل الشيء قبل اوانه.. عوقب بحرمانه.. واتە هەر شتێك لە سنووری شیاوی خۆی زیادەڕەوی بکات.. ئەوا دەگۆڕێت بۆ پێچەوانەی خۆی.. هەر شتێکیش پەلەی لێ بکرێت.. سزا دەدرێت بەوەی بێ بەش دەبێ پێی..**

**دەسا بۆیە هەردەم تۆ تێبینی شتە جوان و دڵ خۆشکارەکانی بخەروو.. ئەوەی کە دڵی خەڵکی پێ خۆش دەبێ کاتێك دەبینێ.. چاوەڕوانی پیا هەڵدان بکات.. هەڵ دەپەڕێ بۆ گوێبیستنی لە باس لە سەرسام بوونی بەرامبەر بکات بۆی بەڵام شتەکانی تر کە خەڵك شەرمی بە بینینی بێت.. یان شەرم بکات لەوەی دیقەت و تێبینی خۆی بکات ئەمە پێویستە تۆ خۆی لە ئاستی بە کوێر بزانیت..**

**بۆ نموونە: کاتێك دەچیتە ماڵی برادەرێکەوە وا دەبینی کورسییەکان کۆنن ئاگامان لە وەبێ خۆت نەکەیت بە کەسێك لەو کەسانە کە زۆر بارگران بکات دەست بکەیت بە تێبینی دەربڕین لە کاتێکا هیچ داوای ئەوەی لێنەکردوویت تێبینی خۆتیان بۆ دەربڕیت..ئاگات لەوە بێت زمانت زیادە ڕەوی نەکات ئەوە بڵێیت: بۆچی کورسییەکان ناگۆڕیت؟**

گلۆپەکان ناو سوورییاکان نیوە یان لە ئیش کەوتوون..!! رۆنی چەورکردنی دەرگاکان کۆنەو.. بۆچی چەوری ناکەیتەوە بە رەنگی تازەتر و نوێتر!!..بەرام کەس داوای پێشنیاری لێ نەکردوویت.. نە تۆش ئەندازیاری دیکۆری و کابرا رێکەوتبێ کە سوود لە بۆچوونەکانت وەربگرێت.. بەبێ دەنگی بمێنەرەوە.. لەوانەیە نەتوانێ بیگۆڕێ.. لەوانەیە کارەساتێك بێ

پارەیی لێ بەسەرهاتبێ.. لەوانەیە..و.. هیچ شتێك لەوە قورس و گرانتر نییە لەسەر خەڵکی کە تۆ بیانخەیتە ئەمری واقیعەوە بەوەی تۆ سەرنج بدەیت لەوەی ئەوان شەرم دەکەن کەتۆ سەرنجی بۆ بدەیت.. لەپاشاندا تۆ باسی لێوە بکەیت دەست رەخنە گرتنەکانی خۆت بکەیت..بەهەمان شێوە وەك ئەمەیە.. ئەگەر جل و پۆشاکی لەبەری کۆن بوو.. یان فێنککەرەوەی ماشێنەکەی شکاو بوو.. تەنها خێر بڵێ یان هەر بێ دەنگ بە..
چیرۆکێك دەگێڕنەوە کابرایەك بە میوانی دەچێتە ماڵی برادەرەکی خاوەن ماڵیش هەندێك نانو زەیت دەخاتە پێش میوانەکەی بەڵام میوانەکەی دەڵێت: خۆزگە زەعتەریشی(جۆرە خواردنێکی تایبەتییە) لە گەڵ بووایە.. کابرای خاوەن ماڵ بە خێزانەکەی دەڵێت: زەعتەرمان هەیە؟ ئەویش ئەڵێت: نەخێر..
کابرا خاوەن ماڵ دەچێتە دەرەوە بەڵام مەسینەیەکی مسی دەبێت دەیکات بە رەهن هەتا پارەی زەعتەرەکە بۆ کابرای دوکاندار دەهێنێتەوە.. لە پاشاندا پێشکەش بە کابرای میوانی دەکات.. ئەویش دەست بە خواردنی دەکات.. کاتێك تێر دەبێ کابرای میوان دەڵێت سوپاس بۆ ئەو خودایەی کەرۆزی داین لە خواردن و خواردنەوە و قەناعەتی پێ هێناین بەوەی کە رازی بن بە بەشی خودا بۆمان.. کابرای خاوەن ماڵ دەڵێت: ئەگەر رازی بوویتایە بە بەشی خودا من مەسینە مسەکەم بە رەهن نەدەچوو بۆ پەیدا کردنی زەعتەر بۆ تۆ!!..
بە هەمان شێوە کابرایەك دەچێتە سەردانی نەخۆشێك لەوێ واسەیر دەکات کابرا رەنگی زەرد هەڵگەڕاوە هەندێك لەلای دادەنیشێ و پرسیاری نەخۆشییەکەی لێ دەکات؟.. نەخۆشەکەش دەڵێت فلان نەخۆشییە.. نەخۆشییەکی ترسناکی بۆ باس دەکات..کابرای هاتوو بۆ لای نەخۆش: ئا ئا ئەم نەخۆشییە تووشی فلان کەسی برادەرم بووە پێی مرد..
کابرایەکی تری هەڤاڵم تووشی ئەم نەخۆشییە بوو تووشی شەلەلی کرد هەتا وەفاتی پێکرد.. تووشی فلان کەسی دراوسێی ماڵی مێردی خوشکم بوو.. هەتا نەیکوشت وازی لێ نەهێنا..نەخۆشەکەش خەریکە پیایدا دەتەقێتەوە..

کابرای سەردانیکاربۆ لای نەخۆش هەڵ دەستێ بڕوات بە نەخۆشەکە دەڵێت:- ها.. هیچ شتێکت نییە پێم بڵێیت وبۆت بەجێبهێنم..؟نەخۆشەکە دەڵێت: بەڵێ.. ئەگەر لێرە دەرچووی مەگەڕێوە بۆ لام.... ئەگەر سەردانی نەخۆشت کرد باسی مردووەکانی لە لا مەکە.ئامۆژگاری: کاتێك دەچێتە لای نەخۆشێك. وا سەیر دەکەیت رووی زەرد هەڵگەڕاوە... هەر چاوی

قووڵ بوو.. پێستی وشك بووەتەوە.. نەڵێیت ئاخ..ئۆف.. بۆیە سەرم سوڕ دەمێنێ ئایا تۆ پزیشکی؟ خێر بڵێ یان بێ دەنگ بە.

دەڵێن: ئافرەتێکی پیرەژن نەخۆش دەبێ.. لە دەستە خوشکێکی دەیەوێت بچێت بۆ لای.. هەندێك منداڵی دەبێت داوایان لێ دەکات کە بیگەیەننە لای نەخۆشەکەی دەستە خوشکی.. بەڵام ئەوان هەریەکە و پاساوێك دەهێننەوە بۆ دەرفەت نەبوونیان.. هەتا منداڵێکیانی رازی دەبێ.. ئەویش بە ماشێنەکەی خۆی دەیبات بۆ لای نەخۆشەکە..

کاتێك دەگەنە ماڵی پیرەژنە نەخۆشەکە.. کوڕەکەی چاوەڕوانیەتی لەناو سەیارەکەدا..

دایکەکە دەچێتە لای پیرەژنە نەخۆشەکە وا سەیر دەکات نەخۆشی تەنگی پێ هەڵ چنیوە ئەویش سەلامی لێکرد و دوعاو پاڕانەوەی بۆ کرد، کاتێك هەستا بچێتەوە دەرێ تێپەڕ دەبێت بەلای هەندێك کچی نەخۆشەکەدا ئەوانیش وا دەگرین بۆ دایکیان..

ئەویش بە هەموو هۆشێکی خۆیەوە وتی: من لێرە بەدواوە پێم ناکرێت بێم بۆ سەردانتان.. ئەوە دایکتان زۆر نەخۆشە وا هەست دەکەم ئەو دەمرێت..

خودا خێری ئێوە بنووسێت لە ئێستاوە..!!

ئەی هۆشمەند.. ئاگاداری ورد بینی و دەربڕینت بە... با تەنها بۆ شتە دڵخۆش کارەکان بێت..نەك تێبینی و دیقەت و دەربڕینت بۆ شتێك بێت کە دڵی خەڵکی نیگەران و کەسار و ناخۆش بکات..

## گرفتێك..

ئەگەر چارت ناچار بوو بۆئەوەی تێبینی بکەیت و وردبیتەوە لە شتێکی خراپ.. وەك ئەوەی پۆشاکەکەی کەسی بەرامبەر پیسی پێوە بوو.. یان بۆنێکی ناخۆشی لێوە دەهات.. بەرێکو پێکی و جوانی ئاگاداری بکەوە.. نەرم بە و زیرەك بە

چاودێریی لایەنی دەروونی بکە بە وەی دەروونی بریندار نەکەیت گرفتەکەش چارەسەر بکەیت....






| لا تتدخل فيما ما يعنيك | Own youp basins |
|---|---|

## خۆت هەڵمەقورتێنە لە هیچ شتێك کە پەیوەندیی بە تۆوە نەبێت..

پێغەمبەر((ﷺ))دەفەرموێت:((من حسن اسلام المرء تركه مالا يعنيه..))

واتە: ((لە جوانیی موسوڵمانبوونی مرۆڤە کە خۆی هەڵنەقورتێنێتە هیچ شتێك کە پەیوەندیی بە ئەوەوە نەبێت..)).

چەند جوانە ئەم وشەیە تۆ گوێت لێ بێ لە دەم و زمانێکی پاك و خاوێن بێتە دەرێ.. دەم و زمانی پێغەمبەر ((ﷺ))بەڵێ راستە واز لە هەر شتێك بهێنیٚ کە پەیوەندی بە ئەوەوە نەبێت.. ئای چەندە رەزاگرانن ئەو کەسانەی کە ئیزعاجت دەکەن بەوەی خۆیان هەڵئەقورتێنن لەو کاروبارەی کە پەیوەندی بە ئەوانەوە نەبێت.. سەرقاڵت دەکات کاتێك کاتژمێرەکەت دەبینیٚ.. بە چەندت کڕیوە..

تۆش دەڵێی: بە دیاری بۆم هاتووە..

دەڵێیت: !! لەکێ وە؟

وەڵام دەدەیتەوە: لەبرادەرێکمەوە..

دەڵێت: برادەرەکەت لە زانکۆوە یان لە گەڕەکەکەتان.. ئەی لەکێ وە؟!

تۆیش دەڵێیت.. ئاخ ئاخ برادەرێکم لە زانکۆ و تەواو..
کابراش دەڵێت: باشە.. بەڵام بە بۆنەی چییەوە؟! تۆیش دەڵێت ئاخ.. واتا بە بۆنەی رۆژانی زانکۆوە..دەڵێت: بە بۆنەی چییەوە؟!! هۆی چی بوو؟!! یان تۆ لە گەشتێك بوویت.. یان هەر شتێکی تر..ئا ئا..

هەر بەردەوام دەبێت لە پرسیارکردن بۆ پرسیارکردن لەسەر شتێکی بێ بەها..!!
سوێندت دەدەم بەخودای گەورە ئایا دەروونت داوای ئەوەت لێ ناکات کە هاوارت لێ بەرز ببێتەوە:

نەخێر ئا ئاخ خۆت هەڵمەقورتێنە!!.. لەوانەیە بۆ خراپتر بڕوات ئەگەر لەناو کۆڕێکی خەڵکانی زۆردا بێت ئەم پرسیارانەی لەتۆ ببێتە هۆی ئەوەی شەرمەزارت بکات..
ﻟﻪ شوێنێك دانیشتبووین لەگەڵ هەندێك برادەردا.. زەنگی مۆبایلی کەسێکمان لێی دا.. کە نزیك من دانیشتبوو وەڵامی دایەوە و وتی:
بەڵێ؟..خێزانەکەی پێی وت ئەوە تۆ لە کوێیت هەی گوێ درێژ؟! دەنگی ئافرەتەکە بەرزبوو هەتا من گوێم لە کێشەوگرفتەکەیان بوو.ئەویش وتی من باشم خودای گەورە تۆش بپارێزێ!!!
وا دیار بوو کە لەوەوپێش سۆزی ئەوەی پێ دابوو کە لە دوای مەغریب بچنە جێگایەك ئەویش بەهۆی ئێمەوە سەرقاڵ بووبێت..

خێزانەکەی تووڕەبوو: خودا تۆ نەپارێزێ.. تۆ خۆشحاڵی لەگەڵ برادەرەکانت منیش چاوەڕوانم سوێند بەخودا تۆ وەك گامێش وایت پیاوەکەی وتی: خودا لێت رازی بێت.. لە دوای بانگی عیشا دێمەوە..هەستم کرد قسەی پیاوەکە لەگەڵ قسەی خێزانەکەی یەکی نەدەگرت..

بۆیە دەرکەوت ئەم شتە دەکات بۆئەوەی خۆی شەرمەزار نەکات.. قسەکردنی تەلەفۆنەکەیان تەواو بوو.. منیش ئاوڕم دەدایەوە بۆ لای کەسانی ئامادەبووان بەداڵغەم دا هات کە کەسێکیان پرسیاری لێدەکەن؟ کێ قسەی لەگەڵ کردیت؟ چی دەویست لێت؟ ئەی بۆچی رەنگت گۆڕا لەدوای قسەکردنەکە؟!! بەڵام خودای گەورە رەحمی پێ کرد کە هیچ کەسێك خۆی هەڵ نە قورتاند..

هەروەك ئەوەیە سەردانی نەخۆشێکت کرد.. پرسیاری نەخۆشییەکەیت لێ کرد.. ئەویش بە گشتی وەڵامی دایتەوە! سوپاس بۆ خودا.. شتێکی ئاسانە.. نەخۆشیەکی بچووك و تەواو.. یان هەر وشەیەکی تر لەو بارەیەوە یان بێجگە لەم وشەو دەربڕینانە کە هیچ وەڵامێکی

راشکاوانە نادات بەدەستەوە.. ئەو کات تۆیش شەرمەزاری مەکە بە لێکۆڵینەوەو وردەکاری کردن لەگەڵی! ببورە.. واتە نەخۆشییەکەت چیە؟ زیاتر روونی کەرەوە..!! مەبەستت چییە..!! بێجگە لەم جۆرە پرسیارانەش..جێی سەر سوڕمانە چ پێویست دەکات لەوە زیاتر شەرمەزاری بکەیت..؟لە جوانیی ئیسلامبوونی مرۆڤەکە وازبهێنێ لە وەی کە پەیوەندی بە ئەوەوە نەبێت.. واتە.. تۆ چاوەڕوانی ئەوە دەکەیت پێت بڵێت من تووشی نەخۆشی "بواسیر"-مایسیری- بووم.. یان تووشی هەر نەخۆشییەکی تر بە جۆرێك لە برینەکان لە ..یان..

مادەم وەڵامدانەوەکەی بە گشتی بوو هیچ پێویست ناکات لەسەری درێژی بکەیتەوە لە گەڵی.. مەبەستم ئەوە نیە پرسیار لە حاڵی نەخۆشییەکەی نەکەیت؟ بەڵکو وردەکاری نەبێت لە پرسیارەکانی تۆدا..بەهەمان شێوە کەسێك بانگی قوتابییەك دەکات لەناو ئەو هەموو قوتابیانەدا و لە جێگەیەکی گشتیدا.. پرسیاری لێ دەکات بە دەنگێکی بەرزەوە: ها ئەحمەد.. سەرکەوتوو بوویت؟.. دەڵێت بەڵێ.. لێی دەپرسی پلەکانت چەند بوو؟ چەندەم ناوبووی؟ ئەگەر راست بکات بە گرنگیپێدانی بە تەنهایی لێی دەپرسێت.. لە پاشاندا ئەو کات هیچ پێویستی بەوە نەدەکرد بە ئەم وردەکاریە لێی.. لەسەدا چەند بوو.. ئەی بۆچی لەوەپێش لێی نەپرسی..

بۆچی وەرنەگیرای لە زانکۆ.. ئەگەر تۆ ئامادەبووایە بۆ یارمەتیدانی کەمێك لەگەڵی دەوەستا و قسە بە تاك و تەنهایی هەردووکیان قسەو باسی لەگەڵ دەکرد.. بەڵام بۆ بڵاوکردنەوەی شەرمەزاری لەناو خەڵکیدا یە..

نەخێر پێغەمبەر((ﷺ))فەرمووی "لە جوانی ئیسلامبوونی مرۆڤە کەواز لە هەر شتێك بهێنی پەیوەندی بە ئەوەوە نەبێت.."بەڵام ئاگاداربە!! ئەم قسەو باسەمان زیاد لە سنووری قەبارەی خۆی پێ مەدە.. پێش ماوەیەك پێش ئێستا بەکاروانی چووم بۆ شاری مەدینە. سەرقاڵی هەندێك موحازەرات بووم.. رێکەوتم لەگەڵ گەنجێکی چاکدا کە هەردوو کوڕم عەبدول رەحمان و ئیبراهیم ببات بۆ جێگەی قورئان لەبەرکردنەکەیان یان جێگەی بەرێبردنی کاتی هاوین.. لە دوای بانگی عیشا بیان هێنێتەوە بۆ لای خۆم.. عەبدول رەحمانی کوڕم لە تەمەنی دە ساڵیدایە..

لەوە ترسام کە ئەو گەنجە وەك ئەوەی زیادە حەزێك بێت بۆ زانین.. کە هیچ پێویست نەبێت.. وەك ئەوەی لێی بپرسێت.. ناوی دایکت چییە؟ چەند برات هەیە؟

**ماڵتان لە کوێیە چەندت پارە پێ دەدات لە ڕۆژانەی خۆتدا؟..بۆیە عەبدول ڕەحمانم ئاگادار کردەوە ئەگەر هەر پرسیارێکی لێکردی کە گونجاونەبوو پێی بڵێ پێغەمبەر((ﷺ)) فەرموویەتی "لە جوانیی ئیسلامبوونی مرۆڤە کە خۆی هەڵ نەقورتێنێ لە هیچ شتێك کە پەیوەندیی بە ئەوەوە نەبێت))..**

**عەبدولڕەحمان و براکەی سواری سەیارەکە بوون لەگەڵ ئەو گەنجەی کە ئامادەم کرد بوو بۆ ئەم کارە..**

**عەبدول ڕەحمان لە ئامادە باشیدا بوو..**

**گەنجەکە وەك دڵ نەوایی کردنەوە بە عەبدول ڕەحمانی وت: خودا بە خێرت بهێنێ.. عەبدول ڕەحمان زۆر بە دڵنیاییەکەوە وەڵامی دایەوە خودا تۆیش بەخێر بهێنێ..**

**گەنجەکە دەیەوێ جەوەکە(بارودۆخەکە) بۆ خۆی خۆش بکات..**

**وتی باوکت ئەمڕۆ موحازەرەی هەیە؟!**

**عەبدولڕەحمان هەوڵی دا فەرموودەکە بهێنێتەوە یادی خۆی بەڵام بۆی نەهات بۆیە وتی:**

**(( خۆت هەڵ مەقورتێنە لە ئیشێك کە پەیوەندیی بە تۆوە نەبێ!!))..**

**گەنجەکە وتی: نا هیچ مەبەستێکم نەبوو.. تەنها ئەوە نەبێت کە ئامادەی موحازەرەکەی بم و سوود وەرگرم..عەبدولڕەحمان گومانی وابوو کە گەنجەکە ئەیەوێت قسەی پێ دەربهێنێ: بۆیە هەمان قسەی خۆی دووبارە کردەوە خۆت هەڵ مەقورتێنە لە شتێك کە پەیوەندی بە تۆوە نەبێت..**

**گەنجەکە دەیوت: ببورە عەبدول ڕەحمان مەبەستم..**

**عەبدول ڕەحمانی منداڵیش هەر دەیوت :(( نا نا نا خۆت هەڵ مەقورتێنە لەوەی کە پەیوەندی بە تۆوە نییە!!)).**

**ئا بەم شێوەیە بوو هەتا گەڕانەوە..!!**

**ئەم هەواڵەی پێ دام عەبدول ڕەحمان وەك شانازی بەخۆیەوە بکات..**

**منیش لەگەڵی پێ دەکەنیم بۆ جارێکیتر فەرموودەکەم تێ گەیاندەوە..**

## وەرشەی کارکردن..

هەوڵدان لە گەڵ دەروونی خۆتدا لە سەر ئەوەی رزگار بێت کە خۆت هەڵقورتێنی لە کاروباری خەڵکانی تر..

لە سەرەتاوە زەحمەتە.. بەڵام لە دواییەوە دەر ئەنجامدا ئاسانەو مرۆڤ لە سەری رادێت..

## چۆن هەڵسوکەوت دەکەیت لە گەڵ ئەو کەسانەی کە خۆ یان هەڵدەقورتێننە کارو بارت؟..

جاری وا دەبێت برادەرێك لە برادەرانت موبایلەکەت وەردەگرێت سەیر دەکات کەبۆت هاتووە.. برادەرێکم دەعوات کرابوو.. لە ماڵی قازی یەکدا.. هەر کەس لەو ماڵە بوو پیاو ماقووڵ بوو ..ناو دار بوو لە روویەکەوە..

برادەرەکەیشم لەگەڵیان دانیشت و قسەی لەگەڵ گۆڕینەوە.. ئامێری مۆبلایلەکەی قورس بوو.. بۆیە لە گیرفانی دەری هێنا و خستییە سەر مێزەکەی لە پەنای خۆیدا..

کابرایەکی ماقووڵیش کە لە پاڵیدا بوو قسەی لەگەڵ دەکرد دەستی بە مۆبایلەکەیەوە گرت سەیری کرد.. کاتێك سەیری کرد رووی گۆڕاو.. لەجێی خۆی داینەوە..

کابرای برادەرم پێکەنینێکی خۆی خواردەوەو شاردییەوە کاتێك هاتینە دەرێ من ئەو برادەرەم بەیەکەوە سواری یەك سەیارە بووین.. کە ئامێرەکەی لەپاڵی خۆی دانا.. منیش ئامێرەکەم هەڵگرت وەك چۆن کابرا ماقووڵەکە ئامێرەکەی هەڵگرت کاتێك روانیم بۆ شاشەکەی دەستم کرد بە پێکەنین.. بەڵکو زۆر پێکەنیم.. دەزانی بۆچی؟..چونکە لە نەریتی خەڵکانی موسوڵمان دەنووسن یادی خودا بکە.. یان هەر شتێك لەو بابەتەوە بەڵام ئەو برادەرەم نووسیبووی ئامێرەکە بگێڕەوە بۆ جێگەی خۆی ئەی کەسی خۆ هەڵقورتێنەرا..

زۆرن ئەو کەسانەی کە خۆیان هەڵ دەقورتێنن لە کاروباری خەڵکانی تردا.. زۆر بەلایەوە سروشتییە کاتێك سوار دەبیٚ لەگەڵت بۆ سەیارەکەت دەرگای چەکمەچەکە بکاتەوە بزانێت چی تیایە..!!ئافرەتێك بەلاییەو ئاساییە کە جانتای دەست ئافرەتێکی تری هاوەڵی بکاتەوە سەیری شتەکانی ناوەوەی بکات.. جاری واش دەبیٚ کابرا لێت دەپرسیٚ لە کویٚ بووی؟ تۆیش دەڵێی: تۆزێك لە ماڵ دەرچووم، ئەویش دووبارە دەڵێت: لە کویٚ..؟ کێت لەگەڵ بوو؟ ر کەسانێکی زۆر هەن کە تێکەڵیان دەبین ئەمەیە هەڵسوکوتیان و بەم شێوەیەن لە گەڵمان..

ئەی ئێمە چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەوان بکەین؟

گرنگترین شت ئەوەیە تۆ لەخۆتی زویر نەکەیت..هەوڵی ئەوە بدە کە تووشی کێشەو پێشە نەبیتەوە لەگەڵی..هەوڵی ئەوە بدە کەست لیٚ زویر نەبێت.. زیرەك بە لەخۆ دەرباز کردنت لەم جۆرە هەڵوێستانەدا.. بەبیٚ ئەوەی هیچ شتێك لەنێوان تۆو برادەرەکانتا روو بدات.. ئاسانکاری لەوە مەکە کە خەڵکی بە دوژمنی خۆت بکەیت یان هاوەڵانت لەدەست بچن.. بە هەر هۆیەکەوە بێت.

لە چاکترین شێوازی هەڵسوکەوت کردنە لەگەڵ ئەو کەسانە کە خۆیان هەڵ ئەقورتێنن لە ئیش و کارتا وەڵام دانەوەی پرسیارەکەی بە پرسیار بکە.. یان باسەکە بگۆڕە بۆ ئەوەی پرسیاری یەکەمی لە بیر بچێتەوە.. ئەگەر پرسیاری لێکردی مانگانە چەند وەردەگریت؟

تۆیش پێی بڵیٚ: ((بەلاٚم بە خەندەو پێکەنینەوە ))بۆ ئایا فەرمانبەرییەکی باشترت بۆ دۆزیومەتەوە؟..ئەویش دەڵێت: نەخێر.. بەلاٚم دەمەویٚ بزانم..

بڵیٚ: مووچەخۆری لەم رۆژگارەدا بووەتە کێشەو پێشە. وا دیارە بەهۆی گرانبوونی نرخەکانی نەوت!!ئەویش دەڵێت: تۆچیت بەسەریەوەیە؟ تۆش بڵیٚ: نەوت کۆنترۆڵی بازاری لە دەستدایە...

ئایا هەست ناکەیت جەنگەکان لەپێناو پترۆڵدا بەرپا دەبنن..؟ ئەویش دەڵێت : ئەمە راستنیە.. جەنگەکان هۆکاری تری خۆیان هەیە..

جیهانی ئەمڕۆمان هەموو پڕ لە جەنگە.. وە..پرسیاری یەکەمی لەبیر چوویەوە..

(ها چۆنە بۆچوونت؟ ئایا خۆت دەربازنەکرد بەزیرەکانە لە هەڵوێستەکەدا؟..

بەهەمان شێوە ئەگەر پرسیاری کاروانی کردنەکەی لیٚ کردی..تۆیش پرسیاری لێبکەرەوە: بۆچی؟ تۆ هاوەڵیم دەکەیت؟..دەڵێت نەخێر: نازانم "بەلاٚم پێم بڵیٚ.. تۆیش بڵیٚ: ئەگەر کاروانیت لەگەڵ کردم.. ئەوە کرێی رێگە لەسەر تۆیە..ئەوکات دەچێتە باسی کریٚ و کرێگرانی

**باسی یەکەمی لەبیر دەچێتەوە.. ئا بەم شێوەیە ئێمە دەتوانین دەرباز بین لەم جۆرە هەڵوێستانە بەبێ ئەوەی هیچ کێشەو بێشەیەك رووبدات لە نێوان ئێمەو خەڵکانی تردا..**

هەڵوێستێك..

ئەگەر تووش بووی بە کەسێك خۆی لێ هەڵتەقورتاندی... تۆ لە ئەو باشتر و چاکتر بە... بە رێکو پێکی خۆت دەرباز بکە بەبێ ئەوەی هەستی بریندار بکەیت....

| Do not f0llow critics K | لاتکن نقادا |
|---|---|

## رەخنەگر مەبە..!!

**کابرایەك لەگەڵ برادەرێکی خۆی سواری سەیارەی برادەرەکەی بوو.. بە قسە وتی: ئای چەندە کۆنە ئەم سەیارەیە!! کاتێك چووە ماڵیان.. شت ومەکی ناوماڵی دی وتی: ئۆووە..!! چەندە لەمێژە ئەم شت ومەکانەت نەگۆڕیوە؟! کاتێك منداڵەکانی بینی وتی: ماشاءالله جوانن..**
**بەڵام جلی جوانیان لەبەر دانیە!!کاتێك خێزانی برادەرەکەی خواردنی بۆ هێنا.. ((پێشکەش کرد..)) ئەو ماوە زۆرەی لە مەتبەخدا وەستاوە بۆ دروستکردنی خواردن بۆ ئەو کابرایە..**
**کاتێك ئەو جۆرەها خواردنە خرایە بەردەستی وتی: یا ئەڵلا بۆچی برنجت لێناوە؟ ئۆووف.. خوێی کەمە!من حەزم لەم جۆرە خواردنە نەبوو!!چووە ناو دووکانی میوە فرۆشێك ..**
**وا سەیر دەکات دووکانەکە هەموو جۆرە میوەیەکی تیادایە.**
**وتی:: مانجۆت هەیە؟**
**دوکاندار: نەخێر .. رەخنەی پووچ:ئەمەت نیە لە هاویندا..؟**
**وتی: کاڵەکت هەیە؟ دووکاندار: نەخێر. کابرا تووڕە بوو و رەنگی گۆڕا وتی: هیچت نییە.. ئەی بۆچی دووکان دەکەیتەوە! لە دووکان دەرچوو..**
**ئەوەی لەبیر چوو لە دووکانەکەدا زیاتر لە دەیەها جۆر میوەی تیادایە..**
**بەڵێ.. هەندێك لە خەڵکی بەس ئیزعاجت دەکەن بە ئەو هەموو رەخنەگرتنانەی..**

بەهیچ شێوەیەك دانانێت بە جوانی و رێكو پێكیدا.. لەو خواردنە بەتام و چێژانە هیچ نابینێت تەنها ئەوەندە نەبێت لەوەی كە موویەك كەوتووە ناو خواردنەكەوە.. لەو كراسە جوان و خاوێنە تەنها جێی نوكی حیبرەكە دەبینێ كەیەك تۆز شوێنەوارێكی كەمی بەجێ هێشتووە..

لە پەڕتووكێكی بەسووددا تەنها هەڵەی چاپەمەنی لێ دەخوێنێتەوە، كە روویداوە..

هیچ كەس لەدەستی دەرناچێت بۆ رەخنەگرتن.. هەردەم وا خەریكی تێبینییەكان و دەربڕینی ئامۆژگاری یەكانیەتی.. وردەكاری دەكات لەسەرگەورە و بچووك..

كابرایەك دەناسم زۆر برادەرایەتی و هاوەڵییم كردووە لە رۆژانی زانكۆدا و رۆژانی تری ناوەندی و دواناوەندیدا.. هەتا ئێستا دۆستایەتی و برادەرایەتیی ئێمە بەردەوامە.. بەڵام هەرگیز نەم بینیوە مەدح و سەنای هیچ شتێك بكات..

پرسیاری پەڕتووكێكی خۆمم لێكرد كە خەڵكی زۆر باسیان لێوەكرد هەزارەهای لێ چاپ كراوە ئەویش بەهەموو ساردیەكەوە: دەڵێت وەڵلاهی باشە.. بەڵام فلان چیرۆكی تیادایە گونجاو نیە.. قەبارە فۆنتەكەم بە دڵ نییە.. جۆری چاپەكەی باش نییە..و..

رۆژێك پرسیاری وتار خوێنێكی سەركەوتووم لێكرد.. هەر باسی لایەنی چاكەی تیادا نەكرد.. هەتا ئەوەندەی وت زۆر لەسەر دڵم گران بوو وەك ئەوەی چیایەك لەسەرشان و سەرم بێت.. بۆیە لەو كاتەوە هەرگیز پرسیاری هیچ شتێكی لێ ناكەم بۆ ئەوەی بۆچوونی خۆیم پێ بڵێت.. چونكە پێشوەخت دەزانم بۆچوونی چییە.. بەهەمان شێوە بڵێ بۆ ئەو كەسانەی كە دەیانەوێ خەڵكی هەردەم لەنموونەیدا بن..

دەیەوێت خێزانەكەی لەماڵدا ٢٤ سەعات ١٠٠٪ لە خاوێنی و ئامادە باشیدا بێت..

دەیەوێت منداڵەكانی هەردەم بە خاوێنی بمێننەوە و رێكو پێك بن لەسەرتاسەری رۆژدا ئەگەر میوانێك سەردانی كرد دەیەوێت چاكترین خواردن ئامادە بكرێت..ئەگەر دانیشت قسەی لەگەڵ كرد بە جوانترین دەربڕین قسە دەربڕێت..

بەهەمان شێوەیە بێت لەگەڵ منداڵەكانی.. دەیەوێت١٠٠٪ لە هەموو شتێكدا.. لەگەڵ هاوڵاتی.. لەگەڵ هەموو كەسێك لە بازارو سەرجادە..و..

ئەگەر كەسێكیان كەم و كورتیەكی هەبێت ئەوا بە زمانی دەیخوات زۆری لەسەر دەڵێ و دووبارەی دەكاتەوە تێبینییەكانی.. هەتا هەموو خەڵكی لێ ماندوو دەبێت.. چونكە ئەو لە لاپەڕەی سپی تەنها خاڵێكی رەش دەخوێنێتەوە..هە ركەس ئەمە هەڵسوكەوتی بێت ئەوا خۆی

زیاتر ئازار ئەدات لەپێش هەموو کەسێکەوە.. خەڵکانیش خۆشیان ناوێت با نزیکترین کەسیش بێت لێی دانیشتنەکەی لەسەر دڵیان گران دەبێت..

اذا انت لم تشرب مراراً على القذا...ظمئت، واي الناس تصفو مشاربه؟!

اذا كنت في كل الامور معاتباً... رفيقك لن تلقى الذي لا تعاتبه

واتە:ئەگەر تۆ هەردەم ئاو نەخۆیتەوە لەبەر ئەوەی لێلی تێدایە..

ئەوا تۆ هەردەم بەتینوێتی دەمێنیتەوە..

ئەگەر تۆ هەردەم رەخنە گربی...لە هاوەڵت هیچ کەس نابینی کە بێرەخنە بیت لێی..)).

پاك و بێگەردی بۆ خودای گەورە!! کە دەفەرموێت:((واذا قلتم فاعدلوا)).

واتە ئەگەر ئێوە قسەتان کرد با دادپەروەر بن لە قسەکانتانا..

دایکمان عائیشە.. (ما عاب رسول الله طعاما قط) واتە هەرگیز پێغەمبەر((ﷺ)) ئەنگیی لەخواردن نەگرتووە...

ئەنەس ئەفەرموێ :(والله لقد خدمت رسول الله عشر سنين فلم يقل لى فعلت ولم لم تفعل)..واتەسوێندبەخودا (دە) ساڵ خزمەتی پێغەمبەرم ((ﷺ))کردهەرگیز بەمنی نەوت بۆ ئەوەت کرد یان بۆ ئەوەت نەکرد..من بەم شتانە داوای ئەوە ناکەم کە ئامۆژگاری نەبێت یان بێ دەنگ بیت لەکاتی هەڵەکاندا، بەڵام ورد مەبەوە لەهەموو شتێکدا.. بەتایبەت لە کاروباری دونیایدا.. خۆت رابهێنە لەسەر ئەوەی کارەکان وەك خۆیان بڕۆن..

ئەگەر کەسێك لە دەرگای دایت بە میوانی تۆیش بەخێرهاتنت کردو هێناتە ژوورەوە کاتێك چاییت بۆ دانا سەیری پیاڵەکە بکات و بڵێت: ئەوە بۆ پڕ نییە؟تۆیش وتت بیهێنە بۆت پڕبکەم؟وتی: نا..نا..

بەسە..داوای قاوەی کرد.. تۆیش گلاسێك ئاوت بۆ هێناو لێی خواردەوە.. کاتێك تەواو بوو: بڵێت :ئاوەکەتان سارد نییە.. لە پاشاندا روو بکاتەوە بەلای ساردوی گەرمەی ژوورەکەداو بڵێت: ساردو و گەرمەکەتان ماڵ فێنك ناکاتەوە!! هەرشت لە دوای شت رەخنەتان لێ بگرێت.. لە پاشاندا.. ئایا هەست ناکەیت ئەم کابرایە رەزای گرانە؟.. هیواو ئاوات دەخوازیت ئەگەر لە ماڵت دەرچوو هەرگیز بۆی نەگەڕێتەوە.. کەواتە خەڵکانێك هەن حەزیان بە رەخنەگرتن نییە لێیان..بەڵام ئەگەر هەر پێویست بوو رەخنەت هەبێت ئەوا تۆ لە بەرگێکی جواندا پێشیکەشی

بکە بۆ خەڵکانی تر.. پێشکەش بکە وەك وێنەی پێشنیار.. یان بەشێوازێکی نایەکسەر.. یان با وشەکانی دەربڕینت گشتی بن..

پێغەمبەر ((ﷺ))کاتێك ئەگەر تێبینی هەڵەیەکی بکردایە لە بەرامبەر راستەوخۆ بەو کەسەی رانەدەگەیاند بەڵکو دیفەرموو: ئەوە چییە کەسانێك ئەو شتانە دەکەن و ئەوەی تر دەکەن.. وەك ئەوەی بفەرموێت مەبەستم تۆیە دراوسێ گوێ بگرە..

لە کوردەواریدا دەڵێن: (( بوکێ لەگەڵ تۆمەو بەڵام خەسو گوێ بگرە )).

لە رۆژێك لەرۆژاندا سێ گەنجی دڵ گەرم هاتنە شاری پێغەمبەر((ﷺ)).. بۆ ئەوە هاتبوون بزانن چۆنیەتی پەرستنی پێغەمبەر((ﷺ)) چۆنە؟!!..

پرسیاریان لە هەندێك لە خێزانەکانی پێغەمبەر (((ﷺ)))کرد بۆ ئەم مەبەستە.. ئەوانیش فەرموویان هەندێ رۆژ بە رۆژوو دەبێ.. هەندێ رۆژ بەرۆژوو نابێت.. لە هەندێ شەودا دەخەوێت .. لەهەندێکی تردا شەو نوێژ دەکات

وەك ئەوەی ئەوان ئەو پەرستنەی پێغەمبەریان((ﷺ))پێ کەم بووبێت بۆیە هەریەکەو سۆزێکی دا بۆ خۆتەرخانکردن بۆپەرستن یەکێکیان وتی:( اما انا اصوم فلا افطر وقال الثاني اقوم الليل ولا انام وقال الثالث لااتزوج النساء من بەرۆژو ودەبم و هەرگیز نایشکێنم دووەمهەدەم شەونوێژ دەکەم سێیەممن هەرگیز ژن ناهێنم.. کاتێك پێغەمبەر((ﷺ)) ئەمەی گوێ لێبوو فەرمووی((ﷺ)) :((امانا اصوم وافطر واقوم الليل وارقد واتزوج النساء...فمن رغب عن سنتي فليس مني) من بەرۆژوودەبم، ودەیشکێنم شەونوێژدەکە م دەخەووم، ژن دەهێنم ، هەرکەس لە رێگەی من لابدات ئەوە لەمن نییە .. لە رۆژێکی تردا .. پێغەمبەر((ﷺ))تێبینی ئەوەی کرد هەندێك کە هاوەڵانی لە نوێژیان لەگەڵ دەکرد.. چاویان بۆ ئاسمان بەرز دەکردەوە لەکاتی نوێژەکانیاندا.. ئەمەش هەڵەیە لە نوێژدا چونکە ئەبێت مرۆڤ بڕوانێت بۆ جێگەی سوجدەی....

پێغەمبەر ((ﷺ)): چیانە ئەو کەسانە کە چاویان بەرز دەکەنەوە بۆ ئاسمان لەنوێژەکانیاندا.. بەڵام ئەوان وازیان لەو کارەیان نەهێنا بەردەوامبوون لەسەری..

بەڵام هیچ سوکایەتی پێ نەکردن یان ناویان بهێنێ بە ناوەکانیان..

بەڵکو فەرموویەتی: ( لينتهين عن ذلك...او لتخطفن ابصارهم..)واتە :ئەوانە واز دەهێنن یان خودا چاوەکانیان بۆ ناگەڕێنێتەوە.. کۆیلەیەکی ئافرەت ناوی بورەیرە بووخۆی کریەوە عایشە دایکی موسوڵمانان یارمەتی خۆ کڕینەوەکەیدا بەڵا.خزمانی بەرجیانگرت کەئەبێ هەرلەژێر چودێری ئەواندابێت بەڵام فەرموو ی مەرج لەسەریان بگرە مادەم تۆ ئازادی دەکەیت تۆ سەرپەرشتیاریی دەبیت بۆیە وەك وەڵامدانەوەیەك بۆ ئەو جۆرە کەسانە: (( فمابال رجال يشترطون شروطا ليس في كتاب الله شيئا كل شرط ليس في كتاب الله فهو باطل. فهو باطل..))واتە هەرمەرجێك لە پەرتووکی خودا نەبێت ئەوە پووچەڵە.. ئەوە پووچەڵە..

بەڵێ دارەکە نیشان بدە و پێی بترسێنە لە دوورەوە بەڵام پێی لێ مەدە .. چەندە جوانە بە خێزانەکەی خۆت بڵێت: دوێنێ لە خاوێنیکردنەوەدا لە لای برادەرێکمان بووین.. هەموو خەڵکەکە باسی خاوێنی ئەویان دەکرد..

یان بە منداڵەکەت بڵێیت کاتێ فەرامۆشی هەیە لە چوونی بۆ مزگەوت.. بڵێیت: (( من سەرم سوڕ دەمێنێ لە کوڕی دراوسێکەمان هەردەم بۆ نوێژەکان ئامادەیە..))!!

مەبەستت ئەوەیە بەتۆ دەڵێم بەڵام دراوسێ گوێت لێ بێ!!بۆت هەیە بپرسیت خەڵکی بۆچی رەخنەیان لەسەر دەروون گرانە؟ منیش دەڵێم: چونکە هەستی بە کەم و کورتی خۆی پێ دەردەخات.. هەموو خەڵکی حەز ئەکەن لە شتەکاندا تەواو بن..

کابرایەکیان بۆ باس کردم.. کابرایەکی سادە بوو حەزی بەوە بوو کە شتێك بکات و کۆنترۆڵی لە دەستی ئەودابێت.. بۆیە دوو تەرمۆز ئاوی دانا.. دانەیەکیان کەسك بوو.. دانەکەی تریان سوور بوو..

هەردووتەرمۆزەکەی پڕکرد لە ئاوی سارد.. لە پاشاندا لەسەر رێگەی خەڵك دانیشت.. هاواری دەکرد. ئاوی سارد ئاوی سارد بە خۆڕای..

کابرای تینوو دەهات و گڵاس و پەرداخەکەی بە دەستەوە دەگرت بۆ ئەوەی لە ئاوەکە بخواتەوە کاتێك کابرا دەیبینی وادەست بۆ ئاوی تەرمۆزە سەوزەکە دەبات..

پێی دەوت.. نا.. بەڵکو لە ئاوی تەرمۆزە سوورەکە بخۆرەوە.. کابراش لە تەرمۆزە سوورەکەی دەخواردەوە و دەڕۆیشت..کاتێك کەسێکیتر دەهات و دەیوست لە تەرمۆزە سوورەکە بخواتەوە.. دەیوت لە تەرمۆزە سەوزەکە بخۆ.. ئەگەر پرسیاری بکدرایە و بیوتایە.. جیاوازیان چیە؟.. دەیوت: من بەرپرسیاری ئەم ئاوەم.. ئەگەر ئەم یاساو دەستوورەت پێ باشە ئەوا

**فەرموو یان برۆ ئاوی تر لە جێگەیەکی تر بخۆرەوە..ئەوە ئەو هەستەیە کە مرۆڤی ئەوەی ئادەم هەردەم پێویستی بە ئەوە هەیە حسابی بۆ بکرێت و گرنگیی پێ بدرێت..**

هەنگ و مێش..

تۆ وەك هەنگەکە بە : تەنها لە سەر خاوێنی بنیشە دوور دەبێت لەهەر خراپەیەك.. خۆت وەك مێش و مەگەز لێ مەکە بە دوای برینەکان و بۆ گەنیوەکان دەکەوێت!!

| Do not be supportina | لاتـکـن نـقــادا |
|---|---|

## هەردەم خۆت مەکە بە مامۆستا بە سەرخەڵکانی ترەوە!!..

**بەراوردێ بکە لەنێوان سێ باوکدا.. هەرسێکیان کوڕەکەی خۆی ببینێ لەبەر تەماشاکردنی بۆ تەلەفزیۆن رۆژانی تاقیکردنەوەکاندا..**

**باوکی یەکەم بە منداڵەکەی دەڵێت: ئەی محمد.. وانەکانت لەبیر بێت..**

**باوکی دووەم بە منداڵەکەی دەڵێت: ئەگەر وانەکانت نەخوێنیت سوێند بە خوای گەورە لێت دەدەم.. خەرجیشت بۆ ناکەم..وە..**

**باوکی سێیەم دەڵێت: کوڕم.. ئەگەر وانەکانت بخوێنیت بۆ تۆ چاکترە لە تەماشاکردنی تەلەفزیۆن.. راستە؟!**

**بێگومان باوکی سێیەم.. چونکە ئامۆژگارییەکەی لەسەر شێوەی پێشنیار...**

**بەهەمان شێوە لەهەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ئافرەتەکەت.. ئەی هاوسەرم خۆزگە چاییەکت لێ نابا.. ئەی هاوسەرم خۆزگە دەخوازم نانی بەیانی ئەمڕۆ زوو بخۆم.. بەهەمان شێوە ... کاتێك مرۆڤ هەڵە بکات..**

چارەسەری هەڵەکەی بکە بە شێوازێك هەست بەوە بکات هزرەکە هزری ئەوە.. منداڵەکەت لە نوێژ دوا دەکەوێت لەگەڵ جەماعەتدا..
پێی بڵێ – بۆ نموونە-: ئەحمەد.. ئایا ناتەوێ بچیتە بەهەشتەوە..ئەویش بەڵێ .. کەواتە پارێزگاری لە نوێژی جەماعەت بکە..
لە ڕۆژێك لە ڕۆژان..لەرەشەماڵێکی عەرەبدا لە بیابانـدا.. ئافرەتێك هاوار دەکات..منداڵی دەبێت..زیاتر ئازاری منداڵ بوونەکە زیاد بوو هەتا گەیشتە ئەوپەڕی ئازارەکە ومنداڵەکە بوو..
بەڵام منداڵەکە رەشپێست بوو!! کابرا سەیری خۆی کرد.. سەیری ئافرەتەکەی کرد واسەیر دەکات هەردووکیان سپی پێستن.. بۆیە سەری سوڕما ئەی چۆن ئەم منداڵە رەشپێستە!!.
بۆیە شەیتان دوو دڵی((گومانی)) خستە دڵیەوە..لەوانەیە ئەم منداڵە لە تۆ نەبێت!! لەوانەیە کابرایەکی رەشپێست داوێن پیسی لەگەڵ کردبێت ئەم منداڵە لە ئەو بوو بێ!! لەوانەیە..کابرا حاڵی بە رەو تێکچوون دەچێت. بۆیە کاروانی کرد بۆ شاری مەدینە..هەتا چووە خزمەت پێغەمبەرەوە ((ﷺ)) هەندێك لە هاوەڵانیشی لە خزمەتدا بوون..
کابرا وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ((ﷺ)) ..هاوسەرەکەم لە ژێر نیکاحی مندا منداڵێکی رەشپێستی بوو!! ئێمەش لەرەگەزو تیرەمان هەرگیز رەش پێستمان تیادا نەبووە..!!
پێغەمبەر((ﷺ))سەیری کرد و ڕوانی بۆی زانیی دوو دڵە هەیە لە منداڵەکەی..
پێغەمبەر((ﷺ))دەیتوانی ئامۆژگارییەکی ڕێك وپێکی بکات کە هەردەم گومانی باش بە خەڵکانی تر بەرێ .. گوناهو تاوان نەداتە پاڵ ژنەکەی خۆی بەبێ هیچ زانیارییەك ..
بەڵام پێغەمبەر دەیەوێت هەڵسوکەوتێکی وای لەگەڵ بکات چارەسەرێك بێت لە شێوازێکی تر..
بەوەی ویستی ئەم کابرایە خۆی بەخۆی ئەم کێشەیەی خۆی چارەسەر بکات.. بۆیە پێغەمبەر نموونەی بۆ دەهێنێتەوە بە شێوەیەك وەڵامەکەی لێ نزیك بێتەوە.. کەواتە ئەی چ نموونەیەك شێوازەکەی نزیکە بۆی؟ ئایا نموونە بەدار بۆ بهێنێتەوە؟ یان بە دارخورما؟ یان نموونەی بە فارس وڕۆمەکان بهێنێتەوە؟ بۆیە پێغەمبەر((ﷺ)) تەماشای کابرای کرد شوێنەواری لادێی پێوە بوو.. لەهەمان کاتدا هەموو جۆرە هزرێك بە مێشك وهۆشیدادێت دەربارەی ئافرەتەکەی..
پێغەمبەر ((ﷺ)) پێی فەرموو: (( ئایا خاوەن حوشتریت؟))
کابرا وتی: بەڵێ..
پێغەمبەر((ﷺ)) : ((ئایا رەگەزەکانیان چۆنە؟))

ووتی: سوورن..

پێغەمبەر(( ﷺ )): ((ئایا ڕەشیان تیادایە؟ ))

کابرا وتی: نەخێر..

پێغەمبەر(( ﷺ )):((ئایا لەناویاندا نییە ڕەنگی ڕەش وسپی تێکەڵ بووبێت؟))

کابرا: بەڵێ..

پێغەمبەر( ﷺ ): ((ئەی بۆچی ئەمە هەیە؟! )).

وەك ئەوەی پێغەمبەر(( ﷺ )) پێی بفەرموێت مادەم هەموو حوشترەکان بە نێرو بە مێ سوورن.. هیچ ڕەنگێکیان تیادا نییە بێجگە لە سوور.. ئەی چۆن و بۆچی بەچکە حوشتر ڕەش بە سوورو سوور بەرەش تیادا دەبێت..ڕەنگەکەی جیاوازە لە ڕەنگی حوشترە نێرو مێیەکان.کابرا هەندێك بیرو تیارامانی کرد.. لە پاشاندا وتی: لەوانەیە لە باوباپیریانەوە ئەم جۆرە ڕەنگانە هەبێت.. هەر بۆیە ئەم بێچووەش چووەتەوە سەر باوباپیرانیان.. بۆیە تێیدا دەرکەوت..

پێغەمبەر (( ﷺ )) فەرمووی: (( لەوانەیە منداڵەکەی تۆش لەباو باپیرانتان تۆ یان خێزانەکەت ڕەش پێستی تیادا بووبێ)) (فلعل ابنك هذا نزعه عرق. رواه مسلم ابن ماجه وللفظ لابن ماجه.

کابرا ئەم وەڵامەی پێغەمبەری(( ﷺ )) گوێ لێ بوو.. هەندێك بیرکردنەوەی کردوو.. هزر هەمان هزری خۆیەتی.. بۆیە دڵنیا بوو ڕازیش بوو بە وەڵامەکەی پێغەمبەر(( ﷺ )).. بۆیە گەڕایەوە بۆ لای ئافرەت و منداڵەکەی خۆی.

لە ڕۆژێکی تردا پێغەمبەر لەگەڵ هاوەڵانی دانیشتبوو.. باسی دەرگاکانی خێری بۆ دەکردن.. خاڵێك لەو خاڵانەی کە پیغەمبەر (( ﷺ ))فەرمووی: (وفي بضع احدكم !صدقة...قالوا اياتي احدناشهوته فهو له بها صدقة ؟!قال ارايت ان وضعها في الحرام اما كان عليه وزر ...واتە تەنانەت بچنە لای خێزانەکانتان خێرە ؟!وتیان:( کەسێك بۆئارەزۆیخۆی ئەمە دەکات خێریشی دەکات ؟!))فەمووی (( ﷺ ))ئەگەر بەحەرام بێت تاوانی هەیە ؟وتیان: بەڵێ فەمووی(( ﷺ )) (( حەڵاڵیش بەهەمان شێوەیە))..

بەڵکو هەتا لە کاتی گفتو گۆدا لەگەڵ خەڵکانی تردا بەهێواشی وهێمنی وردە وردە فێری چاکەکانی دەکردن.. پێغەمبەر(( ﷺ ))بۆ عومرە دەچێ لەگەڵ هەزاروچوار سەد کەسی هاوەڵی

عومردەکەی.. بۆجێبەجێکردنی مەککەوە شاری ناو بچێتە هێشت نەیان قورەیشییەکان خۆیدا..
بۆیە ڕووداوەکانی چیرۆکی حودەیبییە دروست بوون..لە دوا دەرئەنجام لە پاش ئەوەی ڕاوێژ
لە نێوان پێغەمبەر ((ﷺ)) وقورەیشییەکان.. ڕێکەوتن لەسەر ڕێکەوتننامەو ئاشتینامە بۆ
دەساڵ.. ئەوەی کە هەستا بە ڕێکەوتننامەکە و لەسەر بڕگەکانی لەلایەن قورەیشییەکانەوە
بریتی بوو. لە سوهەیلی کوڕی عەمرو ..پێغەمبەر((ﷺ)) ڕێکەوت لەگەڵ سوهەیلدا لەسەر
چەند مەرجێك..

لەوانە: ١-موسوڵمانان بگەڕێنەوە بۆ مەدینە بەبێ ئەوەی عەمرەکەیشیان بکەن..
٢- هەرکەس بێتە ناو ئایینی ئیسلامەوە لەخەڵکانی مەککەیی وبییەوێت کۆچ بۆ شاری
مەدینە بکات موسوڵمانان لە شاری مەدینە قوبووڵ وپەسەندی ناکەن..٣- بەڵام هەر کەس لە
ئیسلام پەشیمان ببێتەوە بچێتە لای هاوەڵ پەیدا کاران لە شاری مەککە ئەوان وەریدەگرن..!!
بێجگە لەو مەرجانەش کە لە ڕووکەشیدا ڕووخاندنی موسوڵمانانە وبێ دەسەڵاتییانە..
قورەیشییەکان دەیانزانی ئەگەر پێغەمبەر بیەوێ شاری مەککە ڕزگار بکات ئەوا دەتوانێ
ڕزگاری بکات.. دەترسان لەم هاوەڵانەی پێغەمبەر((ﷺ)) هەر لەبەر ئەوە قورەیشییەکان
چاریان ناچار بوو کە نەرم بن لەگەڵ پێغەمبەر((ﷺ))..

وەك ئەوەی خەویان بەم مەرجانەوە بینی بێ وابوو ئەم مەرجانە یان هەموو بەسەرکەوتن
ودەستکەوتی گەورە لە پێنوس دەدا. لە کاتێکا زۆربەی هاوەڵانی پێغەمبەر ((ﷺ)) ئەم
مەرجانەیان پێ پەسەندنەدەکرا وبە ستەمیان دەژمارد..

بەڵام بۆیان نییە لە فەرمانی پێغەمبەری((ﷺ)) خودای گەورە لابدەن.. ئەو کەسەیش کە
ڕێکەوتننامەکەی دەنووسی لە موسوڵمانان عەلی کوڕی ئەبوطالیب بوو..

عومەر سەیری لای چەپ ولای ڕاستی خۆی دەکرد.. ئاواتی ئەوەی دەخواست کە شتێکی پێ
بکرێت.. بۆیە دانی بەخۆیدا نەگرت..چوو بۆ لای ئەبوبەکر..دەیویست بۆچوونی خۆی بە
ئەبوو بەکر بگەیەنێ..

زانایی دانایی عومەر لەوەوە دەستی پێ کرد کە هەردووکیان قەناعەتیان پێی هەیە..بۆیە
پرسیاری لە ئەبوبەکر دەکرد پرسیارێك کە بەڵێ وبەڕاست وەڵام بدرێتەوە..

وتی: ئەی ئەبوو بەکر..ئایا محمد پێغەمبەری((ﷺ)) خودانییە..؟
ئەبوبەکر وتی: بەڵێ..

عومەر: ئایا ئێمە موسوڵمان نین؟!

ئەبوبەکر: بەڵێ..

عومەر: ئایا ئەوان هاوەڵ پەیداکارنین؟!

ئەبوبەکر: بەڵێ..

عومەر: ئایا ئێمە لەسەر هەق نین؟

ئەبوبەکر: بەڵێ...

عومەر: ئایا ئەوان لەسەر پڕو پووچەڵی نین؟

ئەبوبەکر: بەڵێ..

عومەر: ئەی بۆچی سەرشۆڕی پەسەند بکەین لە ئایینەکانماندا؟!

ئەبوبەکر: ئەی عومەر ئایا محمد پێغەمبەری ((ﷺ)) خودا نییە؟

عومەر بەڵێ..

ئەبوبەکر: دەی کەواتە ئەو دوورینەی ((هێڵو فەرمانی))(پێغەمبەر ((ﷺ)) وەرگرە مەبەست بە ڕێکەوتننامەکەیە..

من سوێند دەخۆم ئەو پێغەمبەری((ﷺ))خودایە.. مەبەستی ئەبوو بەکر ئەوەبوو شوێن کەوتەی پێغەمبەر ((ﷺ))بێت نەك سەرپێچی پێغەمبەر((ﷺ)) بکات.. وەك چۆن دەرزی تەقەڵ تەقەڵ دەدوورێت وبەدوای یەکدا دێت..

عومەر: منیش شایەتی دەدەم کە پێغەمبەری خودایە ..

عومەر دەچێت.. هەوڵی ئەوەی دا دان بەخۆیدا بگرێت.. بەلاّم نەیتوانی ..بۆیە چوو بۆ لای پێغەمبەر.

هەمان پرسیارەکانی دوبارە کردەوە..

وەلاّمی پێغەمبەر ((ﷺ)): ((انا عبدالله ورسوله.. لن اخالف امره ولن يضيعني..)). واتە من پێغەمبەری ((ﷺ))خودام وفەرمانی خودا ناشکێنم ..خودایش من فەرامۆش ناکات..عومەریش بێ دەنگ بوو.. ڕێکەوتننامەکەش مۆرکرا..

موسوڵمانان گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە.. چەند ڕۆژگارێکی بەسەردا چوو.. قوڕەیشییەکان پەیمانەکانی خۆیانیان شکان.. جارێکی تر پێغەمبەر((ﷺ)) هات شاری مەککەی ڕزگارکرد.. ماڵی خودای لە موشریك وکافرەکان خاوێن کردەوەو بتەکانیش...

ئەو کات عومەر بۆی دەرکەوت کە هەڵە بووە لە نارازیبوونەکەی .. بۆیە عومەر دەفەرموێت:
لەو ڕۆژەوە بە ڕۆژوو دەبم.. خێرو چاکە دەکەم.. نوێژ دەکەم.. کۆیلەکان ڕزگار دەکەم..
لەوەی کە ئەو ڕۆژە ئیعتیرازم کرد ئەو قسەیەم کرد کە کردم.. هەتا هیوام وایە خودای گەورە لێم خۆش بوو.. ئۆخەی چەند شیرپاکە عومەر.. ئۆخەی چەند شیر پاکە پێغەمبەر لەپێش عومەریش..

چۆن دەتوانین زۆرترو زیاتر سوود و وانە وەرگرین لەم لێهاتووییە؟

ئەگەر منداڵێکت گرنگی وچاودێری بە لەبەرکردنی نەدەکرد.. بەڵام تۆیش دەتەوێ زیاتر هەوڵی پێ بدەیت.. لەوەوە دەست پێ بکە کە هەر دووکتان لەسەری کۆکن.. بۆ نموونە کوڕم ئایا ناتەوێ خودای گەورە تۆی خۆش بوێ..؟

ئایا ناتەوێ پلەو پایەت بەرزبێت لە بەهەشتدا؟..بێ گومان وەڵامدانەوەکەی بەوە دەبێت:
((بەڵێ)) ئەو کات تۆیش ئامۆژگاریی خۆتی پێ بگەیەنە لەسەر شێوازی پێشنیار کردنێك:
وەك ئەوەی پێی بڵێیت :کوڕم! کەواتە ئەگەر بەشداری لە قورئان خوێندندا بکەیت ئەو شتانەت بەبەش دەبێ..

بەهەمان شێوە تۆی ئافرەت: ئەگەر ئافرەتێکت دی فەرامۆشی دەکرد لە پۆشاکەکەیدا..دەست پێ بکە بەوشتانەی کە ئێوە هەردوکتان لەسەری کۆکن..

وەك ئەوەی بڵێیت ئەزانم تۆ باوەڕداری .. حەزت بەخێرەو .. ئەویش دەڵێ: ڕاستە .. تۆیش بڵێ سوپاس بۆ خودا.. ئافرەتێکی خاوێن وباوێنیشی.. خوداو پێغەمبەرت خۆش دەوێ..
ئەویش دەڵێ: بەڵێ بە خودای گەورە وایە.

تۆیش بڵێ سوپاس بۆ خودا .. ئەو کات ئامۆژگاریەکەی خۆت وەك پێشنیار پێشکەش بکە:
وەك ئەوەی بڵێیت: خۆزگە ئەگەر تۆ زیاتر بایەخ وگرنگیت بە پۆشاك وبالاپۆشییەکەت زیاتر بدایە.. زیاتر خۆت داپۆشیبایە..

ئا بەم شێوەیە دەتوانین ئەوەی دەمانەوێ بەدەستی بهێنین لەناو خەڵکیداو بەدەستمان دێت بەبێ ئەوەی کە هەستیان بریندار بکەین.. بەبێ ئەوەی ئەوان بەخۆیان بزانن..

## تروسکایی ڕووناکییەك..

**تۆ دەتوانی لە هەنگوینەکە بخۆیت بەبێ ئەوەی هیچ شانەکە کاولی بکەیت و بیشکێنیت..**

| Eliminate mistakes then correct it | اقنعه بخطأه ثم إنصحه |
|---|---|

## بە قەناعەتی بهێنە کە هەڵەیە بۆ ئەوەی ئامۆژگاریت لێ وەرگرێت..

هەندێك مرۆڤ خەڵکانی تر سەرقاڵ دەکەن بە زۆریی رەخنەگرتن و تێبینییەکانیان هەتا وا لەبەرامبەر دەکەن کە تووشی ماندووبوون ولەشگرانیی دەکەن.. بەتایبەت کاتێك تێبینییەکان و ئامۆژگارییەکان لەسەر بنەمای زەوقی کەسی تێبینەر بێت..

وەك ئەوەی کەسێك ئامادەی دەعوەتێکی گشتی بووبێ خاوەن دەعوەتەکە زۆر ماندوو وهیلاك بووبێ هەتا ئامادەی کردبێ ماڵ ومنداڵیشی بەهەمان شێوە لەگەڵ خۆی ماندوو کردبێ بۆ ئامادەکردنی ئەم خواردنە!..

لە پاشاندا کابراش دێت وەك ئەوەی ئامۆژگاری ودڵسۆزی بۆ دەربڕێت: ئەی برام ئەمە هەر بۆنیەك بووبێت.. ماندووبوونەکەت بە فیڕۆچوو.. من گومانم وابوو زۆر لە ئاستێکی زۆر بەرز تردا دەبوو..

تۆیش دەڵێیت: بۆ چی؟

دەڵێت: برام گۆشتی برژاو زیاتر بوو منیش حەزم دەکرد زیاتر گۆشتەکە کوڵاو و سورکراوە بوو بایە!!

زەڵاتەکان زۆر ترش بوون بە هۆی لیمۆو ئاوی لیمۆکەوە..منیش ئەمەم پێ خۆش نییە..
بەهەمان شێوە کێکەکان رازانرابوونەوە بە کرێمی سەریانەوە..

ئەمەش وای لێکردبوو تامی کێکەکەی شاردبووەوە.. لەپاشاندا پێت دەڵێت: بە گشتی زۆربەی خەڵکەکە نارەحەت بوون.. تەنها وەك موجامەلەیەك خواردنەکەیان خوارد.. چونکە چاریان ناچار بوو!!

بێ گومان تۆ کەسەیری ئەم جۆرە کەسە دەکەیت زۆر بە چاو سوکییەوە سەیری دەکەیت گرنگی بە ئامۆژگاری وتێبینییەکانی نادەیت.. لە بنەڕەتدا هەر لێی وەرناگریت، چونکە تێبینییەکان بە زەوقی خۆی بوو بۆ زەوقی خۆی بوو..!!

بەهەمان شێوە بڵێ بۆ کەسێك کە رەخنە لە باوکێك بگرێت لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیدا.. یان هەڵسوکەوتی لەگەڵ خێزانی.. یان چۆن ماڵەکەی درووست کردبێ.. یان جۆری سەیارەکەی..لەسەر زەوقی تایبەتیی خۆی رەخنەت لێ بگرێت ئاگاداری زۆربەی ئامۆژگاری ورەخنەکان لەسەر بنەما زەوقی تایبەتی کابرای هەڵدەقوڵێ..

بەڵێ کاتێك داوای ئامۆژگاری ورەخنەی لێکردی .. ئەوکات ئامۆژگاری ورەخنەی خۆت دەربڕە.. بەڵام تۆ قسەی لەگەڵ بکەیت. ئامۆژگاری بکەیت ئەوەی ئامۆژگاری کەسێکی هەڵەکردوو دەکەیت.. ئەمە.. نابێت و نەخێر..

زۆر جاری واش دەبێ کابرای ئامۆژگاریکار هەست بە وە ناکات خۆی هەڵە یە بۆیە پێویستە بەڵگەکەی زۆر بەهێز بێت لە ئامۆژگاریەکەیدا.. کابرایەکی دەشتەکی لەگەڵ هەندێك لە پیاو چاکاندا دانیشتبوون ئەوان باسیان لە چاکەکردن لەگەڵ دایك وباوك دەکرد.. کەسێکیان وتی: ئەی برای دەشتەکی تۆ چۆنی لەگەڵ چاکەکردن لەگەڵ دایك وباوکتدا..؟

ئەویش وتی: من زۆر چاکەکارم لە گەڵیان..

وتی: چاکەی تۆ چۆنە لە گەڵیان؟..

دەشتەکی:- هەرگیز بەقامچی لێم نەداون!!

مەبەستی ئەوەیە تەنها بە زللەلێیان دەدات کاتێك ئەگەر پێویستیان بەلێدان هەبێت!!!
ئەمەیش لەوپەڕی چاکەکردن لەگەڵ دایك وباوکی حساب دەکات..

ئەم کابرا دەشتەکییە قوڕ بەسەرە لە پێوەری چاکبوون لەگەڵ دایك وباوکیدا زۆر بەهەڵە داچوو بوو... بۆیە هەردەم نەرم بە بۆ ئەوەی ئەو کەسەی بەرامبەرت قەناعەتی بەهەڵەکەی خۆی بێت لەپێش چاوی تۆدا..

لە سەردەمی پێغەمبەر((ﷺ))ئافرەتێکی مەخزومی دزی کردنێکی لێ ئاشکرا بوو... ئافرەتێکی خاوەن هۆزو خێڵی گەورەو بەناو بانگ دزی کردنی لەسەر سەلمێنرا، ئەبێت پێغەمبەر((ﷺ)) وەك دادوەر حوکمی خوداو فەرمانی ئەو بەجێ بهێنرێ لەخێڵی مەخزومی قورەیشی بوو بۆیە قوڕەیشییەکان هاتن ئوسامەی کوڕی زەیدیان نارد بۆ خزمەت پێغەمبەر ((ﷺ)) بۆ ئەوەی دادگاییەکە نەکرێت !! بۆیە دەستی دایە وتارێکی بەپێزەوەو فەرمووی :

﴿ انما اهلك الذين قبلكم انهم كانوا اذا سرق فيهم الشريف تركوه، واذا سرق فيهم الضعيف اقاموا عليه الحد، وأيم الله لو ان فاطمة بنت محمد سرقت لقطعت يدها ﴾ ، واتە (( ئەوەی کە ئەو کەسانەی

لەپێش ئێوەدا هاتوون بۆتە هۆی لەناو بردنیان کاتێ ئەگەر کەسێکی بەناوبانگ دزی بکردایە وازیان لێ دەهێناو فەرمانیان لەسەر جێ بەجێ نەدەکرد !! بەڵام ئەگەر کەسێکی هەژارو بێ کەس دزی بکردایە دەستیان دەبڕی !! سوێند بەخودا ئەگەر فاتمەی کچی محمد((ﷺ)) دزی بکات، (محمد) ((ﷺ)) خۆی دەستی دەبڕێ)) . .

بەڵکو بڕوانە بۆ هەڵسوکەوتی پێغەمبەر ((ﷺ)) لەگەڵ ئوسامەی کوڕی زەیدا.. کە خۆشەویست کوڕی خۆشەویستی پێغەمبەر ((ﷺ)) بوو.. لەماڵی پێغەمبەردا((ﷺ)) گەورەبوو.. ئوسامەش یەك لەو هەنگاوانەبوو. کە لەگەڵ هۆزی جوهەینەدا شەڕ بەرپابوو..

لەبەرەبەیانێکی زۆر زوودا.. موسوڵمانان سەرکەوتن.. جەنگاوەرێك لە جەنگاوەرەکانی دوژمن چەك و شیری خۆی فڕێ داو دەستی بەراکردن کرد. ئوسامە کابرایەکی ئەنساری بەدوای کەوتن.. هەتا کابرا خۆی دایە پاڵ دارێك.. ئووسامە و کابرا ئەنسارییەکە دیتیان کابرای دوژمن یەکسەر شەهادەی هەقی هێنا: ((اشهد ان لا اله الا الله .. واشهد ان محمداً عبده ورسوله..))کابرای ئەنساری و ئوسامە نەیانزانی چی بکەن ئایا کابرا لە دڵەوە موسوڵمان بووە.. یان ئەمە فێڵێکەو بەکاری دێنێ بۆ دەرباز بوون..واتە ئەوانیش لە گۆڕەپانی جەنگدان.. کەس ئاگادار لە کەس نییە.. کوژراو و بریندار لە هەردوو لا هەیە و زۆرە.. کاتی بیرکردنەوەش نییە بۆیە ئەبێت زوو بڕیار بدرێت..

کابرای ئەنساری دەستی هەڵگرت.. بەڵام ئوسامە وتی ئەوە فێڵە بۆیە شیرێکی لێداو کوشتی..

بۆیە کاتێك گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە و هەریەکە پاڵەوانیەتی خۆی دەگێڕێتەوە دڵخۆشن بە سەرکەتنەکەیان..ئوسامەش بەسەرهات و چیرۆکەکەی خۆی گێڕایەوە بۆیە یەکسەر رووی پێغەمبەر ((ﷺ)) گۆڕاو فەرمووی کابرا وتی:(( لا الـه الا الله..)) لەپاشاندا تۆ هەر کوشتت؟!!ئوسامەش هەر دەیوت ئەو لە دڵیەوە نەبوو.. بەڵکو لەترسا وای دەوت..

پێغەمبەر ((ﷺ)) فەرمووی : دەیوت : ((لا اله الا الله)) لەپاشاندا تۆ کوشتت!!

بۆیە تۆ دڵت دوو کەرت کردبوو تا بزانیت لە تۆ ترسا وا دەڵێت بە قەناعەتەوە وا دەڵێت..

بۆیە پێغەمبەر ((ﷺ)) رووی دەکردە ئوسامە و دووبارەی دەکردەوە وتی: (( لا اله الا الله..))

لەپاشاندا .. تۆ کوشتت..!!

ئەی تۆچی دەکەیت بەو وشەیە: ((لا الـه الا الله ))کە لە رۆژی قیامەتدا بیکاتە بەڵگە بە سەرتەوە!! هەر دووبارەی دەکردەوە لەسەر ئوسامە.. هەتا ئوسامە دەڵێت: خۆزگە لە ئەمڕۆوە موسوڵمان بوومایە..

بڕوانە پێغەمبەر((ﷺ))چۆن هێواش هێواش و وردە وردە لەگەڵی بوو هەتا قەناعەتی پێ هێنا.. لە پاشاندا ئامۆژگاری کرد..بۆ ئەوەی کابرای ئامۆژگارییکراو قەناعەت بهێنێ بەوەی تۆ پێی دەڵێیت.. گفتوگۆ گۆڕینەوەی لەگەڵ بکە بەهزر و بۆچوونەکانی بە پێی توانا.. بەڵێ وەك هزری ئەو بیربکەرەوە..

لەکاتێکدا کە پێغەمبەر ((ﷺ)) لەگەڵ هاوەڵانی دانیشتبوو.. کابرایەکی گەنج هاتە مزگەوتەوە رووی بەلای راست و چەپدا ئاوڕی دەدایەوە، وەك ئەوەی بۆ کەسێك بگەڕێت.. کاتێك پێغەمبەری((ﷺ)) بینی..

بەرەو پێغەمبەر((ﷺ)) چوو.. خەڵك وهاوەڵانی چاوەڕوانی ئەوە بوو لە خزمەت پێغەمبەردا((ﷺ))دانیشێ گوێ بۆ ئایەت و فەرموودەکان بگرێت..بەڵام ئەمەی نەکرد..!

بەڵکو روانی بۆ پێغەمبەر((ﷺ)) وهاوەڵانی لە چواردەوری بە هەموو ئازاییەکەوە وتی:

(( ئەی پێغەمبەری((ﷺ)) خودا ..(( رێگەم پێ بدە بۆ ..فێربوونی زانست)) نەخێر.. ئەمەی نەوت.. خۆزگە ئەمەی بوتایە.. ((بۆ تێکۆشان..)) نەخێر.. خۆزگە ئەمەی بوتایە..

ئایا دەزانی چی وت؟ وداوای چی دەکرد؟ئەی پێغەمبەری خودا((ﷺ)) دەرفەتی زیناکردنم پیٚ بدە...

جێی سەرسوڕمانە !! ئاوا بەو هەموو راشکاویەوە؟!! بەڵێ.. بەو هەموو راشکاوییەوە: دەرفەتی زیناکردنم پیٚ بدە...

پێغەمبەر((ﷺ)) سەیری کابرای گەنجی کرد.. دەیتوانی ئامۆژگاریی بکات بە چەند ئایەتێك.. یان ئامۆژگارییەکی کورتی بکات ئیمان وباوەڕ لەدڵی بجۆشێنیٚ. بەڵام نەخێر پێغەمبەر((ﷺ))شێوازێکی تری لە گەڵ بەکارهێنا.. پێی فەرموو: ((اترضاه ؟لا قال لا قال اترضاه لخالتك؟ قال لا قال اترضاه لعمتك؟ قال لا قال وكذالك الناس..)).

واتە فەرمووی: (( تۆرازی دەبیت بۆ دایکت یان بۆپوورت یان بۆخوشکی باوکت ؟کابرا وتی نەخێر پێغەمبەر ((ﷺ))فەرمووی خەڵکیش بەهەمان شێوە))..

لە پاشاندا بڕوانە چۆن پێغەمبەر((ﷺ)) نەرم بوو لەگەڵی..بانگی کرد.. دەستی لەسەر سینگی دانا.. دووعاو پاڕانەوەی بۆ کرد..

واتە هەموو جۆرەکان وشێوازەکانی لەگەڵ بەکارهێنا بۆئەوەی بەقەناعەتەوە لە پێش چاوی خۆیدا چاك ودرووست بێتەوە..

لەدوای ئەوەی کەوای لێکرد قەناعەتی پیٚ بێنیٚ کە هەڵەیەکی گەورەی کردووە وداوای هەڵەیەکی گەورە دەکات..

بۆ ئەوەی هەرگیز بۆی نەگەڕێتەوە..نە لە پێش چاوی پێغەمبەرو نە لەپاش پێغەمبەریش((ﷺ)).. بەم شێوەیە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کردن..

## بنەما و بنچینەیەك..

کاتێك کابرای هەڵە کارو هەڵە کردوو هەست بەهەڵە گەورەکەی بکات ئەوکات قانیع ورازی دەبێت بەوەی پێویستی بەوە هەیە ئامۆژگاری بکرێت..

هەر ئەوکات پەسەندکردنی بۆ ئامۆژگارییەکە زیاترو زۆرتر دەبێت.. قەناعەتی ناوەوە رازی بوونی لەناخ ودەروونەوە هەڵدەقوڵیٚ بۆ وەرگرتن وپەسەندکردنی ئامۆژگارییەکە..

| be sure to know mistakes from others before advice | كن متأكدا من الخطأ للآخر قبل النصيحة |
|---|---|

## دڵنیابە لەوە کە هەڵەکەی کردووە لە پێش ئەوەی ئامۆژگاری بکەیت بۆ راستکردنەوەی هەڵەکەی..

دەنگی ئاشکرا بوو لەوەی کەتوورەیە بەڵام تووڕەیی خۆی دەخواردەوە ئەوەندەی پێی بکرایە.. ئەمە ئەو دەنگەنییە کەمن لە ئەحمەدم گوێ لێ بووە.. بۆیە هەستم کرد کە شتێکی پێیە بەرامبەری من.دەستی بە قسەکردن کرد.. باسی فیتنەو تاقیکردنەوەکانی مرۆڤی کرد لە ژیانی دونیاداو کە خەڵك و کەم کەسێك دەتوانێ لێی دەرباز بێت.. لەپاشاندا قوڕگی گیراو.. بەدەنگێکی کزەوەدوو بارەی دەکردەوە: تۆ بانگەواز چیت.. قوتابیی زانستە شەرعییەکانی .. کردەوەو کارەکانت لەسەر دەژمێردرێت.. من ..وتم: (( کاك ئەحمەدی باوکی عەبدوڵلا خۆزگە یەکسەر بچیتە ناو باسەکەی کە تۆ دەتەوێ)) .. وتی: ئەو موحازەرەی کە تۆ دات لە فلان جێگە.. منیش سەرم سوڕدەما.. وتم کەی بوو؟ وتی: پێش سێ حەفتە پێش ئێستا.. منیش لەوەڵامدا وتم : ((وا بۆ ساڵێك دەچێت نەچوومەتە ئەو جێگەیە..)).

وتی: بەڵێ چوویت موحازەرەکەت دەربارەی ئەوەو بوو..

لەپاش ئەمە بۆم دەکەوت بوو کە ئەم برادەرەم هەواڵێکی درۆی گوێ لێبووەو ئەویش باوەڕی پێ هێناوە.. لەسەر ئەم بنچینەو بنەمایە ئامۆژگارییەکانی خۆی دەکات.. هەڵوێستی خۆی دەردەبڕێت.. قسەکانی خۆی دەکات.. بەڵێ راستە کەمن هێشتا خۆشم دەوێت.. بەڵام ڕێزم بۆی کەم بووەوە چونکە بۆم دەرکەوت پەلە دەکات لە هەڵسوکەوتی..

زۆرن ئەو کەسانەی کە هەڵوێستیان لەسەر پڕوپاگەندە دادەمەزرێنن.. زۆریان لەوان وەك ئامۆژگاریکار دێن بۆ لات.. بۆ ئەوەی بۆ تۆ دەربکەوێ کە دوای پڕوپاگەندە کەوتوون..

زۆریان ئەو پڕوپاگەندەیە مۆر دەبێ لەسەر دڵیان و لەسەر ئەو بنەمایەش بۆچوونی خۆی دادەمەزرێنێ بەرامبەر تۆ.. کە ئەوەش درۆیە.. جاری وا دەبێت بڵاو دەبێتەوە فلأن کەسێك شتێکی کردووە..

بۆ ئەوەی تۆ ڕێزی خۆت بپارێزی لەلای ئەو کەسە.. دڵنیابە لەو هەواڵە پێش ئەوەی قسەی لەسەر بکەی.. ئەمەش خۆی لەخۆیدا پەیڕەوو پرۆگرامی پێغەمبەرە ((ﷺ)) ..

کابرایەك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر .. پێغەمبەر تەماشای کرد.. واسەیر دەکات جل وبەرگی کۆن ورزیون.. پرچی ئاڵۆزو لێکهاڵا بوو..

بۆیە پێغەمبەر((ﷺ)) بیری کردەوە ئامۆژگاری بکات بۆ ئەوەی خۆی ڕێکوپێك بخات.. بەڵام پێغەمبەر((ﷺ)) لەوە ترسا کە ئەو کابرا هەژارو بێ پارەو پول بێت..

پێغەمبەر((ﷺ)): ئایا ماڵ وسامانت هەیە؟ کابرا: بەڵێ ...پێغەمبەر((ﷺ)): لەچ جۆرە ماڵ وسامانێك..؟ کابرا: لە هەموو جۆرەکانی سەروەت وسامان.. لە حوشتر.. ئەسپەکان.. مەڕو ماڵاتەکان....

پێغەمبەر((ﷺ)): ئەگەر خودا ماڵێکی پێدایت با بەهرەو نیعمەتەکانی بەسەرتەوە ببینێت.. لە ساڵی هاتنی نوێنەرەکان بۆ خزمەت پێغەمبەر((ﷺ)).. خەڵکانێك دەهاتن بۆ موسوڵمان بوون.. خەڵکانێکی موسوڵمانیش دەهاتن بۆ فێر بوون.. خەڵکانێکیش بۆ سۆزدان بە پێغەمبەر((ﷺ)) لەسەر ئایین وتێکۆشان.. کەسانێك هاتن نزیکەی دوانزە کەس بوون..بەبێ سەلام کردن دانیشتن..

**پێغەمبەر((ﷺ)): ئایا ئێوە موسوڵمانن؟ وەفدەکە: بەڵێ ..پێغەمبەر((ﷺ)): خۆزگە سەلامتان بکردایە؟ ئەوانیش هەستانەوەو دەستیان بە سەلام کردن کرد بەوەی وتیان سەلامی خودات لێ بێ ئەی پێغەمبەری خودا((ﷺ))پێغەمبەرﷺ: وعلیکم السلام .. فەرمووی:دانیشن: ئەوانیش پرسیاری کاتەکانی نوێژیان کرد.. مەبەست ئەوەیە پێغەمبەر((ﷺ)) لەخۆیانی پرسیەوە ئایا سەلامتان کرد یان سەلامتان نەکرد.لە کاتی عومەری کوڕی خەتابدا.. سەعدی کوڕی باوکی وەقاسی کرد بە گەورەو بەرپرسی کوفەییەکان..چیرۆکەکە..خراپترین گومانە کە گومانی بێ بنەما ببرێت ..**

فەرموودە: (بەسە بۆ مرۆڤ کە بە درۆزن بژمێردرێت کاتێك هەرچی گوێی لێ بێت بیگێڕێتەوە..

| Lash me with kindness | إجلدني بالرفق |
|---|---|

## دارکاریم بکە بەڵام بەلەسەرخۆیی!!

واتای **ئەوە نییە کە ئێمە هەرگیز رەخنەمان نەبێت.. نەخێر.. زۆر جاری وا دەبێت پێویستیت بەوە دەبێت رەخنەو سەرزەنشتی خەڵکانی بەرامبەرت بکەیت.. منداڵت.. خێزانت.. برادەرت..**

**بەڵام دەتوانرێ دوابخرێت بۆ کاتی پێویستتر.. یان بەکارهێنانی شێوازی تایبەتی تر و ئاسانتر..**

**کابرا سەرزەنشت پێکراو دەرفەتی بدە با ئارەقی ناوچاوانی هەڵگرێتەوە..**

**لەدوای رزگارکردنی شاری مەککە پێغەمبەر((ﷺ))و هاوەڵانی زۆر پلەو پایە بەرز بوون لەناو عەرەبەکاندا.**

**خەڵکی بە شەپۆل دەهاتنە ناو ئایینی ئیسلام..**

نزیکترین جەنگیش وا لە ڕێیە جەنگی حونەین بۆ ئەوەی باوەڕدارەکانی نویێ بە ئەزوممونـدا زۆربە ی هاوەڵن ئەوانەی واتازە مسوڵمان بوون لەناخی خۆیانا هەستیان بەدەسەڵات زۆری وگەورەییی خۆیان دەکرد ئاواتەخوازی جەنگێك بوون ..

بۆئەوەی ئەوانیش بیسەلمێنن کەتێکۆشەرن هەندێك لەدەروونی خۆیانا هەستیان بەبایبوون دەکرد ..

بەڵام خودای گەورە کارێکی لێبەسەرهێنان تەنها چەندکەسێك نەبێت ما بەچواردەوریی پێغەمبەروە((ﷺ)) ..

دووبارە خودای گەورە سەرکەوتنی هێنایەوە ئەم حاڵەتە خودا ئامـاژەی پێکـردووە لەقورئاندا...

پێغەمبەر((ﷺ)) بەلای ئافرەتێکدا تێپەڕدەبێ فەرمووی: (اتقي الله واصبري ( واتە لەخودا بترسە.)فقالت اليك عنى)).

(ئەوێش وتی: تۆبڕۆ بەولاوە)( فانك لم تصب بمصيبتى)

واتە( تۆبەڵای منت لێبەسەرنەهاتووە )نەیزانی ئەوە پێغەمبەرە ((ﷺ)) بۆیە لە پاشاندا هاتەوە

خزمەت پێغەمبە ر((ﷺ)) داوای لێبوردنی کردبەڵام پێغەمبەر((ﷺ)) فەرمووی:(( انما الصبر عند الصدمه الاولى ))[1] ،

واتە :(( دان بەخۆ داگرتن لەکاتی لێکدانی یەکەم جاردایە))،

هەر کەسێ خۆی بگرێتەوە لەکاتی ڕوو داوە دژوارەکان و لەکاتی زۆر خۆشی و شادیدا، شیاوی ئەوە دەبێت بگاتە پلەی جێگیر بوون ، پلەی تیر بوون لە زانستەکان.

---

[1] متفق عليه بڕوانە (رياض الصالحين ) باب الصبر.

((تەنانەت کوشتن وسەربڕینیش بە لەسەر خۆیی بێت..))

((ان الله كتب الاحسان على كل شيء فاذا قتلتم فاحسنوا القتلة واذا ذبحتم فاحسنوا الذبحة))..

واتە: ((خودا چاکەی لە سەر هەموو شتێك فەرز کردووە ئەگەر کوشتنتان کرد بە چاکی بکوژن، ئەگەر سەربڕینتان کرد بەچاکی سەربڕین بکەن))..

فەرمووده..

| Dias pear From pro6lems | تـوارعن المشكلات |
| --- | --- |

## خۆت لە گرفتەکان بشارەوە!!

ئەگەر بچێتە تاقیگە ئەو کات دەزانێ چەندە کێشە وگرفتی لەلاشەی خۆیدا هەیە.. کەمترینیان پاڵەپەستۆی خوێن.. شەکرەیە!! چونکە ئەو هەژارە هەردەم لە سزادانی خۆیەتی لەبەر ئەوەی داوای مرۆڤی نموونەیی دەکات.. هەردەم دڵی تەسکە بەرامبەر خێزانەکەی.. چونکە فلان قاپی تازەی لە دەست بەربووەوەو شکا..

ئەوەی لەبیرچوو هۆڵەکە گسك بدات..

بە وتوکردنەکەی کراسە جوانەکەی لێ سووتاندم.. منداڵەکانی.. تا ئێستا خالیدی کوڕی خشتەی بیرکاری لەبەر نەکردووە..

کامەرانی ..کوڕی هێشتا نەگەیشتووەتە پلەی زۆر نایاب.. بەڵام ساراو گوڵاڵەی کچی هەر مەپرسە.. ئەمە حاڵ وشێوازیەتی لەماڵدا.. بەڵام لە نێوان دۆست وبرادەرانی.. ئەوا هەر زۆر گەورەترە وکار لەکارترازاوە..

فلان کەس کاتێك باسی چاوچنۆکیی کرد مەبەستی من بووە..! باوکی ئەحمەد کاتێك باسی سەیارەی خۆیی کرد مەبەستی من بوو.
بەڵێ مەبەستی سەیارەکەی من بوو.. بەڵێ سەیری منی دەکرد.. هتد.. هەتا دوایی.. هەڵوێست وبیروبۆچوونەکانی ئەم کابرا هەژارە..
قسەیەکی نەستەق هەیە دەڵێت: ((ئەگەر خەڵکی لەگەڵت هاتن یان تۆ لەگەڵ ئەوان بڕۆ..))کابرایەکی دەشتەکی بوو بەبرادەرم زۆرجار دەهات بۆ لام ئەم رستەیەی بۆ دووبارەدەکردمەوە.. دەیوت: (( ئەو دەستەی کە ناتوانی بیچەمێنێتەوە تەوقەی لە گەڵ بکە.. ئەمەش ئەگەر بەوردی بیری لێ بکەینەوە..)). راستە.. ئەگەر ئێمە خۆمان رانەهێنین

ئەوەی لێبوردووییمان هەبێت .. شتەکان بەسادەیی و ساویلکەییەوە بەڕێ بکەین.. یان بە واتایەکیتر خۆمان لە زۆر شت چاوپۆشی وخۆلە گێلی بدەین.. خۆمان نەخنکێنین لە راڤەکردن وگومان بردندا.. ئەگەر وانەبێت ئەوا ئێمە خۆمان تووشی ماندوبونێکی زۆر زیاد دەکەین..
گەنجێك دێتە لای مامۆستاکەی خۆی دەڵێت: ((مامۆستا یارمەتیم بدە بۆ ئەوەی هاوسەری ژیان بۆ خۆم دابێنم هەتا مردن لەگەڵم بێت.. مامۆستاکە: مەرجەکانت چییە..؟ گەنجەکە: رووی جوان بێت.. بالاَ بەرزبێت.. پرچی ئاوریشم بێت.. بۆنی میسکی بێت..
خواردنی خۆش بێت.. قسەی بە تامو بە لەزەت بێت.. ئەگەر تەماشام کرد دڵم پێی خۆش بێ.. ئەگەر لەوێ نەبووم بم پارێزێ.. بەهیچ شێوەیەك سەرپێچی فەرمانم نەکات..
لە هیچ خراپەیەکی نەترسم.. ئاینی بەرزی کردبێتەوە..دانایی سوودی پێ گەیاندبێت!! بەردەوام بوو لە باسکردنی مەرجەکانی.. مامۆستاکەش.. پێی وت: کوڕم ئەوەی تۆ دەتەوێ من پێی دەزانم لەکوێ دەستت دەکەوێ..! گەنجەکە: لە کوێ؟ مامۆستاکە: لەبەهەشتدا بە ئیزنی خودای گەورە.. بەلاَم لە دونیادا ئەبێت خۆت لەسەر لێبوردەیی رابهێنیت..بەڵێ خۆت رابهێنیت لەسەر لێبوردەیی..
ئەشکەنجە وسزای خۆت مەکە بەوەی بگەڕێیت گرفتەکان درووست بکەیت.. کێشەکان لەچواردەوری درووست بکەیت.. کابرا قسە بکات تۆ خۆتی لێ تووڕە بکەیت مەبەستت منە؟ رۆژێك بە رووی منداڵەکەتەوە دەڵێیت: تۆ دەتەوێ بە تەمەڵییەکەت من شەرمەزار بکەیت؟ رۆژێك لە رووی خێزانەکەتەوە دەڵێت: تۆ بە ئەنقەست ماڵت فەرامۆش کردووە؟.. بەرنامەو پەیرەوی پێغەمبەر((ﷺ)) ((پێکەوە ژیان)) بووە.. خۆشی وچێژی لە ژیانی خۆی دەکرد..

دەهاتەوە ماڵێ لەکاتی چێشتەنگاودا..
پرسیاری دەکرد ئایا خواردنێك ئامادەیە بیخوات؟ خێزانەکان: نەخێر پێغەمبەر ((ﷺ)): کەواتە ((ئەمڕۆ بەڕۆژوو دەبم..)).
نەئەهات کێشەو پێشەو گرفت دروست بکات لەبەر ئەوەی کە خواردن دروست نەکراوە یان ئامادە نییە.. نەیئەوت: بۆچی خواردنتان دروست نەکردووە.. ئەی بۆچی پێتان نەوتم بۆ ئەوەی شتی پێویست بکڕم.. تەنهابە (( کەواتە من ئەمڕۆ بەڕۆژوو دەبم..)).کۆتایی بە مەسەلەکە دەهێنا.. هەڵسوکەوتی پێغەمبەر((ﷺ)) لەوپەڕی دان بەخۆداگرتندا بوو.. زۆر لەسەر خۆ دەژیا لەگەڵ خەڵکدا..(کە لثومکوڕی ئەلحصین).. کابرایەکی چاك بوو لەناو سەحابەکاندا..

خۆی دەڵێت : ((لە تێکۆشانێکدا لەگەڵ پێغەمبەر((ﷺ)) دابووم ولاخەکەم نزیك ولاخەکەی پێغەمبەر((ﷺ)) دەبووەوە منیش هەر دوورم دەخستەوە نەوەك پێغەمبەر((ﷺ)) ئازار بخوات بەوەی ولاخەکەم بچێتە سەر ڕێگەی ولاخی پێغەمبەر ((ﷺ))دەڵێت: ((من خەو بردمیەوە سوارییەکەم چووە سەر ڕێگەی سوارییەکەی پێغەمبەر((ﷺ)) پێم بەپێی پێغەمبەر((ﷺ))کەوت.. کە گەرمای لاشەی سواریەکە بەپێی پێغەمبەر((ﷺ)) کەوت ئازاریدا کاتێك گوێی لە ئازاری پێغەمبەر((ﷺ))بوو یەکسەر بەهۆش هاتەوە حاڵی تێکچوو گوتی ئەی پێغەمبەری خودا((ﷺ)) داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە..

پێغەمبەر((ﷺ)) بەهەموو لێبوردەیی ودڵ فراوانییەکەوە فەرمووی: (( ڕێی خۆت بکە ڕێی خۆت)). واتە :هیچ لە دڵی خۆت مەگرەو وەك هیچ لە ئارادا نەبووبێ..بەڵێ بڕۆ.. هیچ کێشەو گرفتێکی دروست نەکرد.. وەك ئەوەی بڵێت بۆچی جێگەم پێ لێژ دەکەیت جێگەم لێ تەسك دەکەیتەوە؟ نەیفەرموو: (( ڕێگە فراوانە چی وای لە تۆ کردووە کە خۆت بدەیتە پاڵی منەوە!؟.. نەخێر خۆی پێوە ماندوو نەکرد.. لێدان وپێکەوتنێکی بێ مەبەست بوو.. تەواو .. بەڵێ ئەمە شێوازی هەڵسوکەوتی پێغەمبەر((ﷺ))بوو بۆ هەردەم و هەر کاتێك..

جارێك پێغەمبەر ((ﷺ)) لەناو هاوەڵانی دابوو ئافرەتێك پارچە قوماشێکی بەدیاری دووری بوو بۆ پێغەمبەر ((ﷺ))داوای کرد کە پێغەمبەر((ﷺ)) بیپۆشێت.. پێغەمبەر((ﷺ))

وەریگرت ویەکسەر چووە ماڵی خۆی ولەبەری کرد و هاتەوە ناو هاوەڵانی ئەو قوماشەی لەبەر دابوو کە بە دیاری بۆی هێنرابوو..

کابرایەك لە هاوەڵانی وتی: ئەی پێغەمبەر((ﷺ)) .. ئەو پۆشاکەی کە بە دیاری بۆ تۆ هاتووەو ئێستا لە بەری تۆ دایە بەمنی ببەخشە.. پێغەمبەر((ﷺ)): بەڵێ: باشە .. یەکسەر پێغەمبەر((ﷺ)) گەڕایەوە ماڵەوەو پۆشاکەکەی لەبەری خۆی داناو.. هەمان پۆشاکی کۆنی خۆی لەبەر کردەوەو پۆشاکە تازەو نوێیەکەی بەخشی بە کابرا.. لەپاشاندا خەڵکی بە کابرایان وت: شتێکی چاکت نەکرد.. بەوەی داوای ئەو پۆشاکەت کرد لە پێغەمبەر((ﷺ))لەکاتێکا کە تۆ دەزانیت پێغەمبەر((ﷺ)) داواکردنەکان پەرچ ناداتەوە؟! کابراش وتی:

((سوێند بەخودای گەورە.. هیچ مەبەستێکم لەداواکردنەکە نەبووە تەنها بەهیوای ئەوە نەبێت کە ببێتە پۆشاکی مەرگم.. منی پێ کفن بکرێت کاتێك کە دەمرم..)).

کاتێـك وەفـاتی کـرد لـەو پارچـە قوماشـەدا ناشـتیانئۆخەی چـەندە لـە ئـامێز گـرتنی پێغەمبەر((ﷺ)) بۆ داواکانی خەڵکی وپێدانی هەمووو شێوازێکی سۆزداری پێغەمبەر((ﷺ))

..

ڕۆژێـك پێغەمبـەر((ﷺ))لـەناو مزگەوتـدا بـوو بـۆ نوێـژی عیشا حەسـەن وحوسـێن دوو منداڵ بوون خۆیان بەناو مزگەوتدا..

یەکسەر بەرەو باپیریان چوون کە پێغەمبەر((ﷺ))لە نوێژی عیشادا بوو.. هەردووك چوونە سەر پشتی پێغەمبەر ((ﷺ))..

کاتێك هەڵئەستایەوە بەهێواشی لەخۆی دورئەخستنەوە.. دەیخستنە سەر پشتی لە کاتێکدا کـە سـەری لەسـەر سوجدە بوایـە کاتێـك بـەپێوە راوەسـتایە ئـەوانی لەلایـەك دادەنـا.. کاتێـك دانیشتایە بۆ تەحیات خوێندن ئەوانی لەسەر چۆکی خۆی دادەنا لەپاشاندا باوکی هورەیرە دەڵێت بیانبەوە بۆلای دایکیان پێغەمبەر پەلە نەبوو لەبردنەوەیان هەتا تێر بوون لە یاری کردن لەپاشاندا خەریك بوو باران بباریێت ناردنیەوە بۆلای دایکیان..

لە رۆژێکی تردا بەهەمان شێوە هاتن و چوونە سەر پشتی پێغەمبەر پێغەمبەریش((ﷺ)) زۆر لەسەر سوجدە دەمایەوە بۆ ئەوەی نەکەونە خوارێ و ئازاریان پێ نەگات لەپاشاندا هاوەڵانی لە پێغەمبەریان پرسی تۆ زۆر لەسەر سوجدە مایتەوە هیچ جارێك ئەوەندە نەمایتەوە..!!

ئایا خودا فەرمانی پێداوی؟ یان نیگات بۆ هات؟

پێغەمبەر((ﷺ)) فەرمووی: (( نەخێر هیچیان لەئەوانە نەبوو.. بەلأم ئەو دوو کوڕەم لەسەر پشتم بوون منیش حەزم نەکرد پەلەیان لێ بکەم.. هەتا خۆیان دێنە خوارێ ..رواەالحاکم فی المستدرك .

جارێك پێغەمبەر ((ﷺ))دەچێتە ماڵی پووری خۆی ئوم هانيء ..

برسی دەبێ دەفەرمووێ : ((ﷺ)) ((ئەی دایکی هانیء هیچ خواردنێکت هەیە کە بیخۆین؟ .))

ئەویش گوتی تەنها چەند پارچە نانێکم هەیە وشەرم دەکەم بیخەمە خزمەت تۆ ئەی پێغەمبەر((ﷺ))..فەرمووی: ((بیهێنە..منیش هێنام وپارچە پارچەم کردو بەئاو نەرمی کردەوە دەستی بە خواردن کرد.. ))لە پاشاندا.. فەرمووی((ﷺ)) (( ئەی دایکی هانیء هیچ شتێکی شلەمەنی نییە؟ )).

وتم تەنها هەندێك سرکەمان هەیە..فەرمووی: بیهێنە..

کاتێك هێنای بەسەر نانەکەیدا پرشاندو لێی خوارد سوپاسی خودای کرد فەرمووی ((ﷺ)): ((چاکترین شلەمەنی سرکەیە)) . اصله من الصحیحین

جابری کوڕی عەبدوڵلا دەفەرمووێت: (( لە شەونوێژدا چوومە لای چەپی پێغەمبەرەوە راوەستام.. بەلأم پێغەمبەر بەنەرمی منی خستە لای راستی خۆیەوە.. ئەمە لە شەو نوێژدا بوو.. ئەوەندەی پێنەچوو هەتا جابری کوڕی سەخر هات.. دەستنوێژی گرت هاتە لای چەپی پێغەمبەرەوە ((ﷺ))بەنەرمی دەستی هەردووکمانی گرت خستینیە پاش خۆیەوە وەك نوێژی جەماعەت.

لە رۆژێکدا دایکی قیس منداڵێکی هێنا بۆ ئەوەی پێغەمبەر گۆشی بکات ودوعای بۆ بکات.. پێغەمبەر لێی وەرگرت لەباوەشو ئامێزی خۆی داینا..

زۆری پێ نەچوو هەتا منداڵەکە میزی کرد بە کۆشی پێغەمبەردا کراسەکەی پێغەمبەر بەمیزی منداڵەکە تەڕ بوو.. پێغەمبەر لەوە زیاتری نەکرد تەنها ئەوەندە نەبێ داوای هەندێك ئاوی کردو لە میزی پرشاندو خاوێنی کردەوەو تەواو.. هیچی تر..

نەتورە بوو.. نەڕووی دا بەیەکدا.. ئەی ئێمە بۆچی خۆمان تووشی ئێش وئازار دەکەین مێش دەکەین بەگامێش.. مەرج نییە هەموو لەدەوروبەرت لە ١٠٠٪ بەدڵی تۆ بێ..

وان تجد عيبا فسد الخللا --- جل من لا عيب فيه وعلا

ئەگەر نەنگیت دی کەلێن پڕ بکەوە..

گەورەی بۆ ئەو خودایەی بێ نەنگی دەمینێتەوە..

هەندێك ئەعسابی خۆیان دەسوتێنین.. کاروبار گەورەتر دەکەت لە قەبارەی خۆی..

بەهەمان شێوە هەندێك لەدایکان بەم شێوەیەن لەوانەشە هەندێك لە مامۆستایانیش بەهەمان شێوە بن ..مەگەڕێ بە دوای هەڵەو نەنگییەکاندا کە نادیارن..

بەڵکو دڵفراوان بە عوزری خەڵکانی تر وەربگرە..

بەتایبەت ئەو کەسانەی کە داوای لێبوردنت لێدەکەن بۆ ئەوەی خۆشەویستیی ئەوان بۆ تۆ بمینێت.. نەك بۆ بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆت..

اقبل معاذير من ياتيك معتذرا     ان بر عندك فيما قال او فجرا

فقد اطاعك من يرضيك ظاهر     وقد اجلك من يعصيك مستترا

واتە :((پەسەندی بکە داوای لیبوردنی کەسێك کە داوای لێبوردنت لێ دەکات...

چاکە ئەوەیە لەلای تۆ بیڵێیت بەچاك یان بەخراپ...

ئەوە بەقسەی تۆی کردووە هەرکەسێك بێت تۆ لەخۆی رازی بکات..

رێزی لێ گرتووی کە بەنهێنی تۆ سەرپێچیت لێ بکات...)).

بەڵێ بە دوای هەڵەدا مەچۆو شوێن عەیب ونەنگییەکانی مەکەوە.. دڵ کراوەو دڵ فراوانبە ..

هەردەم پێغەمبەر((ﷺ)) سوور بووە لە سەر ئەوەی کێشەو بێشە نەورووژێنێ:

بۆیە هەردەم لە گەڵ هاوەڵانی بەدڵنیایی و ئارامییەکەوە ودڵپاکییەوە دادەنیشت فەرمووی((ﷺ)) بەهاوەڵانی: ((الا لايبلغني احد منكم عن احد من اصحابي شيئا.. فاني احب ان اخرج اليكم وانا سليم الصدر.))ابو داود الترمذي فيه مقال.

واتە: ئاگادار بن هیچ کەس لە ئێوە هیچ شتێك دەربارەی هاوەڵانم پێنەگەیەنێ.. بەراستی من حەز دەکەم بێمە ناو ئێوە دڵ ودەروونم ساغ و تەندروست بێ لەئاست ئێوەدا..

ئەو تۆزە لەسەر خۆت هەڵ مەکە کە خۆی خەوتووە..
ئەگەر تۆزو خۆڵەکە پەرش و بڵاو بوو ئەوا تۆ لووتی خۆت بگرە بە دامێنی کراسەکەت.. چێژو خۆشی لە ژیانی خۆت وەربگرە..

## دان بە هەڵەی خۆتا بنێ.. نکۆڵی لێ مەکە..

زۆرێك لە کێشەکان کە لەوانەیە چەند ساڵێکی پێ بچێت مانەوەی ئەو کێشەیە بێت..
لەوانەیە هەموو تەمەن لەسەری.. چارەسەرەکەی ئەوەیە کە کەسێکیان بەئەوی تریان بڵێت: من هەڵەم.. داوای لێبوردن دەکەم..
لەمەوعیدەکەی خۆتا نەڕۆیشت و.. یان قسەیەکی قورس وگرانت کردووە.. یان وشەیەکی ڕەق ودڵتەزێنت کردووە.. پەلە بکە بۆ کوژاندنەوەی شەڕ و خراپییەکەی، پێش ئەوەی ئاگرەکەی خۆش بێت..
من داوای لێبوردنت لێدەکەم.. مافت بەسەرمەوەیە.. ئەوەی دڵی تۆی پێ خۆش بێت هەر ئەوە دەکەم.. چەندە جوانە کە ئێمە فێربین.. گوێ بیستی ئەم جۆرە دەربڕینانە بین لە خۆمان ولە خەڵکیشەوە..
کێشەیەك دەکەوێتە نێوان باوکی ذر وبیلال.. ڕەزای خودایان لێ بێ.. ئەوانیش هەردووکیان هاوەڵن بەڵام هەر مرۆڤیشن..ابو ذر توڕە دەبێ.. بەبیلال دەڵێت: (( بڕۆ بەولاوە ئەی کوڕی

ئافرەتــە رەش پێــستەکە.. بــیلال ســکاڵای خــۆی دەباتــەوە بــۆ لای پێغەمبــەر..
پێغەمبەر((ﷺ))بانگێشەی باوکی ذەر دەکات دەفەرمووێت:(( ئایا جنێوت داوە بە بیلال..؟
باوکی ذەر.. بەڵێ:
پێغەمبەر((ﷺ)): ئایا بەناوی دایکییەوە قسەت پێ وت؟
باوکی ذەر: هەر کەس جنێو بدات.. بەباوکو دایك جنێو دەدات ئەی پێغەمبەری خودا ((ﷺ))
پێغەمبـەر((ﷺ)): ((انـك امـروء فيـك جاهليـة ..))واتـە تـۆ کابرایـەکی هەندێ شتی نـەفامی ونەزانیت تیادایە..بۆیە رەنگی باوکی ذەر گۆڕاو وتی: ئایا لەم تەمەنەمدا..؟
پێغەمبەر((ﷺ)): بەڵێ..
لەپاشاندا پێغەمبەر((ﷺ))پەیڕەوێکی پێدا کە هەڵسوکەوت بکات لەگەڵ ئەو کەسانەی کە کەمترن لە ئەو لە پلەو پایەدا فەرمووی: (انما هم اخوانكم.. خولكم.. جعل الله تحت ايديكم.. فمن كان اخوة تحت يديه.. فليطعمه من .. وليلبسه من لباسه.. ولا يكلفهم ما يغلبهم أي مالا يطيقه.. فان كلفه ما يغلبه فليعنه عليه.. مسلم مختصرا.
واتە : ئەوانە برای خۆتانن.. خوای گەورە ئەوانی خستۆتە ژێر دەستی ئێوە.. هەرکەسێك لە ئێوە براکەی لە ژێر دەست بوو.. با لەو خواردنەی کە خۆی دەیخوات پێی ببەخشی.. لەو پۆشاکەی خۆی دەیپۆشێ ئەوی پێ بپۆشێ.. فەرمانی شتێکی بەسەردا نەدات کە نەتوانێ بۆی بەجێ بهێنێ.. ئەگەر فەرمانی شتێکی پێدا کە نەتوانێ بۆی جێبەجێ بکات.. با کۆمەکی لەگەڵ بکات..)).
باوکی ذەر چی کرد؟!چوو بۆ لای بیلال.. کاتێك پێی گەیشت..
(( داوای لێبـوردنی لێکـرد.. لەسـەر زەوی دانیـشت.. لـەنێوان هـەردو دەستو پێـی بیلالـدا.. لەپاشاندا روومەتی خۆی لەسەر زەوی داناو بە بیلالی ووت: ئەی بیلال.. پێ لەسـەر روومـەتم دابنێ..)).
ئاوا بوون هاوەڵانی پێغەمبەر ((ﷺ)) لەسوربوونیان لەسەر کوژاندنەوەی دوژمنایەتی پێش ئەوەی گڕو کڵپە بسێنێ. ئەگەر گڕو کڵپەی هەستا نەیانئەهێشت زیاتر تەشەنە بسێنێ..
لەنێوان(( ئەبوبەکر وعومەردا))(( رەزای خودایان لێ بێ)) گرفت و کێشەیەك دروست بوو.. ئەبوبەکر تووڕە بوو.. عومەر بەجێی هێشت.. کاتێك ئەبو بەکر زانی عومەر تووڕە بوو داوای لێبوردنی لێکرد.. بەڵام عومەر گوێی بۆ نەگرت ئەبوبەکر بەدوای عومەر چوو بۆ ئەوەی گەردن

ئازایی پێ بکات..بەڵام عومەر هەر ئاوڕیشی بۆ نەدایەوە.. هەتا خۆی کرد بەماڵەکەی خۆیداو دەرگای لە سەر رووی ئەبوبەکر داخست.. ئەبوبەکر گەڕایەوە..بۆ خزمەت پێغەمبەر کە لە دوورەوە هات پێغەمبەر((ﷺ))ئەبوبەکر شتێکی کردو هاتە خزمەت پێغەمبەر((ﷺ))لە تەنیشت پێغەمبەر دانیشت.. بێ دەنگ بوو رووی سوور بوو بووەوە..عومەریش بیری کردەوە کە هەلە بوو..داوای لێبوردنەکەی ئەبوبەکری پەسند نەکردووە.. بۆیە پەشیمان بووەوە چونکە دڵیان خاوێن وبێ لەکە بوو..

بەدوای ئەبوبەکردا رۆیشت هەتا چووە خزمەت پێغەمبەر((ﷺ))سەلامی کردو دانیشت لەلا شانی پێغەمبەر((ﷺ)) هەواڵەکەی بە پێغەمبەر((ﷺ)) راگەیاند.. باسی ئەوەشی کرد کە چۆن داوای لێبوردنەکەی ئەبوبەکری پەسند نەکردووە!!بۆیە پێغەمبەر((ﷺ)) زۆر تووڕەبوو: کاتێك ئەبوبەکر پێغەمبەری((ﷺ))دی تووڕە بوو..

دەیوت ئەی پێغەمبەری خودا((ﷺ)) سوێند بەخودا من ستەمم لە عومەر.. من ستەم کار تر بووم.. من ستەم کار تر بووم..

پێغەمبەر((ﷺ)) (( هل انتم تاریکون لي صاحبي؟ هل انتم تارکون لي صاحبي؟))واتا: هەتاکەی ئێوە ئەم هاوەڵەم بۆ ناهێڵنەوە؟ ئایا ئەم هاوەڵەم بۆ دەهێڵنەوە؟.

((ان قلت: اني رسول الله اليكم جميعا.. فقلتم: كذبت.. وقال ابو بكر صدقت..)).

واتە: من وتم پێغەمبەری ((ﷺ))خودام بۆ هەمووتان بە تێکڕا.. ئێوە لە وەڵامدا وتتان: درۆت کرد.. ئەبوو بەکر وتی راست دەکەیت..ئاگادار بە: بەو شێوەیە نەبێت خەڵکی چارەسەر بکەیت خۆت تێك بدەیت.. وەك چۆن گوێ درێژ لەناو خەرماندا گێرەی پێ دەکەن..ئەگەر تۆ لە جێگەیەکی وابووی کە خەڵك رێنموویی و چاو لەتۆ بکەن..

وەك مامۆستایەك لەگەڵ قوتابیان و خوێندکارانی.. باوکێك لەگەڵ منداڵەکانی.. یان دایکێك.. بزانە تۆ لەژێر چاودێریدای..هەموو خەڵك چاویان لەتۆ بڕیوە..

هەردەم هەوڵی ئەوە بدە رێك و پێك بیت لەو پەڕی توانایی خۆتدا..بەهەمان شێوە ژن و مێردەکانی لەگەڵ یەکتردا.. عومەر دەستی کرد بە دابەش کردنی پارچە پارچە قوماش بۆ هەر کەسێك لە هاوەڵان و خەڵکانی شاری پێغەمبەر ((ﷺ))کاتێك چووە سەر مینبەر لە یەکەم وتاردا فەرمووی: ((ان الله كتب لي عليكم السمع والطاعة..))واتە: خودا فەرزی کردووە ئێوە بە

قسەی من بکەن وەك لێپرسراوتان بەسەر خۆتانەوە بەجێ بهێنن ..کابرایەك هەستاو وتی: نە گوێت بۆ دەگرین نە قسەشت بەجێ دەهێنین..عومەر وتی: بۆچی؟
کابرا: چونکە تۆ هەر کەس لە ئێمە یەك پارچە قووماشت پێ داوە بەڵام تۆ خۆت دوو پارچە قووماشت هەڵگرتووە..عومەر بەناو خەڵکەکەدا چاوی گێڕا وەك ئەوەی بۆ کەسێك بگەڕێت..
کاتێك چاوی بە عەبدوڵڵای کوڕی خۆی کەوت وتی: هەستە ئەی عەبدوڵڵا.. ئەویش هەستا..عومەر: وتی: ئایا تۆ بەشە قوماشەکەی خۆتت بەمن نەدا بۆ ئەوەی وتاری پێ بخوێنم؟عەبدوڵڵا: بەڵێ..کابرا دانیشتەوە وتی: ئێستا گوێت بۆ دەگرین و بە قسەشت دەکەین..
کێشەکەش تەواو بوو..بەرێزەکەم پەلەم لێ مەکە.. بەڵێ من لەگەڵتم کە شێوازی هەڵسوکەوتی کابرا رەق بوو.. کاتێك رەخنە لە عومەر بگرێت لەناو ئەو هەموو خەڵکە..
لە جێی خۆی نەبوو بەڵام ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئەوەبوو عومەر چۆن توانی ئەو هەڵوێستە بقۆزێتەوە و توانای هەڵگرتن و وەرگرتنی بکات.. ئاگرەکەش بکوژێنێتەوە..؟
لەدوایدا..ئەگەر ئەتەوێ خەڵکی روو لە تۆ بکەن تێبینیەکانت بەهەندو پەسەند وەرگرن.. بە ئامۆژگارییەکانتەوە.. هەر کێ بن لە هەر کوێ بن.. خێزان.. منداڵت.. خۆشك..برا.. خەڵکانی تر بەتێکڕا.. تۆ خۆت ئامۆژگاریی ئەوان بە هەند و پەسەند وەرگرە و بزانە.. خۆت بە گەورە مەزانە..
کابرایەك هەردەم بە خێزانەکەی دەوت: چاودێری منداڵەکان بکە زیاتر.. خواردنی چاکتر درووست بکە.. هەتا کەی پێت بڵێم هۆدەکە رێکخەرەوە..
خێزانەکەش هەردەم بە رووخۆشییەوە دەیوت: خەمت نەبێت هەر ئێستا ئەو فەرمانانەت بەجێ دەهێنم.. فەرمانی تۆیە و بەجێیە..ئافرەتەکەش رۆژێك بەپیاوەکەی وت: وەك ئامۆژگاری و وەبیرهێنانەوەیەك: منداڵەکانت لەکاتی ئەزموونەکاندا پێویستییان بەوە هەیە تۆ لە ناویاندا زیاتر بمێنێیتەوە..
ئەگەر چوویتە دەرێ بۆ ناو برادەرەکانت.. منداڵەکانت لەبیر نەچێ..
هەرکە ئەم قسەیەی گوێ لێ بوو هاواری لێ بەرزبووەوەو: من خۆم چۆڵ و بەتاڵ و بێ کار نەکردووە بۆیان.. هەتا دوا بکەوم یان دوانەکەوم.. ئەمە ئیش و کاری تۆ نییە بەسەر مندا بیسەپێنی.. هیچ خۆت هەڵ مەقورتێنە ئیش و کاری منەوە!! .

توخودا سوێندت دەدەم بەخودای گەورە پێم بڵێ: چۆن دەتەوێ لە دوای ئەو هەڵوێستەت نافرەتەکەت بە قسەت بکات!!..لە کۆتاییدا.. زیرەك و هۆشمەند ئەوەیە کەلێن و درزەکانی دیواری ماڵەکەی خۆی بگرێت و دابخات و بۆئەوەی کەس چاو لەماڵ و خێزانی ئەو نەبڕێت..
مەبەست ئەوەیە.. دەرفەتی گومانی خەڵك لەسەر خۆی نەهێڵێت..
بانگێشە کراین بۆ بەستنی هەندێك کۆڕ لەسەر کاروباری بانگەوازی لە وڵاتی ئەلبانیا..
سەرۆکی دەزگاکان و سەنتەرەکانی بانگەواز خوازی لەوێ کابرایەکی بێ ردێن بووهەندێك برادەر سەرنجیان دا..چۆن ئەبێ سەرۆکی باڵای بانگەوازەکان لەوڵاتی ئەلبانیا بێ ریش بێت؟!
کابرا هەستی کرد بەوەی لە هەندێك برادەر تێبینی بێ ریشییەکەی لێ دەکەن بۆیە یەکسەر

وتی: (( برام من خۆم کۆسەم نەکەن بچن لە دوای موحازەرەکان موحازەیەك لەسەر بێ ریشی من بدەن.. ئێمە دەستمان کرد بە پێکەنین و سوپاسی ئەومان کرد ئەو گومانە لە دڵی ئێمە بەرامبەر بە ئەو لایدا..
ئەگەر حەز دەکەیت با بگەڕێنەوە بۆ شاری پێغەمبەر(( ﷺ ))..
جارێك پێغەمبەر(( ﷺ )) لە ئیعتیکافدا بوو.. لەشەوانی رەمەزاندا.. صفیە خێزانی هاتە لای بۆ مزگەوت هەندێك بە یەکەوە دانیشتن..
لە پاشاندا هەستا بڕواتەوە بەڵام پێغەمبەر(( ﷺ )) حەزی نەکرد لەو تاریکی شەوەدا بە تەنها بڕواتەوە بۆیە لەگەڵی هەستاو بۆ ئەوەی بیگەیەنێتەوە ماڵەوە لە رێگە بەیەکەوە چوون.. دوو هاوەڵی ئەنساری کاتێك پێغەمبەریان(( ﷺ )) بینی و ئافرەتێکی لەگەڵە تۆزێك خێراتر چوون!
پێغەمبەر (( ﷺ )) فەرمووی: (( هێواش بڕۆن ئەوە صفیەی خێزانمە))..
ئەوانیش وتیان پاك و بێگەردی بۆ خودایە کە ئێمە گومان بە تۆ بەرین ئەی پێغەمبەری خودا (( ﷺ )) واتە: ئایا دەچێتە هۆشەوە کە ئێمە گومان بە تۆ ببەین ئەی پێغەمبەری خودا لەگەڵ ئافرەتێکی تری بێگانەدا بوو بی؟!!پێغەمبەر فەرمووی: ((ان الشيطان يجري من ابن ادم مجرى الدم.. واني خشيت ان يقذف في قلوبكما شراً..)) متفق عليه.
واتە:شەیتان بە دەمارەکانی مرۆڤدا دەچێت هەتا هەر شوێنێ کە خوێنی پێ بگات شەیتانیش دەگاتە ئەوێ.. منیش لەوە ترسام کە شتێك بخاتە دڵتانەوە و بۆ باوەڕتان خراپ بێت..

دلێری و ئازایەتی و نەبەردی و بوێری..

ئەمانە لە هیچ مرۆڤێکدا نییە ئەگەر بەردەوام ببێت لەسەر هەڵەکانی..بەڵکو مرۆڤی ئازاو لێهاتوو و بوێر و دلێر و نەبەرد و نەبەز ئەو کەسەیە دان بە هەڵەی خۆیدا بنێت..
بەلام بەمەرجێك هەرگیز و هەرگیز نەگەڕێتەوە سەر هەمان هەڵەی پێشوو.. بەهیچ شێوەیەك لە شێوەکان..

## بەستەی دارەکان لە یەك جیا بکەرەوە..!!

ئەگەر هاتوو هەڵەکە لەلایەن چەند کەسانێکەوە بوو.. پێویست وایە پێکەوە ئامۆژگارییان بکەیت..
بەڵام جاری وا دەبێت پێویستیت بەوە دەبێت کە کۆڕو بەستەکەیان لەیەك جیا بکەیتەوە.. هەر یەك بە تەنهایی ئامۆژگاری لێبکرێت..
بۆ نموونە چویتە ماڵی خۆتانەوەو برایەکت لەگەڵ چەند برادەرێکی خۆیدا رێکەوت لەسەر ئەوەی بەرنامە دابنێن بۆ ئەوەی بچن بۆ وڵاتێك ئەو وڵاتەش ناکرێت کەسێك بچێتە ئەوێ هەتا تووشی بەد رەوشتی نەبێت لەهەندێ لە شێوازەکانی ئامۆژگارییە..
ئەگەر تۆ قسەی خێری خۆت بکەیت بەجێیان بهێڵی..
بەڵام لەوانەیە زۆر سوود بەخش نەبێت جێی خۆی نەگرێت لەدڵیاندا بۆیە پێت چۆنە ئەگەر بەستەکە بکەیتەوەو دارەکان یەکە بەیەکە بشکێنیت..چۆن؟!
کاتێك هەر کەسەو بەرێ و شوێنی خۆیدا دەڕوات.. لەیەك جیادەبنەوە..

تۆ لەگەڵ ئەو کەسەیان دانیشە کە گومانی ئەوەی پێ دەبەیت لە ئەوانیتر هۆشمەند تر بێت
پێی بڵێیت.. ئەی فلان.. وام پێگەیشتووە کە ئێوە بە کاروانی دەچن..
تۆش لەوانی تر بەهۆشمەندتر دەزانم.. تۆیش دەزانیت ئەو وڵاتەی کە ئێوە نیازتان هەیە بۆی بچن کەم کەسێك دەتوانێ بە ساغی لە باوەڕو داوێنی لەوێ دەربچێت.. یان تووشی ئایدز دەبێت.. یان بەدرەوشتی ئەوان هەڵ دەگرێت..ئەی تۆ پێت چۆنە ئەو خێرە بۆ خۆت بکەیت ئەوان و خۆشت لەو ئەگەری خراپیە لابدەیت؟.. تۆیش پێشنیاری بۆ بکەیت کە بچن بۆ دەوڵەتێك دوورتر بێت لەو خراپەکاریانە..

بێ گومان ئەو ئەم ئامۆژگارییەی لە تۆ وەردەگرێت چونکە بەشێوازێکی جوان و رێك و پێك دەرت بڕی... ئەوا کەف وکوڵی چوونی بۆ ئەم وڵاتە ٥٠٪ دادەبەزێت..
بەهەمان شێوە بچێتە لای کەسی دووەم هەمان ئامۆژگاری و رێ بگرێتە بەر.. بۆ سێ یەمیش بەهەمان شێوە..
بەبێ ئەوەی هەست بکەین کەتۆ بەم کارە هەستاوی ئەو کات دەزانیت کە ئەوان دانیشتنەوە بۆ ئەم قسەو باسە..
کەسێکیان ئەوانی تر هان بدات ئەویتریان پێشنیار دەکات بۆ گۆڕینی شارەکە.. سەیر دەکرێت کەسی دووەمیش..
پاڵپشتی دەکرێت بەم شێوەیەش تۆ دەتوانی کێشەو خراپیەکە بنبڕ بکەی بە شێوازێکی گونجاوو رێکو پێك..
یان بۆ نموونە سەیر دەکەیت منداڵەکانت لەوانە کۆبونەوەیان لە ژوورێکدا بۆ ئەوە بێت سەیری فیلمێکی سیدی یان ڤیدیۆ کلیپ یان هەر شتێکی ناشیرین و ناگونجاو..
تۆیش ئەگەر ئەتەوێ ئامۆژگارییان بکەیت ئەوا هەر یەکە و بەجیا ئامۆژگاریی بکە.. بۆ ئەوەی سواری کەڵی شەیتان نەبن..
ئەی ئایا ئەم شتانەی من باسی دەکەم لەژیاننامەی پێغەمبەر ((ﷺ))نمونەی هەیە؟..بەڵێ..
کاتێك جیاوازی و دووبەرەکانێ کەوتە نێوان پێغەمبەر ((ﷺ))لە بەرامبەر قورەیشییەکاندا..
ئەم جیاوازییەش گەیشتە لووتکە بۆیە قورەیش لەسەر ئەوە بوون بەیەك دەست و کۆك بوون

لەسەر ئەوەی هەموو جۆرە ئابلۆقەیەك بخرێتە سەر پێغەمبەر و هاوەڵانی بەتایبەتی خزمانی نزیکی پێغەمبەر ((ﷺ)) ((هاشمییەکان))..

تەنانەت نووسرا نابێت کڕین و فرۆشتنیش لە گەڵ هاشمییەکان بکرێت یان ژن و ژن خوازیان لە گەڵدا بکرێت..

پێغەمبەر ((ﷺ))خزمانی و هاوەڵانی بەندکران لەشێوو دۆڵێك کە هیچ شتێکی تیادا نییە و ناڕوێت..

نارەحەتیی زۆریی بۆ هاوەڵان هێنا ، هەتا وای لێکردن گەڵای دارەکانیان دەخوارد..

بەڵکو وایان لێ هات هەتا کەسێکیان لەشەودا میز بکات..

گوێی بە دەنگێك بوو کە میزەکەی پێکەوتووە..

ئەویش سەیری کرد چەرم و پێستی حوشترێکە لەوێ ئەویش هەستاو خاوێنی کردەوە و شۆردی خۆی پێوە خەریك کرد کە بیخوات سێ ڕۆژی بە ئەمە بردە سەر..!!

ئابلۆقـە ستەمکارەکەش وا درێـژە دەکێـشێ بـۆ نزیکـەی چەند مانگێك دەخایـەنێ.. ڕۆژێـك پێغەمبـەر((ﷺ))فـەرمووی: (( ئـەی مامـە کـە ئـەویش لەگـەڵیان بـەند بـوو)) ((ان الله قد سلط ارضـة علـى صـحيفة قـريش.. فلـم تـدع فيهـا اسمـاً الا اثبتـه.. ونفـت منهـا الظلـم والقطيعـة والبهتان..)) واتە: ((خودای گەورە خۆرکەی زاڵ کردووە بەسەر ئەو نووسینەدا ، تـەنها نـاوی خودای تیادا هێشتووەتەوە ئەویتری هەر هەموو ڕنیوە و کۆڵیوە لە ستەم و دابڕینی و بوهتـان و درۆکانیان))...

بـاوکی طالـب بەلایـەوە سەرسـام بـوو وتـی خـودای گـەورە تـۆ ئـەوەی پـێ ئاگـادار کردووە..؟؟پێغەمبەر((ﷺ)): فەرمووی بەڵێ..باوکی طالب وتی:

(( هـەر ئێـستا دەچـمە لای قورەیـشییەکان و پێـان دەڵـێم: وتـی ئـەی قورەیـشییەکان ، کـوڕی براکەم ئەم هەواڵە سەرسامەی پێ داوم..

ئەگەر قسەکەی وا بوو ئەبێت واز لە ئازارو ئابلۆقەمان بهێنن ئەگەر ڕاست نەبوو..ئەوا من برازاکەی خۆمتان دەدەمە دەست چی لێ دەکەن لێی بکەن..)).

قورەیشییەکان وتیان ئێمە ڕازین و سۆزو پەیمانمان لەسەر ئەوەدا..

کاتێك سەیریان کرد.. وەك هەواڵەکەی پێغەمبەر((ﷺ)) بوو بەڵام لە سۆزو پەیمانەکانی خۆیان پاش گەز بوونەوە خراپەیان زیاتر بەسەر موسوڵمانان و خزمانی پێغەمبەردا((ﷺ)) هێنا.. هەتا نزیك بوو بمرن یەك لەدوای یەك..

هەندێك لە کافرەکانی قورەیش بە بەزەیی و سۆزدار بوون. لەوانە هیشام کوڕی عمر کە کابرایەکی خاوەن رێزو دەسەڵات بوو لەناو هۆزەکەی خۆیدا..

زۆر جار حوشتری بە بارەوە دەهێنا کە نزیکی شێو و دۆڵەکەی دەکردەوە بەرەڵای دەکرد هاوەڵانیش سوودیان لێ دەکرد...

چەند رۆژێکی تری پێ چوو.. بیری لەوە کردەوە ئەو بەم شێوەیە ناتوانێ خواردنیان بدات.. بەتایبەت زۆریش بوون. بۆیە بڕیاری دا ئەم نووسینە ستەمکارە هەڵ وەشێنێتەوە.. بەڵام ئەمەیشی بە تەنهایی پێ ناکرێت بەتایبەت قورەیشییەکان هەموویان یەك دەنگ وهاوڕان لەسەری.. بۆیە رێگەی کردنەوەی بەستەکەی گرتە بەر.. چی کرد؟

رۆیشت بۆ لای زوهەیری کوڕی باوکی ئومیە.. کەدایکی بریتی بوو لە عاتیکەی کچی عبدالمطلب..

وتی: ئەی زوهەیر تۆ رازی دەبیت کە تۆ خواردن بخۆیت و پۆشاکی جوان بپۆشی و کام ئافرەتت بوێ بیهێنی و. خاڵوانت نە خواردنیان هەبێت و بیخۆن و نە جلو بەرگ هەبێت بیپۆشن..

((نە ئافرەت هەبێت مارەی بکەن نە ئافرەتیشیان لێ مارە دەکرێت؟!(( سوێند بەخوا ئەگەر خاڵوانی باوکی ئەلحەکەمی(( مەبەست ئەبوجەهل)) بوو یان لەناو دابووایە..

((چونکە سەرۆکی ئەم دابڕانە بوو)) –ئەوا بەم شێوەیە نەی دەهێشتەوە.. زوهەیریش وتی: هەی ماڵ ئاوا ئەی هیشام..

ئەی من چی بکەم تەنها من کەسێکم سوێند بەخودا ئەگەر کەسێکی ترم لەگەڵ بوایەو ئەوا هەڵ دەستام بە شکاندنی ئەو ئابلۆقەیە..

هیشام وتی: کەسی خۆتت دەست کەوت..

زوهەیر: کێیە؟

هیشام: منم.

زوهەیر: هەوڵبدە سێیەمان هەبێت.

هیشام: ئەم گەی نێوانمان بشارەوە...

هیشام چوو بۆ لای المطعم بن عدی.. کابرایەکی هۆشمەند بوو..
پێی وت: مطعم!: تۆ رازیت دوو تیرە لە تیرەکانی عەبدی مناف تیا بچن..
ئەمەش هەمووی لە پێش چاوی تۆوەیە..
پەسندی قورەیش دەکەیت لەو ستەمەی کە دەیکات ..
مطعم وتی: ئەی من چی بکەم؟ من تەنها یەك کەسم..
هیشام: دووەمت دی..
مطعم: کێیە؟
هیشام: منم..
مطعم: هەولْ بدە سێیەممان هەبێت..
هیشام: سێیەمیش هەیە..
مطعم: کێیە؟..
هیشام: زوهەیری کوڕی باوکی ئوممەیەیە...
مطعم: هەوڵبدە چوارەممان هەبێت..
هیشام چوو بۆ لای باوکی ئەل بوختری کوڕی هیشام..
هەمان دایەلۆك وقسەو باسی بۆ ئەویش کرد..
باوکی بوحتری زۆر بە گەرمیو دڵگەرم بوو بۆ ئەم کارە..
باوکی بوختری: ئایا کەسی تر هەیە یارمەتیدەر بێت بۆ هەستانمان بەم کارە؟
هیشام: بەڵێ..
باوکی بوختری کێیە..
هیشام: منم و زوهەیری کوڕی ئوممیە ومطعم ی کوڕی عدی..
باوکی بوختری: هەولْ بدە پێنجەممان هەبێت.
هیشام چوو بۆ لای زەمعەی کوڕی ئەسوەد.
قسەی لەگەڵ کردو باسی خزمایەتی وماف ئەو خەڵکەی کە بەسەریەوەیەتی..
زەمعەی کوڕی ئەسوەد:ئایا کەسی ترمان لەگەڵە؟
هیشام: بەڵێ..من و فلاًن وفلاًن هەیە هەر هەموویان رێکەوتن لەسەر ئەم بۆچوونە..
(( سۆزو پەیمانیاندا کە یەکبگرن وهەستن بەم کارە رەوایە.. ))

زوهەیر وتی:من دەست پێ دەکەم: لە پاشاندا هەمووتان هەڵ نەستن قسەی خۆتان بکەن..
کاتێك بەیانی داهات هەریەکەو کورسی خۆی هەبوو لەچوارچێوەی کەعبەدا..
کاتێك خەڵکی کۆدەبنەوە.
زوهەیری کوڕی باوکی نوممەیە جلێکی ئەوپەڕی جوانی لەبەر کرد..
حەوت جار بە چوار دەوری کەعبەدا سوڕایەوە لە پاشاندا رووی کردە خەڵکەکەو هاواری کردو
وتی: ئەی خەڵکی مەککە ئایا ئێمە بخۆین و بخۆینەوە..؟ پۆشاکی جوان بپۆشین؟!..
ئەوەکانی هاشم لەو شێوو دۆڵەدا بمرن!! نەکڕین نە فرۆشتنیان لەگەڵ بکرێت سوێند بەخودا
دانانیشم هەتا ئەم نووسراوە ستەمکارە پارچە پارچە نەکەین..
ئەبوو جەهل.. هاواری کرد.. وتی: درۆت کرد.. سوێند بە خودا ناتوانی پارچە پارچەی

بکەیت... یەکسەر زەمعە هەستاو هاواری کرد.. نەخێر تۆ درۆ دەکەیت ئێمە رازی نەبووین بە
نووسینەکەی کاتێك نووسرا..
ئەبو جهل هەستا بۆئەوەی پەرچی بداتەوە یەکسەر باوکی البختری هەستاو وتی: زەمعە
راستی کرد..
ئێمە رازی نەبووین کەچی تیادا نووسرابوو نەدانیشی پیادا دەنێن..
ئەبو جەهل خەریك بوو روو بکاتە باوکی بوختری..
یەکسەر مطعم کوڕی عیدی هەستاو هاواری کرد..ئەوان راست دەکەن ئێوە..
هەر کەسێك هەر شتێکی تر بڵێت ئەو درۆی کردووە.. ((ئێمە دوورین و پەنا بەخودا دەگرین
لەوەی کە تیایدایەتی و تیایدا نووسراوە))..
هیشامیش هەستا هەمان قسەی ئەوانی دووبارە کردەوە..
بۆیە ئەبوو جەهل سەری سوڕما.. هەندێك بێ دەنگ بوو لە پاشاندا وتی:(ئەمە کارێکە
رێکەوتنی لەسەرکراوە.. راوێژی تێرو تەسەلی لە بێجگە لەم شوێنەدا.))

لەپاشاندا مطعم کوڕی عیدی چوو بۆ لای کەعبە.. دەستی دایە پەڕاوەکە و بۆئەوەی پارچە
پارچەی بکات ، بەڵام خۆرکە خواردبووی.. تەنها ناوی خودای تیادامابوو..

پزیشکی داناو زانا پسپۆر و زیرەك.. جێگەی دووریدنەوەی دەزووەکانی بە پەنجەکانی دیاری و دەست نیشان دەکات ..کە جێی تایبەتی و گونجاوی خۆی بێت پێش دەرزی کردنە کە بە ناویدا..

| أثبات الشخصية | Proof your self |
| --- | --- |

## سوور بوونی خۆ یەتی و کەسا یەتی..!!

**لەیادەوەریەکانە:ئێمە لەدەشت بووین بۆ سەیران کردن.. برادەرێکمان لەگەڵ بوو لەچاوی دا لاوازی هەبوو.. ئێمە هەموو ئیشەکانی ئەومان گرتبووە ئەستۆ.. بەڵام ئەو هەر دەیووت و دووبارەی دەکردەوە کە ئەبێت تۆڵەمان بۆ بکاتەوە..**

**خێوەتێکی کاتی مان داناوە.. ئەو بەرخەی پێمان بوو سەرمان بڕی گۆشتەکەیمان کردە ناو مەنجەڵێك بۆئەوەی لە سەر ئاگری دابنێن.. کاتێك ئێمە خۆمان سەرقاڵ کردبوو مولیدەیەك بە گەڕ بخەین بۆ ئەم کارە..**

برادەرە چاو لاوازەکە بۆ ئەوەی ئیشێك بکات هەستاو دەستی دایە جلێکانیٚ لەناو سەیارەکە دەری هێنا بۆئەوەی بچێت ئاو بکاتە ناو گۆشتەکەوە و بۆ کولاٚنی بەلاٚم دەستی دایە جلیکانی بەنزین؟!!

هەر لە دووری هاوارمان بۆ کرد مەکە.. ئەی فلاٚن کەس مەکە.. بەلاٚم هەر دەیووت لیٚم گەڕێن با ئیش بکەم.. بەلاٚم خۆزگە هەر ئەو ئیشەی نەکردایە بۆیە دەستمان کرد بە پێکەنین و تێکەلٚ بە گریان بۆ لەدەست چوونی گۆشتەکە!!ئێمە چارمان نەبوو برسێتییەکەی خۆمان بەنان و چایی خۆمان تێرکرد.. بەلٚکو بەردەوامین.. خۆشترین کاروان و سەفرەکردن بوو.. ئەی بۆچی خۆمان سزا بدەین لە کاتێکا کە لە دەست چوو..

جارێك بە کاروانی چووینە سەفرەیەك بەتاری سەیارە شەحنی نەمابوو... بۆیە سەیارەکەمان راگرت بۆئەوەی بە پاتریەکەی پاتری سەیارەکەی خۆمان شەحن کەین..

برادەرێکمان چووە نێوان هەردوو سەیارەکە بۆ ئەوەی سەری هەردوو وایەرەکان لەیەك بگەیەنیٚ کابرای ناو سەیارە سولفی لێدا سەیارەکە هاتە پێشەوەو برادەرەکەی ئێمە هەردوو

قاچی تا ئەژنۆی کەوتە نێوان هەردوو سەیارەکە ئێمە سەیارەکەمان گرت و دورمان خستەوە یەکسەر کابرایش کەوت ئێمەش ترساین هەردوو قاچی شکابیٚ.. بەدوو کەسەوە هەلٚمان گرت و بردمان هەندێك ئیسراحەتی کردو کەوتە سەر پێی خۆی.. ئێمەش سوپاسی خودامان کرد کە خراپتر نەبوو..

بەلاٚم ئەوەی جێی سەرسوڕمان بوو هیچ هاوارێکی نەکردو بەلٚکو تەنها خەندە و پێکەنینی کرد.. بە بیٚ ئەوەی هیچ خۆی توڕە بکات ئەمەش واتای رازیبوون و دلٚفراوانی بوو. هیچ قسەیەکی بە هیچ کەسێك نەوت.. چ سودێکی هەیە هاوارکردن؟ تەواو کارەکە قەوماو لێبووتەوە..

ئەگەر ئەتەوێ چێژ لە ژیانت وەرگریت..؛ ئەوا کار بە ئەم یاسایە بکە: گرنگی مەدە بە شتە بچوکەکان..

ئێمەی مرۆڤ زۆر جارێك خۆ ئازار و ئەشکەنجە دەدەین.. دارکاری دەکەین.. دونیای لیٚ تەسك دەکەینەوە ئازار و ئێش دەچێژین. ئێش چەشتنەکە هیچ گرفتێکمان بۆ چارەسەر ناکات..وادادەنێم تۆ چوویتە شاییەك با جل و پۆشاکی زۆر جوان لەبەری خۆت بکەیت خۆت

لـەزاواش قـۆزتر کردبێـت..!!یەکـە یەکـە تەوقـەت لەگـەڵ خـەڵك کـرد.. بـەڵام منـداڵێك هـات جامانەکەی سەری تۆی راکێشا بە کڵاوەکەوە دەکەوتە خواریٚ پیس بوو وات لێهات خەڵك پێت پیٚ بکـەنیٚ.. هەڵسوکەوتت چۆن دەبێـت؟ زۆر کەسێك لـە ئێمـە هەڵسوکەوتەکەی لەگـەڵ ئـەم گرفتـە بەشێوازێك دەکات کـە چارەسـەر نییـە بۆی.. بـەوەی کـە بـەدوای منداڵەکـەدا رابکات.. هاوار بکات.. جنێو بدات.. نەفرین بکات..

دەرئـەنجام ئـەوەی کـرد کـە منداڵەکـە لەئـەوی دەویٚ.. لـەوەی کـە سـەرنجی خـەڵکی بـۆ خـۆی رابکێشیٚ.. هۆسە درووست بکات.. خەڵکی گاڵتە بەو کەسە بکەن.. لەوانەیە ببێتـە نموونـە و خەڵك بیگێڕنەوە..!!

لەراسـتیدا تـۆ لێـرەدا –سـزا و ئـازاری منداڵەکـەت پـیٚ نـەدرا بـەڵکو ئـازار و سـزای خۆتـت بەخۆتدا..

وادابنیٚ کە تۆ جلێکی خاوێن و تازە لەبەر خۆت بکەیت.. لەوانەیە هێشتا پارەکەت بە تەواوی نەدابێت.. بچیت بۆ کۆمپانیایەك بۆئەوەی دابمەزرێنی.. بەلای دەرگایەکدا تێپەڕ بوویت تازە و

هـەر ئێـستا بـە رۆنـە رەشـە کەلێنـەکان چـەور کرابـی.. لـە پەنایـدا تابلۆیـەکی ئاگادارکردنـەوە هەبێت بەڵام تۆ ئاگات لێی نەبوو..شانت یان قۆڵت یان هە رجێگەیـەکی تـرت بـە تـەواوی پێـی کەوتووە رەش بوو.. ئایاچۆن هەڵسوکەت دەکـەیت لـە گـەڵ کابرای کرێکاری رۆن چەورکار؟ ئایا لێی تووڕە دەبی.. ئەی چۆن هەڵسوکەوت دەکەیت لەگەڵ ئـەو کێشەیە؟ ئێمـەی مـرۆڤ زۆر جار رێگە و شێوازێك دەگرینە بەر وەك چارەسەر بەڵام لە راستیدا چارەسەر نییە..

هەڵدەچین.. جنێـو دەدەیـن بـە کرێکارەکـە.. بۆچـی تابلۆیـەکی ئاگـادار کردنـەوەی گـەورەت دانەناوە کە ئاشکرا تر بێت..

کـابرای کرێکـاریش وەڵامـت دەداتـەوە بـە تووڕەییـەوە..لەوانەیـە دوا ئـەنجام زیـاتر بـە گڵـی زەویەوە بگەوزێت زیاد لەچەوری دەرگاکەوە!!

لەسەرخۆ بە .. ئایا دەزانیت بەم جۆرە هەڵسوکەوتەت خـۆت زیـاتر ئـازار دەدەی..وەك ئـەوەی خۆت داوای دارکاری بکەیت ئاوایە..

بەهەمان شێوە بڵیٚ ئەگەر:– خۆت جوان و رازاوە بکەیت بچیت بۆ خوازبێنی..

ماشێنێك بەلای تۆدا تێپەڕ بوو ئاوی سەرجادەکەی هەموو کرد بەسەر تۆدا هـەموو جلـی تـۆی پیٚ پیس بوو..

ئایا خۆت ئازار دەدەیت بەوەی دەست کەیت بە هاوار هاوار کردن دەنگی خۆت بە ماشێنەکەو خەڵکانی ناویشی بەرز و تورە بیت لە کاتێکا کەتۆ دەزانیت ئەوا ماشێنە کە نەفەرەکان لەوێ نەماون؟
بەهەمان شێوە پێویست ناکات هەر کات لایەنی ئێش و ئازار و ئەشکەنجەکانی کە تووشمان بوو لە رۆژانەی ژیانماندا بەیادی خۆمانی بهێنینەوە و بیری لێ قووڵ تر بکەیت..
محمد((ﷺ))زۆری بەسەرهات و کاتی زۆر دڵتەنگی و دڵتەزێنی لە ژیاندا زۆر دووبارە و سێ بارە و زیاتریش بووەتەوە هەتا جارێك لە گەڵ خێزانە دڵ نەرمەکەی و بەسۆزەکەی دادەنیشێ عائیشەی دایکی موسوڵمانان.. لە چرکەیەکی هێمن و ئارامیدا..
لە پێغەمبەری ((ﷺ)) پرسی ئایا هیچ رۆژێکی ترت لە رۆژی ئوحود خراپتر لێ بەسەرهات؟ یادەوەرییە تاڵەکانی ئەو جەنگە تێپەڕبوو رۆیشت.. ئائای ئۆۆۆف لەو وژە چەند تاڵ و دژوار بوو.. ئەو رۆژەی مامی پێغەمبەر ((ﷺ)) (حمزە) شەهید کرا کە خۆشەویستترین کەس بوو.. ئەو رۆژەی کە لەسەر تەرمی مامی راوەستاو لووت و چاوو گوێ کوڵرا بوون..

سکی دوو لەت کرابوو لاشەی پارچە پارچە کرابوو.
ئەو رۆژەی ددانەکانی پێشەوەی پێغەمبەر((ﷺ))شکێنرابوون.. رووی پیرۆزی بریندار بووبوو.. خوێنی لێ دەچۆڕایە سەر زەوی.. ئەو رۆژەی کە حەفتا هاوەڵی بەکوژراوی هێنرایەوە بەردەستی..
ئەو رۆژەی کە هاتەوە شاری مەدینە و حەفتا پاڵەوانی لە گۆڕەپاندا نەماو جێگەیان دیاربوو.. ئەو رۆژەی وا چەندە ئافرەتی صەحابە بێوەژن دەبێ.. سەدەها منداڵ بێ باوك دەبن.. دەگەڕێن بەدوای خۆشەویستەکانیاندا.. بەڵام نایان بیننەوە بۆ یەکجاری چوون و ناگەڕێنەوە.. نا نا ناە..
بەڵێ بەراستی ناخۆشە و کارەساتەو رۆژێکی زۆر تاڵە لە مێژووی ژیانی پێغەمبەر و هاوەڵاندا..عائیشەی دایکمان چاوەڕوانی وەڵامی پێغەمبەر ((ﷺ)). فەرمووی: (( ما لقيت من قومك كان اشد منه.. يوم العقبة.. اذ عرضت نفس..))ئەوەی لە خزمانی تۆم دی مەبەست پێی مەکەییەکانە زۆر زەحمەت و نارەحەتتر بوو.. لە رۆژی عەقەبەدا.. کاتێك خۆی پێشانی تیرو هۆزەکاندا بۆ ئەوەی ببنە پشتیوان بۆ من و ئایینی ئیسلام..لەپاشاندا پێغەمبەر باس لەو کاتە

دەکات.. کە دەچێت بۆ شاری الطائف بۆ ئەوەی لەوێ کەسانێك هەبن پشتی بگرن.. چۆن ئەوانیش بەدرۆیان خستەوە.. منداڵان و شێتانیان لێ هارکردن و بەردە بارانیان کرد هەتا هەر دوو پێی پڕ بە پێڵاو نەعلەکانی پڕ لە خوێن دەبێ..

لەگەڵ ئەم هەموو ناخۆشییە و سەدەها و هەزارەها ناخۆشی تر لە ژیانی پێغەمبەر((ﷺ)).. بەڵام پێغەمبەر ((ﷺ)) دەرفەت و مۆڵەتی ئەوەی نەدەدا کە ژیانی لێ تاڵ بکات و خۆشی و تام و چێژ لە ژیانی خۆی نەکات. نەخێر ئەم هەموو ناخۆشیانە شیاوی ئەوە نین کە پێغەمبەر ئاوڕیان لێ بداتەوە.. ناخۆشیەکانی چوو ە بەسەرچوو.. پاداشت و چاکەو بەرهەمەکانی هێشتا و ماوەو هەردەم دەمێنێ..

_کەواتە ئەی تۆی مرۆڤ بۆچی خۆت دەکوژیت بە کەسار خواردن.. بەهەمان شێوە کەسانی تریش لەگەڵ خۆت دەکوژیت بە کەسار((خەفەت خواردن))و سەرزەنشت کردن..

بەڵێ لەراستیدا ئێمەی مرۆڤ زۆر جار هەڵسوکەوت دەکەین لەگەڵ کێشەکان وەك چارەسەرێك.. بەڵام لەراستیدا هیچ چارەسەرێکی تیادا نییە.. ئەحنەفی کوڕی قەیس کابرایەکی لەسەرخۆ بوو.. سەرۆکی هۆزی تەمیمیەکان بوو بەهێزو بازووی خۆی نەبوو گەورەیان بەڵکو بەهێمنی و لەسەرخۆیی.. هەندێك کەس رقیان لێی دەبووەوە.. بۆیە کابرایەکی گێلیان بەکرێ گرت کە هەزار درهەمیان پێدا بۆئەوەی زللەیەك لەرووی ئەحنەف بدات..

کابرا هات بۆ لای ئەحنەف ئەویش دانیشتبوو کابرا لێی نزیك بووەوە ئەحنەف وای زانی هەواڵێکی پێیە بۆی.. بۆیە زللەیەکی لە روومەتی دا..

زۆر لەسەر خۆی وتی بۆچی وات کرد.. گێلەکە وتی:چونکە هەزار درهەمیان پێ دام بۆ ئەم کارە..

ئەحنەف بەڵام تۆ هیچت نەکرد من ئەحنەف نیم..! ئەحنەف ئەو کابرایەیە کە ئەوەیە لەوێ دانیشتووە ...((کە کابرایەکە تووڕەییەکەی دابەش بکەیت بەسەر نەتەوەکەیدا بەشی هەمووی دەکرد..)).

(( ناوی حارثە ی کوڕی قودامە بوو.. )).کابرای گێل بەرەو کابرای تووڕە رۆیشت کاتێك لێی نزیك بوویەوە وا سەیر دەکات هەردوو چاوی لە تووڕەییدا خوێنی تێ خزاوە و شیرێکی لەپەنادا بوو.. کابرای گێل زللەیەکی لێداو دەستی نەگەڕایەوە بۆ لاشەی هەتا بە شیرەکەی حارثە بە برین چوو..!!

قسەیەکی باو هەیە دەڵێت: ئەو کەسە بروەیە کە لە کۆتاییدا ئەو پێبکەنێ.

رازی بوون..

دڵسوکەوت لە گەڵگرفتەکان بە شێوازێك کە نەبێتە چارەسەری گونجاو لە بار بۆی..سزا و ئازارت زیاد دەکات!!..

| الغضب لا يحل مشكلة | Angry dont solve problems |
|---|---|

## تووڕەبوون گرفتت چارەسەر ناکات!!..

**زۆر کەس دەبینی شوفێرماشێن لێ دەخوڕێ و لەکاتی زۆر تووڕەییدا.. لەوانەیە بە دەستەکان لە سکوانەکەی بدات بۆ جارێك یان زیاتر..**

**دووبارەی دەکاتەوە: ئۆۆف گەرمایەکی زۆۆۆرە..!! یان دەڵێت: ئۆۆفف!!کە حەزی بە قسەکردن نییە لەگەڵ هیچ کەسێکدا..**

**لەوانەیە تۆیش هاوەڵی کاری بیت بەوەتاقی کرابیتەوە.. هەردەم ئەو ببینیت.. سەرقاڵیت هەر بە دانیشتنی.. ئەی برام کارەکان زۆرن.. ئۆۆ.. هەتاکەی موچەکانمان زیاد ناکەن..**

**بەرووگرژییەکەوە خۆی دەکات بەژووروەدا بە تووڕەیییەکی کەوە لە ژوورەکە دەردەچێتەوە .. لەوانەیە زۆر هات و هاواری لەسەر ئێش و ئازاری لاشەی بێت.. یان منداڵێکی تەواو نەبێت.. بە کورتی و کرمانجی: ئێمە پێویستە هەردەم بەبەشوکاری خودای خۆمان رازی بین دڵنیا بین لەوەی زۆر جار و شتانێکی زۆر هەیە لەم ژیانەی دونیاماندا هیچ چارەسەرێکیان نییە.. بەڵکو**

((ئەبێت واقیعە شانی بدەیتە ژێر و داوای کۆمەکی بکەیت لە خودای گەورە)) خراپترت لێ لادات.. داوای یارمەتی لەو بکەیت.. بزانیت هیچ شتێك بێ حیکمەت نییە بەلاّم مەرج نییە تۆ بزانیت حیکمەتەکەی چیە؟!!

کەواتە پێویستە ئێمە زۆر بە دڵکراوەیی و دڵفراوانییەوە هەڵسوکەوت بکەین لەگەڵ ئەو کێشانەی بێ چارەسەرن..

ئیلیای باوکی مازی دەڵێت : قال : السماء كئيبة ! و تهجمها

قلت : أبتسم يكفى التجهم في السماء !

وتی ئاسمان خەفەت بار و پەژارەیە

وتم خەندەت بێ بەسمانە ئاسمان پەژارەیە

قال : الصبا ولي : فقلت له : أبتسم

لن يرجع الاسف الصبا المتضرما !

وتی کاتێ منداڵی بسەر چوو

وتم خەندەت بێ : نایگەڕێنێتەوە خەفەت بۆدواوە

قال : التي كانت سمائي في الهوى

صارت لنفسي في الغرام جهنما

خانت عهودي بعدما ملكتها

قلبي فكيف أطيق أن أتبسما

وتی ئاسمانی من لە خۆشەویستیی ئەو دابوو

دەروونم دەکولاّ بۆ ئەو وەك دۆزەخ وابوو

پەیمانەکانی شکاندم پاش ئەوەی هێنابوومە دەستم

لەناو دڵم ئیتر چۆن بتوانم خەندەدار بم

قلت أبتسم وأطرب فلو قارنتها

قضيت عمرك كله متألماً !

وتم: پێکەنەو هەڵپەڕە

ئەگەر بەوردی بەراوردی کەی

هەموو تەمەنت دەبەیتە سەر بەناخۆشییەکەی

قال للتجارة في صراع هائل

مثل المسافر كاد يقتله لضما

وتی بازرگانیم لەمەترسی گەورە دایە

وەك كاروانچی لەتینوویەتیدا نزیك بوو بمردایە

قلت أبتسم ما أنت جالب دائها

وشقائها ، فأذا أبتسمت فربما ...

وتم: خەندەت بیّ تۆ خۆ نەخۆشییەكەت بۆ نەهێناوە

وەك چۆن شیفاكەت بۆ نەهێناوە ، بەلاّم خەندە شیفادەرە

أيكون غيرك مجرما ، و تبيت في

وجل كأنك أنت صرت المجرما ؟

كەسێكی تر بێجگە لەتۆ لە دوور تاوانبارە

خەوت لیّ ناكەویّ وەك ئەوەی تۆ خۆت بووی بەو تاوانبارە

قال : العدي حولي علت صبحاتهم

أأسرُّ والاعداء حولي في الحمى ؟

وتی: دوژمنانم لە چوار چێوەم دەنگی سەركەوتنیان ڕاگەیان

ئایا چۆن دڵخۆش بم دوژمنانی چواردەورم پارێزران

قلت : أبتسم أيطلبوك بزمهم

لو لم تكن منهم أجل وأعظما ؟

وتم : خەندەت بیّ ، دوژمنان تۆیان ناویّ لەبەر نزمی و بیّ نرخیت

ئەگەر لەوان بەرێز و گەورەتر نەبیت نایانەوێت !

قال : المواسم قد بدت أعلامها

و تعرضت لي في الملابس و الدمى

وعليَّ للاحباب فرض لازم

لكن كفي ليس تملك درهما

وتی: هاتن نیشانەی جەژن و بۆنەكان

خۆی بۆ وەدەرخستم لەجل و بەرگا

لەسەرمە بۆخۆشەویستانم بکەم هاریکارییان

بەلاّم سەد جار بەداخەوە لەدەستم دانییە بیانکەم بە جل و بەرگا

قلت أبتسم ، يكفيك أنك لم تزل

حيا ولست من الاحبة معدما !

وتم خەندەت بێ ، بەسە بۆ تۆ لەناویاندا هێشتا زیندوو

کە نەبووی بەیەکێك لە خۆشەویستانی مردوو

قال الليالي جر عتني علقماً

قلت أبتسم ، ولئن جرعت العلقما

فلعلك غيرك أن رأك حرنما

طرح الكآبة جانبا و مرنما

وتی نارێکی شەوان دەرمانداوی کردم

وتم پێکەنە با دەرمان داویش کرابی

بەهیوای ئەوەی ئەگەر کەسێك تۆی دی پێ بکەنێ

ناخۆشییەکانی خۆی وەلاوەنێ بۆ ساتێك پێ کەنێ

أتراك تغنم بالتبرم درهما

أم أنت تخسر بالبشاشة مغنما ؟

يا صاح لا خطر على شفتيك أن

تتثلّما تتسلما و الوجه أن يتحطما ؟

ئایا وا گومان دەبەی کە دەست کەوتت پارەیە

یان تۆ خۆت خەندەت دۆڕاندووە بەو پارەیە

ئەی برادەرم هیچ مەترسییەك لەسەر لێوانت نییە

یان دەم وچاوت لەوەی وتی بۆ نییە

فأضحك فأن الشهب تضحك

جى متلاطم ، ولذا نحب الانجما !

پێ کەنە چونکە فیشەکە هەواییەکان پێدەکەنن

تاریکییەکان بەیەکدا ئالاّون ، بۆیە خۆشمان دەوێیت ئەستێرەکان

قال البشائة ليس أن تسعد كائنا

يأتي الى الدنيا و يذهب عنها عما مرغما

وتی خەناوی ئەوەنیە دلڕفێنی مرۆڤێك بێت

دێتە ئەم دونیایەوە دەیگەڕێیننەوە پرسی پێ ناکرێت

قلت أبتسم مادام بينك والردي

شبر فأنك بعد لن تتبسما

وتم: خەندەت بێ مادەم لە نێوان تۆ و مردن بستێك مابێت

چونکە بەڕاستی لە دوای مردنت خەندە نامێنێ بۆ لێوانت

بەلاّم ئەگەر خوای گەورە بەبەزیی خۆی شادت کا

## بەڵێ چێژ لە ژیانی خۆت وەرگرە و تامی تایبەتی خۆتی لێ بکە..

ئاگادار بە باروودۆخت کاریگەری و شوێنەاری دەبێت لەسەر هەڵسوکەوتت.. لەکارەکانت.. بۆ منداڵەکانت.. هاوەلاّنت..

ئەی ئەوان تاوانیان چییە سزاو ئەشکەنجە و ئازارو ئێشی تۆ هەڵگرنەوە.. کە هیچیان لە دەسەلاّتدا نییە نە بەشێکن لەو گرفتە.. نە توانایان هەیە بۆ چارەسەرکردنی؟

وایان لێ مەکە و لێ بەسەر مەهێنە ئەگەر تۆیان بینی.. یان تۆیان بەبیرهاتەوە.. بیرهاتنەوەی کەسارو پەژارو دڵتەنگی بێت لەگەڵت.. هەر لەبەر ئەوەیە پێغەمبەر((ﷺ)) قەدەغەی کردووە هاوار بکرێت لەسەر مردوو.. یەخەی خۆدڕان.. لەسەری خۆدان و شیعرو شانامە وتن بکرێت..وە.. بۆچی؟

چونکە هەڵسەکەوت لەگەڵ مردوو بۆچی؟ چونکە هەڵسوکەوت لەگەڵ مردوو ئەبێت ئەوە بێت بشۆرێت و کفن بکرێت و نوێژی لەسەر بکرێت و بشارێتەوە و دوعا و نزاو پاڕانەوەی بۆ بکرێت..

بەلاّم هات و هاوارکردن هیچ سودێك ناگەیەنێ.. بێجگە لەوەی خۆشیو چێژی ژیانت لێ تاڵ دەکات بۆ کەسارو دڵتەنگی و پەژارەیی.. دوو برادەر بەیەکەوە بوون.. یەکێکیان وتی: ئەمڕۆ زۆر ساردە؟

خۆی ڕەزا گرانتر کردبوو..

برادەرە، هۆشمەند و ژیرەکەی وتی: ئا ئێستا من گەرمم بووەوە؟

کابرای ڕەزا گران: نا، چۆن؟

هۆشمەندەکە: چ سودێکت کردووە لە قسە پێ وتن ناڕەزایی کە هەردەم پیشەتە؟ ئەگەر خۆت خەریك بکەیت بە یادی خوداوە زۆر بۆت چاکترە لەم ناڕازیبوونەی هەردەمت.. چەندە جوانە و پڕبەهایە تێگەیشتن و داناییەکەی..

ژیانی خۆت بە خۆشی و کامەرانی ببە سەر، مەگەڕێ بەدوای کەلێن و کەلەبەرەکاندا بۆ درووست کردن و دۆزینەوەی کێشەو گرفتەکان.. بەدواداچوون مەکە لە کارە بچووك و نادیارەکان..

بەڵکو چێژو تام و لەزەت و خۆشی لە ژیانی خۆت ببینە..خۆت مەکە کوشتەی کەساری بۆ شتێك کە هێشتانەبووە سەعد کە یەکێك بوو لە قوتابیانم لە زانکۆ..

بەدرێژایی حەفتەیەك ئامادە نەبوو لە زانکۆ.. لەپاشاندا پێی گەیشتم لێم پرسی: سەعد ها خێرە خودا سەلامەتی بدات؟سەعد: نا هیچ نەبوو.. هەندێك سەرقاڵ بووم..کەسارو پەژارەیی لەسەر روون و ئاشکرا بوو..

وتم: چ باسە؟سەعد: منداڵەکەم نەخۆش بوو.. جگەری دەرهێنراوەو پۆرتکاوە.. پێش چەند ڕۆژێکیش خوێنەکەی ژەهراوی بووە.. دەوێنێش پێمان راگەیەنرا کە زەهرەکە چووەتە ناو دەماغیەوە..وتم: لاحول ولاقوه الا بالله.. دان بەخۆدا بگرە.. داوا بکە خودای گەورە شیفای بدات.. ئەگەر خودای گەورە شتێکی لەسەر نووسیبێت داوا بکە لەخودای گەورە بیکاتە تکا کارت لە ڕۆژی قیامەتدا..

سەعد: ببێتە تکا کار بۆم؟ کوڕەکەم منداڵ نییە..

وتم: چەندە تەمەنی؟

سەعد: حەڤدە ساڵانە.. وتم: داوا دەکەم خودای گەورە شیفای بدات.. بەرەکەت بکاتە ناو براکانی تریەوە..سەری نەوی کرد، وتی: مامۆستا.. هیچ برایەکی تری نییە..

خودای گەورە تەنها ئەو کوڕەی پێ داوم.. ئەویش تووشی ئەوە بوو وا تۆ دەیبینی..

شێوازی زۆر کاریگەر بوو.. بەڵام خۆم ڕاگرت وتم: سعد.. زۆر بە کورتی یە.. خۆت مەکە کوشتەی خەم و کەسارەکان.. ئەوەی خودا نەینوسێ نابێت..لەپاشاندا هەوڵم دا بەڵاکەی بۆ لەسەر ئاسان بکەم.. ڕۆیشتم.. بەڵێ خۆ مەکە کوشتەی کەساری و پەژارییەکانت چونکە هیچ

بەڵات لەسەر سووك ناكات.. ماوەیەك پێش ئێستا برادەرێكم پێی وتم: پێت چۆنە ئەگەر بچین بۆ دڵنەوایی كردنەوەی دوكتۆر عەبدوڵلاّ..

وتم: خێر.. چ هەواڵە؟

وتی: دڵنەوایی بكەنەوە..

وتم: چی لێ بەسەرهاتووە؟!!

وتی: بەڵێ كوڕە گەورەكەی بە هەموو خێزانەكانیماڵەوەی چوون بۆ ئامادەبوونی شاییەك لە شارێكی تردا.. بەڵام دوكتۆر خۆی لەبەر زانكۆ لە ماڵی خۆی مایەوە.. لەكاتی هاتنەوەیاندا تووشی ڕووداو و كارەساتێكی زۆر دڵتەزێن بوون.. هەر هەموویان مردن.. یانزە كەس بوون!!
دوكتۆر خۆی پیاوێكی ئارام و لەسەرخۆ بوو تەمەنی لە پەنجا ساڵیدا بوو.
بەڵام بە هەر حاڵ.. ئەویش مرۆڤە هەست و نەستی هەیە.. لەناو دڵیدا سۆز هەیە..

لەهەردوو چاویدا گریان هەیە.. دەروونێك هەست بە خۆشی و ناخۆشی دەكات..
هەواڵی بەڵای گەورەو دڵتەزێنی پێ گەیشت.. نوێژی لەسەر كردن.. لەپاشاندا گڵی بەسەردا دان بەهەردوو دەستی خۆی..
یانزە كەس لە یەك خێزان..
ئێستا وای لێهات بە تەنها دێت و دەچێت سەرگەردانە.. تێپەڕ دەبێ بەلای پارچەكانی یاریی منداڵەكانی.. ئەوە چەند ڕۆژێكی لێ بەسەرچووە كەس جووڵەی پێ نەكردووە چونكە سارە و گوڵە باخ ((ئەوان)) یارییان پێ دەكرد.. بەڵام وا ئێستا مردوون بەكارەساتەكە ئەوە دەچێتە سەر جێگەی خۆی.. جێگەی بۆ ڕێك نەخراوە.. چونكە دایكی منداڵەكانی..
كۆچی كردووە.. تێپەڕ دەبێت بەلای پاسكیلەكەی یاسردا.. هیچ جووڵەی پێ نەكراوە..
چونكە ئەوەی لێی دەخوڕی كۆچی یەكجاری كردووە..
دەچێتە هۆڵەی كچە گەورەكەیەوە.. جانتاكانی بوكێنی و جل و بەرگەكانی لەسەر یەك ریزكراون.. پۆشاكەكان لەسەر جێگەكە ڕاخراون.. ئەو بووكە مردووە. كە خۆی ئامادەكاری بۆ ساتی ژیانی دەكرد.. ڕەنگەكانی بۆ هەڵدەگرت و هەڵ دەبژارد و ڕێكی دەخستن.. پاكی و بێگەردیی بۆ ئەو خودایەی كە ئارامگری خستبووە دڵیەوە.. دڵی ڕاگیر كردبوو..
میوانەكان دەهاتن بۆ لای.. خواردنی خۆیان لەگەڵ خۆیان دەهێنا چونكە دەیانزانی هیچ كەسێك لەوێ نییە خزمەتی بكات یان یارمەتیی بدات.. ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە

کاتێک لەناو خەڵکەکە دەتبینی وا هەستی دەکرد یەکێکە لەو کەسانەی کە هاتووە بۆ سەرەخۆشیکردنی و دڵدانەوەی..
وات دەزانی بەڵاکە بەسەر کەسێکی ترەوەیە بێجگە لە ئەو..
هەردەم ئەم وشەیەی دووبارە دەکردەوە.. ((انا لله وانا اليه راجعون..)) واتە ئێمە موڵکی خوداین و بۆ لای خودا دەگەڕێینەوە.. بۆ خودایە هەرچی بباتەوە هەر موڵکی خودایە چیش ببەخشێت.. هەموو شتێك لەلای خوای گەورە کاتی و دیاریکراوی خۆی هەیە..ئەمەش خۆی لەخۆیدا لووتکەی هۆشمەندییە.. ئەگەر ئەمە نەڵێت، چی دەڵێت..؟
بە خەم و پەژارەوە دەمرێت.. کابرایەك دەناسم هەردەم کامەرانەو بەختەوەرە.. ئەگەر بیر لەحاڵی بکەیتەوە ئەو کات بۆت دیار دەبێت کە:موچەی فەرمانبەرییەکە زۆر نییە.. لەخانوویەکی کرێداری تەسکدایە.. بەکرێ.. شوفێرەکەی کۆنە..منداڵەکانی زۆرن و

خەرجییان دەوێت.. لەگەڵ ئەمانەش (هەمووی)هەردەم روو بە خەندەوەیە.. خۆشەویستە.. ژیانی بە خۆشگوزەرانی دەباتە سەر..راستە..
خۆت مەکە کوشەی کەسارو پەژارەکان هەردەم هاوار و دادو بێداد مەکە.. خەڵکیت لێ بێ تاقەت دەبێت.وەك ئەوەی کابرایەك منداڵێکی پەککەوتەی هەبێت..
هەردەم سەرت قاڵ بکات کاتێك دەتبینێت.. منداڵەکەم نەخۆشە.. دڵم زۆر پێی تەنگ دەبێ.. منداڵەکەم چەندە بەسەزمانە..
بۆیە تۆ هەست دەکەیت و حەزت بەوە دەبێت کە ئەگەر بۆت بکرێت هاوار بکەیت پێی بڵێیت: ئەی برام تێگەیشتم بە کێشەو گرفتەکەت.. یان ئافرەتێك هەردەم بە پیاوەکەی دەڵێت: پیاوەکە ماڵەکەمان کۆنە.. ماشێنەکەمان پەکی کەوتووە.. جل و پۆشاکم وەك مۆدێرنی ئەمڕۆ نییە..
چ سوودێك لەم هاواری و بێزارییە و سکاڵاکردنە دەبینی تەنها ئەوەندە نەبێت کە ئازارو ئەشکەنجەکانی تازە ونوێ دەداتەوە:

افنيت يا مسكين عمرك بالتآوة والحزن- - - وظللت مكتوف اليدين
تقول حاربني الزمن - - - ان لم تقم بالعبء انت فمن يقوم به اذن

ئەی هەژار تەمەنت رۆیی بە ئۆف و کەساری
هەردەم دەمێنێتەوە بە دەستەوەستانی
دەڵێیت: کات و سات لە گەڵم جەنگی

**ئەگەر خۆت بەخۆت هەڵنەستی بە هەڵ گرتنی**

**ئەی کەواتە کێ پێی هەڵدەستێ بۆ ئەنجامدانی**

## ترووسکایی تیشکێک..

ژیانی خۆت بەوە بژی کە لە ژێر و نێوان هەردوو دەستی خۆتدایە لە بەخشینەکانی.. بۆ ئەوەی بتوانی بەختەوەر بیت..

| Be maintain | کن جبلا |
| --- | --- |

## کێوێک بە..

**لە سەرەتای بانگەوازیم بوو بۆ ڕێگەی خودا.. بانگێشە کرام بۆ وتنی موحازەرەیەك لە یەکێك لە گوندەکان.. برایەك هاتە پێشوازیم بەرپرسی بانگەواز بوو لەو گوندە .. سواری سەیارەکەی بووین سەیارەیەکی کۆن بوو.. قسەم لەگەڵ کرد و وتی واتازە خەریکە خوازبێنی ژن دەکەم.. لەپاشاندا باسی لە گرانی مارەیی کرد لەو گوندەدا..**

**بۆیە نەیتوانی سەیارەیەکی چاکتر بکرێت.. منیش هیوای سەرکەوتنم بۆ خواست..لەپاشاندا چوومە موحازەرەکەوەو کۆتایی پێ هات هەندێك پرسیاریان هەبوو..**

**یەك لەو پرسیارانە پرسیاری گرانیی مارەیی بوو..منیش دڵخۆش بووم بارم بۆ لەبار بوو بۆ باسکردنی گرانیی مارەیی لە ئیسلامدا.. دەستم پێ کرد گرانی مارەیی وای لە گەنجەکان کردووە نەتوانن بچن بۆ داوای ژن هێنان..**

لەپاشاندا باسی ئەوەم کرد کە کچەکانی پێغەمبەر ((ﷺ)) هیچیان لە پێنج سەد درهەم زیاتر نەدراوون بە مێرد.. لەپاشاندا دەنگم بەرزکردەوەو وتم: یەعنی کچەکانی ئێوە چاکترە لە کچەکانی پێغەمبەر((ﷺ)) کابرایەکی پیر هاواری کرد بۆ کچەکانی ئێمە چیانە؟ کابرایەکی تریش وتی قسە بە کچەکانمان دەڵێت..!!

کابرای سێیەم لەسەر ئەژنۆی دانیشت و وتی: ئۆ ۆۆ قسە لەسەر کچەکانی ئێمە دەکات؟!!بەراستی کەوتمە شێوازێك هیچ کەس خۆزگەی بۆ ناخوات.. وەك لە پێشدا وتم سەرەتای دەست پێکردنم بوو بۆ بانگەوازی کردن.. تازەش دەرچوو بووم لە زانکۆ.. هەندێك بەبێ دەنگی مامەوە..سەیری کابرای یەکەمم کردو پێکەنیم.. کاتێك دووەمیش قسەی کرد بەهەمان شێوە سەیرم کرد پێکەنیم.. سێیەمیش وەك یەکەم و دووەم هەندێك گەنج لە دواوە بوون لە مزگەوتەکەدا.. دەستیان کرد بە پێکەنین.. هەندێکیان هەستان وبەپێوە راوەستان وسەیریان دەکرد بزانن چی روودەدات..

کاتێك لەسەر خۆیی منیان دی.. ئەوانیش لەسەرخۆ بوونەوە((هێمن بوونەوە)).. لە پاشاندا کەسێکیان هەستاو وتی: ئەی خەڵکینە دەرفەت بدەن با مامۆستا مەبەستی خۆی روون بکاتەوە..ئەوکات هەموو خەڵك بێ دەنگ بوون.. منیش سوپاسی ئەوەم کرد بۆ ئەم کارەی.. لە پاشاندا منیش داوای لێبوردنم کرد باسی چاکەی ئەوان وکچانیانم کرد.. مەبەستی خۆیشم روون کردەوە بۆیان..کاتێك هەڵسوکەوت دەکەیت لە گەڵ خەڵکی بەراستی تۆ کەسایەتی خۆت درووست دەکەیت..

لە هۆش ئەواندا شێوازی کەسایەتیی و لێهاتوویی تۆ درووست دەبێت.. لەسەر شێوازەی تۆ هەڵسوکەوتت لەگەڵ دەکەن.. رێزت بۆ دادەنێن..

دڵنیابە دارەکانی رەگیان بەچەق وناخی زەویدا بردووە .. بەرەشەبا هەڵ ناکێشرێن.. با هەرچەند دژوار بێت.. سەرکەوتنیش سەرکەوتنی یەك کاتە..هەرچەندە هۆش وهزرت زیاد بکات.. نەزانیت کەم دەبێتەوە ئەگەر رێزت زیادی کرد لەناو خەڵکیدا.. توڕەییت لەناخی خۆتا کەم دەبێتەوە..

وەك دەریا هیچ ناجوڵێنێ..

وەك کێو هیچ بایەك نای هەژێنێ..!

بەڵکو ئەگەر کەسێك بیەوێ تووڕەت بکات.. لەجێگەیەکدا.. یان لە ماڵێکدا یان لە کەناڵێکی ئاسمانیدا..

یان لە موحازەرەیەکی گشتیدا.. ئەگەر تۆ لەسەرخۆ مایتەوەو تووڕە نەبووی وهەڵنەچووی .. خەڵکی سوزیان بەلای تۆدا دەبێت دژی ئەو کەسەی کە دەیەوێت تۆ تووڕە بکات. کاتێ موسڵمانەکان زانییان کاروانێکی قورەیش بەرێگەوەیە لەبریی ماڵ و سامانی موسڵمانانی کۆچکردوو کەداگیریان کرد بوو، وایان بەباش زانی بچن ئەم کاروانە وەرگرنەوە لەقورەیش بەڵام کاتێ ئەو بوو جەهل بەمەی زانی بەدەرفەتێکی باشی لەقەڵەم دا بۆ ئەوەی بتوانێ بەتەواوی موسڵمانان و پێغەمبەر ((ﷺ)) لەناو ببەن چونکە هێشتا خۆیان بەهێز نەکردووە ئەمە لە لایەک. لەلایەکی تریشەوە موسڵمانەکان بۆ شەڕ نەهاتوون کەواتە ئامادەیی خۆیان نەکردووە بۆیە زۆر ئاسانە لەناو بردینان ئەمەبەبۆچونی ئەبوسوفیان. شەڕی بەدر واخەریکە دەست پێ دەکات.. بەڵام شەڕێکە بەزۆر بەرپیشی موسڵمانانەوە بووە بۆ ئەم کارە نەهاتوونە بۆیە دڵە راوکێ کەوتە ناو موسڵمانان کە ئێمە بۆ شەڕ نەهاتووین و ئامادەکاریمان بۆ نەکردووە. سوپای ئەبوجەهلیش سێ ئەوەندەی ئێمە ئەسپ ولاخی خۆیان پێیە و هەر خۆیشیان سێ ئەوەندەی ئێمەن.

هەر بۆیە پێغەمبەر((ﷺ)) زۆر زۆر دەپاڕایەوە لە خوای گەورە وسکاڵای دەبرد بۆی هەتا جوبەکەی کەلەسەر شانی بوو کەوتە خوارێ ئەبوبەکری صدیق فەرمووی ئەی پێغەمبەری ((ﷺ))خودا وەللاهی خودا سەرت دەخات بەسە تۆزێ رەحم بەخۆت بکە.

پێغەمبەر ((ﷺ)) دەپاڕایەوە دەی فەرموو ئەی خودایە ﴿ اللهم ان تهلك هذه العصابة فلن تعبد في الارض﴾(١١).

واتە :((ئەگەر بێتو ئەم کۆمەڵە موسڵمانە تیا بچین ئەوا تۆ هەتا هەتایە پەرستنت بۆ ناکرێ)) ئینجا ڕەنگی پێغەمبەر ((ﷺ)) گەش بوو کە خودا نیگای بۆ نارد پەیمانی سەرکەوتنی پێ دا.

ئەویش مژدەی سەر کەوتنی بە موسڵمانەکاندا ، بەڵێ بەسەر کەوتنی موسڵمانان کۆتایی جەنگ هات (( لەساڵی دووی کۆچی کەدەکاتە ٦٢٤ زاینی)).

باوکی سوفیان بە کاروانەکەیەوە لە شامەوە گەڕایەوە.. بەرەو شاری مەککە..

((رازیبونێك لەوپەڕی تووڕەییدا لەوە..))

ڕەشەبا هەرچەندە بەهێز بێت بەڵام کێوەکان ناجوولێنێ..
بەڵام یاری وگەمە بەلم وخۆڵ دەکات.. وێنەیان پێ دەکێشێ
هەرچۆن حەزی لێ بێ..

| Dont dame him even he drink again | لا تلعنه وأن شرب الخمر مرارا |
|---|---|

نەفرینی لێمەکە.. باهەرچەندە ئارەقیشی خوارد بێتەوە..!!

**زۆربەی ئەو کەسانەی کە ئێمە لە ڕۆژانەی خۆماندا تێکەڵییان دەکەین.. یان دەیانناسین..**
**باهەرچەندە خراپەی زۆرو گەورە بێت..**
**بەڵام لایەنی خێرو چاکەشی هەیە ((با)) ئەگەر کەمیش بێت.. ئەگەر بتوانین ئێمە لایەنی خێرو چاکەکەی بدۆزینەوە کە لەوکەسەدایە..**
**یان کلیلی کردنەوەی چاکەکان بزانین ئەوە شتێکی چاکمان کردووە.. بڵاوە لەناو خەڵکیدا کە باس لە هەندێ خراپکاران کراوە..**
**کە خراپەی دەکرد لە دزی کردن لەماڵی خەڵکی..**

بۆیە ئەوەی دەکرد کە خێرەکەی خەرج بکات لەسەر هەژاران ولاوازاندا و هەتیواندا!! یان تەنانەت جاری واش بووە مزگەوتی پێ درووست کردووە!!

یان وەك ئافرەتێك کە چەند هەتیوێك دەبینێ برسیانە دەچێت زینا دەکات بۆ ئەوەی پارە بهێنێتەوە بۆ ئەو هەتیوانە وخۆیانی پێ تێر بکەن..

بنی مسجدا لله من غیر حلة.. ... فكان بحمد لله غیر موفق..

كمطعمة الایتام من كد عرضها.. لك الويل لا تزني ولا تتصدقي..

واتە:((مزگەوتی بۆ خودا درووست کرد بەبێ ئەوەی پارەی حەلاڵ بێ..

ئەو خێرەی بە پارەی حەلاڵ نەبێ، سوپاس بۆ خودا جێی خۆی ناگرێ..

وەك ئەو ئافرەتەی! هەتیوانێ تێر بکا بەخواردن پێدانێ..

بە کاری ئابڕوو فرۆشتنی!!! رۆ رۆ بۆت زینا مەکە، خێر ئەوها نابێ.))

زۆر لە خەنجەر هەڵگران خەنجەریان هەڵگرت بۆ ئەوەی کەسێکی پێ بکوژن..

بەلام منداڵێك یان ئافرەتێك دەبینێت وهاوارو سکاڵای بۆ دەبات دڵی نەرم دەکات.. خەنجەرەکەی فڕە ئەدات..کەواتە هەڵسوکەوتت لەگەڵ خەڵکی بەو شێوەیە بێت لە خێری تیادا دەخوێنیتەوە... پێش ئەوەی گومانی خراپی پێ بەری..

پێغەمبەرمان((ﷺ)) بیل بیلەی چاومان هێزی هەناومان رۆحی رەوانمان. ئەمە هەڵسوکەوتی بوو.. تەنانەت بە رەوشتە بەرزەکەی زۆرجار عوزری بۆسەر پێچیکاران و هەڵەکاران دەهێنایەوە وگومانی چاکی پێ دەبردن..

پێغەمبەر((ﷺ)) ئەگەر کەسێکی تاوانبارو سەرپێچیکاری پێ بگەیشتایە سەیری لایەنی باوەڕی دەکرد تیایدا.. پێش لایەنی ئارەزووی وتاوانەکانی. هیچ گومانی بە خەڵك نەدەبرد.. هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرد وەك منداڵی خۆی وبراو کەسانی خۆی.. حەزی لەخێر بوو بۆیان وەك چۆن خێری بۆ خۆی دەوێ..

کابرایەك هێنرا خزمەت پێغەمبەر ((ﷺ)) بۆ دارکاری کردنی...پیاوێك وتی: نەفرینی خودات لێبێ چەندەجار دەیهێنن بۆ دارکاری لە سەرئارەق خواردنەوە .. بەڵام کاتێك پێغەمبەر((ﷺ)) گوێی لێبوو ..فەرمووی:(( نەفرینی لێمەکە چونکە ئەوە خوداو پێغەمبەری((ﷺ)) خۆش دەوێ..)).

**کاتێك هەڵسوکەوتت کرد لەگەڵ خەڵکیدا دادپەروەربە..**

**باسی ئەو خێرو چاکەیەی بکە کە تیایدایەتی..**

**ئەوەی تیاد درووست بکە کە تۆ بەهۆی خراپەکەیەوە لایەنی چاکییەکەی فەرامۆش ناکەیت..**

**ئەمەیش وای لێ دەکات کە لە تۆی نزیك بکاتەوە..**

تەکنیکێك..

پێش ئەوەی دەست بکەیت بە ریشەکێش کردنی داری خراپ وبەد لەخەڵکاندا.. بگەرێ و لە دواچوون و لێکۆڵینەوە بکە بە دوای داری خێرو چاکەدا کە تیایەتی ئاوی بدەو بەرهەمی بهێنە..

| If he goint be what you wait, be what he wants | أذا لم يكن ما تريد.. فكن أنت ما يراد |
|---|---|

ئەگەر ئەوە نەبوو کە تۆ دەتەوێ، تۆ وابە کە ئەو دەیەوێ..!!

**ئەگەر هەر چارت ناچار بوو گوێ بگرە وخۆشی و لەزەت هەڵگرەوە.. ئابەم شێوەیە ئامۆژگاریی گەنجێکم دەکرد کە تووشی نەخۆشی شەکرە بوو بوو.. چایی دەخوارد بەبێ شەکر.. زۆر نیگەران بوو بەحاڵ وشێوازی خۆی..پێم دەوت: کاتێك کەسار دەبیت لە کاتی چایی خواردنەکەت بەبێ شەکر ئایا تاڵی چاییەکە دەگۆڕێ بۆ شیرینی..**

**وتی: نەخێر..**

**وتم: مادەم چارت ناچارە خۆشی لەوەندەی هەیە وەرگرە..**

**مەبەستم ئەوەیە دونیا هەردەم وەك ئەو شێوەیە نایەت کە ئێمە حەزمان لێیە بەو شێوەیە**

ئەمەش زۆر جار لە ژیانی رۆژانەماندا دووبارە دەبێتەوە.. فایل وئیستیمارەت پڕکردنەوە بۆ زانکۆ..

لەپاشاندا لە کۆلیژێك وەرگیرایت کە تۆ حەزت پێی نەبوو..هەوڵت دا بۆ ئەوەی بۆت چاك بکرێت بۆت نەکرا.. چارت ناچار بوو بە بەردەوام بوون و درێژە پێدانی خوێندن.. دووساڵت بەرێکرد تیایدا..

چارت چییە؟

کە مادەم چارت ناچار بێت!..

خۆشی ولەزەت لەوەندە بکە..

ئیستیمارەت پێش کەش کرد بۆ فەرمانبەرییەك وەرنەگیرای.. بەڵام لەجێگەیەکی تر

وەرگیرایت..

دەوامی خۆتت تیادا کرد.

ئەی چارە چییە؟

کە تۆ چارت ناچارە؟

چێژ لە وەندە بکە لە ژیاندا..

داواو خوازبێنی ئافەرتێکت کرد سەری نەگرت.. ئافرەتێکی ترت بەهاوسەر گرت..

چارە چییە کە چارت ناچار بێ.. تام وچێژ لە ژیان بکە..

کەسانێکی زۆر هەن چارەسەری ئەم شتانە بەکەسارو پەژارەیی و خەفەت خواردن دەزانێت.. ئەڵهاو هاتوو هاوار بکات لەوکارەساتە.. زۆر سکاڵاکردن .. بۆ ئەو کەسەی کە دەیناسی یان نایناسی! ئەمەش ئەو بەشە رۆزیەی کە لە دەستی چووە بۆی ناگێڕێتەوە.. نە رۆزیەکی بۆدەهێنێ کە بۆی نە نووسرابێت..

کەواتە ئەی چارە چییە؟

ئەگەر ئەوەی تۆ دەتەوێ نەبوو.. ئەوا تۆ ببە بە ئەوەی کە دەیەوێ..

هۆشمەند ئەوکەسەیە کە خۆی دەگونجێنێ لە گەڵ ئەو بەسەرهات و رووداوانەدا هەرچۆن بێت.. مادەم توانای گۆڕینی نییە بۆ چاکترو باشتر ..برادەرێکم چاودێر بوو بەسەر مزگەوتێکەوە کە درووستیان دەکرد.. پارەیان لێ بڕا .. چوون بۆ لای کابرایەکی بازرگان بۆ ئەوەی کۆمەکیان بکات بۆ تەواو کردنی مزگەوتەکە..

ئەویش دەرگای نووسینگەی لێکردنەوە.. هەندێك لە گەڵیان دانیشت.. ئەوەندە پێی کرا کاری بۆ ئاسان کردن..لەپاشاندا کابرای بازرگان دەستی کر بە گیرفانیداو دەرمانێکی دەرهێنا خەریك بوو بیخواتەوە بیخواتەوە وتیان: سەلامات .. خودا لە نەخۆشیت لابدا!!

وتی: ئەوە دەرمانە دەساڵە بەوەدەرمانە دەخەوم دوعایان بۆ کردو..

لەپاشاندا دەرچوون،تێپەڕبون بە چاڵ هەڵکەندنێکدا کاروباری ڕێگە لە شوێنی نزیك دەرەوەی شاردا..

مووەلیدەیەکی کارەبایی پێکرابوو ئەو ناوەی رووناك کردبووەو بەڵام پڕ دەنگ تەقە تەق ورەقە رەقیشی کردبووەوە.. ئەمە هەمووی هیچ شتێکی سەیری تیادانییە..

بەڵکو ئەوەی سەیرە کابرا پاسەوانی مولیدەکە بێ گومان کابرایەکی هەژار بوولەسەر ئەو

زەویە خۆڵ وگڵە هەندێك کاغەزو شتی لەسەر دانابوو.. بۆ ئەوەی لەسەری بخەوێت وپشوو بدات.. بەڵێ.. لە ژیانی خۆتدا بژی بە کامەرانی ..

هیچ کات ودەرفەت نییە بۆ کەسارو پەژارە خواردن.. هەڵسوکەوت بکە لەگەڵ ئەو شتانەی وا لە بەر دەستی تۆدان..

پێغەمبەر((ﷺ))لەگەڵ هاوەڵانی- رەزای خودایان لێ بێ- چوون بۆ جەنگێك خواردنیان لی کەم بوویەوە.. خۆیان ماندوو و هیلاك بوو بوون.. فەرمانی پێدان هەرکەسەو ئەوەی پێیەتی لە خواردن بابیهێنێت.. پارچە قووماشێکی بۆ راخست..

کابرا دەهات تەنها یەك خورما ..یان دووخورما.. پارچە نانێك.. هەر هەمووی کۆکرایەوە لەسەر ئەم پارچە قووماشە..

لەپاشاندا دەستیان بە خواردنی کرد ..ئەوان تام وچێژ و لەزەت وخۆشییان لە ژیان وەردەگرت..

لەوانەشە هیچ کامیان لەوانە پڕ بەسکی خۆی نە خواردبێ..

بەڵام بەلای کەمیەوەیە ئەوەندەی خوارد کە برسێتییەکەی لە بیربباتەوە ئەگەر بۆ ماوەیەکیش بێت.. سەخاوەت لەوە دەکرێت کە هەبێت..

زۆری مرۆڤ حەزی پێ دەکات هەموو بەدەست نایەت بۆی.. شتی وا هەڵ دەکات بەوەی کە شتیەکان حەزیان پێی نییە.

15-10-2016

| We are different but although we are brothers | نحن مختلفات.. ولكن مع ذلك نبقى أخوة |
|---|---|

## بۆچوونمان جیاوازە بەلام هەر براین!

باس کرا کە ئیمامی شافیعی- رەحمەتی خودای لێ بێ -جارێك بەرامبەریی لە گەڵ زانایەکی سەردەمی خۆی دەکات لە سەربابەتێکی فیقهی زۆر گران.. ئەوان هەریەکەو بۆچوونی خۆی هەبوو.. جیاواز لەبۆچوونی ئەویتر... زۆری خایاندوو درێژ بووەوە بەرابەرییەکەیان .. هەتا دەنگیان بەسەریەکتردا بەرزبوویەوە..

هیچ کامیان نەیتوانی قەناعەت بەویتریان بهێنێ..وەك ئەوەی کابرا تێك بچێت و تووڕە بێت.. لەدەروونی خۆیدا هەست بەشتێك بکات.

کاتێك خەریك بوو دەربچن شافیعی رووی کردە کابراو..دەستی کابرای گرت وتی:

(( ئایا نابێت وناکرێت ئێمە با جیاوازیشمان هەبێت بەڵام هەر بەبرای یەك بمێنینەوە..!)).

هەندێك لەلای جێنشینی موسوڵمانان دانیشتبوون..کابرایەکیان قسەی کرد.. فەرموودەیەکی باس کرد..

کابرایەك وەك زانا لەوێ دانیشتبوو سەری سوڕما لەم فەرموودەیە بۆیە وتی ئەو فەرموودەیەت لە کوێ هێناوە!! ئایا درۆ بەدەم پێغەمبەر((ﷺ)) دەکەیت؟ کەی ئەمە فەرموودەیە!!کابرا وتی: ئەوە فەرموودەیە..و راستە ولە پێغەمبەرەوە((ﷺ)) بە ئێمە گەیشتووە.

کابرای زانا: نەخێر.. ئەمە فەرموودە نییە و ئێمە گوێمان لێ نەبووە.. نە لە بەر یشمان کردووە..لەو کۆڕەدا وەزیرێکی ژیر دەبێ..رووی کردە زاناکەو زۆر بەلەسەر خۆییەوە.وتی: ئەی مامۆستا!!.. ئایا هەموو فەرموودەکانی پێغەمبەر((ﷺ)) لەبەرە؟ کابرای زانا وتی: نەخێر..

وەزیر: ئایا نیوەت لەبەرە..؟ کابرای زانا: لەوانەیە..

وەزیر: ئەم فەرموودەیە لەونیوە دابنێ کە تۆ لە بەرت نییە..

بەم شێوەیە کێشەکە تەواو بوو..

((فضیل کوڕی عیاض)) و ((عبدالله کوڕی مبارك )) دوو هاوەڵ بوون هەردووك زانای بەناوبانگ وخوداپەرستی گەورە بوون..عبدالله کوڕی موبارك چوو بۆ جەنگ.. فضیل کوڕی عیاض لە ناو کەعبە ومالّی خودا مایەوە بۆ پەرستنی خودا.. فضیل کوڕی عیاض بیری برادەرەکەی کردەوەو نامەی بۆنارد کە بگەڕێتەوە بۆ پەرستن لەماڵی خودادا و واز لە تێکۆشان بهێنێ بۆیە عبدالله کوڕی مبارك وەڵامی دایەوە بەئەم چەند دێڕە...

| | |
|---|---|
| یاعابد الحرمین لو ابصرتنا ... | لعلمت انك بالعبادة تلعب |
| من کان یخضب خده بدموعه... | فنحورنا بدمائنا تتخضب |
| اوکان یتعب خیله في باطل... | فخیلنایوم الصبیحةتتعب |
| ریح العبیرلکم ونحن عبیرنا ... | رهج السنابك والغبار الاطیب |
| ولقداتانامن مقال نبینا... | قول صحیح صادق لایکذب |
| لایستوي غبارخیل الله في ... | انف امریء ودخان نارتلهب |
| هذاکتاب الله ینطق بیننا... | لیس الشهید بمیت لایکذب |

ئەی ئەو کەسەی پەرستن دەکات لە هەردوو ماڵەی خودا..

ئەگەر ئێمە ببینی ئەوکات دەزانی تۆ گاڵتە دەکەیت لە پەرستنتدا..

ئەوکەسەی روومەتی بەگریان تەڕ دەکات..

ئەوا ئێمە رووومەتمان بەخوێن تەڕ دەبێت..

یان ئەو کەسەی ئەسپەکەی لە یاری کردندا ماندوو دەکات ..

ئەوا ئە سپی ئێمە لە بەرە بەیانی جەنگدا نەعرەتە دەکات..

ئێوە بۆنی خۆش (عەبیر)و (میسك) هەڵدەمژن..

بەڵام ئێمە گڕی پێیی ئەسپ و تەپو تۆز دەمژین..

هەواڵمان پێگەیشتووە لە پێغەمبەر((ﷺ))مانەوە ..

وتەی راست، کە هیچ درۆی تێدا نییە..

(دووکەڵ) بۆ(خودا )و (ئاگری دۆزەخ) بە یەکەوە کۆنابنەوە ..

ئەمەش پەڕتووکی خودا لە نێوانماندایە..

دەڵێت: شەهید نامرێت هەر گیز بە درۆ ناخرێتەوە..

هەندێك خودا لە بارەی پەرستنەوە پێی دەدات ..هەندێك خودا لەبارەی خوێندنی قورئانەوە پێی دەدات .. هەندێك خودا لەبارەی رۆژووگرتنەوە پێی دەدات ..

بەکۆبوونەوەی هەموو موشریکەکانی جەزیرەو نەجد و جیحاز هەموویان بڕیاریاندا بەیەك دەنگ کۆببنەوە بۆ بن برکردن و قەلاچۆکردن و لەناوبردن و سڕینەوەو نەهێلانی شاری مەدینە حاڵەتێکی زۆر ناخۆش رووی کردە یاوەران هەتا قورئان خۆی وەسفی دەکات ﴿وَبَلَغَتِ الْقُلُوبُ الْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِاللَّهِ الظُّنُونَا﴾ (١٠) سورة الاحزاب

واتە (( دڵەکانتان هاتبووە ناو قورگتان گومانی ڕاستتان بەخودا نەدەبرد بەلام خودای گەورە موسلمانانی پاراست لەم شەڕەدا موسڵمانان تەنها بەپەنجەی دەست شەهیدیان دا بەلام بووە هۆی سەر کەوتنی یەکجاری موسڵمانان .

دەرئەنجامی جەنگ بەسەرکەوتنی موسوڵمانان تەواو بوو تەنها چەند کەسێك بە پەنجەی دەست دەژمێردرێت شەهید بوون..

کاتێك پێغەمبەر ((ﷺ)) فەرمانی دا کە هێشتا هەندێك لە جەنگەکەماوە پێویستە هیچ کام لە هاوەلان نوێژی عەسر نەکەن (لا یصلین العصر الا في بني قريظة)لێرەدا هەتا نەگاتە بەنی قورەنیرە ولەویَ نوێژەکەیان بکەن.. رێگەکە دوور بوو بۆیە هەندێك لە هاوەلان وتیان ئەگەر نوێژەکەی عەسر بگەیەنینە ((بني قريظة)) کاتی بەسەر دەچێت.. مەبەستی پێغەمبەر((ﷺ))

هەرگیز ئەوە نییە کە ئێمە نوێژەکەمان بچێت..تەنها مەبەستی ئەوە بوو پەلە بکەین لەرۆیشتنماندا.. نوێژەکەی خۆیانیان کرد..
هەندێك وتیان نەخێر ئێمە نوێژەکەی خۆمان دەبەینە(( بنی القریظة..)) چونکە بێ حیکمەت نییە و فەرمانی پێغەمبەر((ﷺ)) ناشکێنین.. نوێژەکەیان نەکرد.. هەتا گەیشتنە ((بنی القریظة)) ئەمەش بۆ پێغەمبەر ((ﷺ)) باسکراو لە هیچیان توورە نەبوو..

بە کورترین دەربڕین..
(الكلمة الطيبة..صدقة)..
وشەی چاك.. خێرە..
(فەرموودە)

| Look how they are life like abrothers, anothers they have a a adeffrent. oponions | أنظر كيف يتعايشون أخوة مع أنهم مختلفين في الآراء |
|---|---|

بڕوانە چۆن بەبرایانە دەژیان با جیاوازیشیان هەبێت

ئەو هورەیرە گەیشتە فرەزدەقی شاعیر وپێی وت: ئەی کوڕی برام من وادەبینم هەردوو پێت بچووکن..
تۆیش دەتوانی جێگەیان بکەیتەوە لەبەهەشتدا.. مەبەست ئەوەیە کار بۆ بەهەشت بکە.. نەکەی هەرگیز قسە ودرۆ هەڵواسین بکەیت بە ئافرەتە خاوێنەکان.

عومەری کوڕی خەتتاب.. لەسەر جێگەی مردن بوو.. خەڵکی دەهاتن بۆ لای پۆل بە پۆل بۆ ماڵئاوایی لێکردن و پیاهەڵدان وسوپاسکردنی.. عەبدوڵڵای کوڕی عەباس گەنجێك بوو داناو زانا بوو هات بۆ لای و وتی:

(( مژدەت لێ بێ ئەی گەورەی باوەڕداران بە مژدەی خودای گەورە لە هاوەڵایەتی تۆ بۆ پێغەمبەر ((ﷺ)).. یەکێك بووی لەوانەی کە زۆر لە پێشەوە موسوڵمان بوویت تۆ خۆت دەزانیت..

لەپاشاندا بوویت بە گەورەی باوەڕداران دادپەروەرو یەکسانیت بەرقەرار کرد..

لەپاشاندا بەشەهیدیش دەمریت..

عومەر دەفەرمووێ:(( وددت ان ذلك كفاف لا علي ولا لي..))

واتە:- خۆزگە دەخوازم ئەوە بەس.. باهیچم بۆ لەسەر نەبێت هیچیشم بۆ نەبێ..

مەبەستی ئەوەیە بەس سەر بەسەر دەچێت سوپاسی خودادەکات..

واتە زوو موسوڵمان بوونی خزمەت کردن بۆ موسوڵمانان.. دادپەروەری و یەکسانییەکەی بەرامبەر بەشەهید بوونی خودای گەورە لێی وەرگرێت با پاداشتی تریش نەداتەوە یان سزای بدات.

گەنجێکی تر هات..هەندێك دڵخۆشی عومەری کردەوە..

لە پاشاندا کە ڕۆیشت دەرقاچەکەی شۆڕو درێژ بوو بەزەویدا دەخشا.. واتە لەژێر هەردوو قوولە قاپییەوە بوو..

عومەر ویستی ئامۆژگاریی گەنجەکە بکات ..

داوای کرد ئەو گەنجەی بۆ بگەڕێنرێتەوە..

کاتێك لەلای وەستا پێی وت: ئەی کوڕی برام.. کراسەکەت بەرز بکەرەوە..چونکە خاوێن تر دەبێت بۆ جلەکانت نزیکتر بۆ لەخودا ترسێنت.. کۆتایی هات..

بەکورتی .. پەیامەکە گەیشت..

هەتا بۆت دەکرێت کێشە و مشتومڕ کەم بکەوە بەتایبەت کاتێك دەزانیت ئەوەی بەرامبەرت کابرایەکی نەسەلمێنەرەو بۆت ناسەلمێنێ ..

مەبەست ئەوەیە ئامۆژگاریی پێ بگەیەنیت.. نەك کردنەوەی دەرگای مشت ومڕ، خودای گەورە مشت ومڕی پێ ناخۆشە (ما ضربوه لك الا جدلا).

واتە ئەوان نموونە هێنانەوەیان بۆ تۆ تەنها بۆ ئەوەیە مشت و مڕ درووست بکەن لەگەڵت..

پێغەمبەر((ﷺ)) دەفەرموێت: (ما ضل قوم بعد هدى كانوا عليه الا اوتوا الجدل..
واتە هیچ کەسانێك خودای گەورە ڕێنموویی نەکردوون و هیدایەتی کەلەسەری بوون لەپاشاندا گومڕا بن ئەگەر بەهۆی مشت ومڕیوە نەبێت لەنێوانیاندا کە دروست بووە..
فەرمووی: (انا زعيم البيت في ربض الجنة لمن ترك المراء وان كان محقا، وبيت في وسط الجنة لمن ترك الكذب وان كان مازحا، وبيت في اعلى الجنة لمن حسن خلقه)([1])
واتە (من گرەنتی ماڵێك دەدەم لە بەهەشت بە کەسێك لە لێواری بەهەشت بە کەسێك مشت و مڕ واز لێبێنێ با هەقیش بێت، وە بەماڵێك لە ناوەڕاستی بە هەشت بۆ کەسێك کە درۆ واز لێبێنێ با گاڵتەوگەپیش بێت( سوعبەت بکات) بە ماڵێك لە ئەو پەڕی بەهەشتدا بۆ کەسێك کە ڕەشتی جوان بێت..جاری وا دەبێت مرۆڤ قەناعەتی بەهزرو بۆچوونێك دەبێت و بۆی درووست دەبێت..

بەڵام زۆربەی دەروونەکان خۆ بەگەورە زانین و وەرنەگرتن هەقی تیادایە..
وەك چۆن فیرعەون و دەست و پێوەندەکەی کاتێك هەق و ڕاستیان ناسی و زانی لە دڵنیاندا دڵنیابوو ڕاستێتی موسا((ﷺ))و نیگاکەی..
بەڵام خۆ بە گەورە زانینیان لەوەی چۆن نەبێت شوێن دەست و پێوەندەکانی خۆیان بکەون با پێغەمبەریشیان((ﷺ)) لەناودا بێت ((وجحدوا واستيقنتها انفسهم ظلماً وعلّوا))..
واتە: (( ئەوان دانیان پیانەنا و لەکاتێکا لە دەروون و ناوەوەی خۆیان دڵنیابوون لێی ئەمەش بەهۆی ستەمکاری خۆ بە گەورە زانینیانەوە بوو..)).

**کەواتە** مەبەست ئەوەیە کابرای ئامۆژگارێکراو هەڵەی خۆی بزانێت بۆئەوەی بۆ جارێکی تر دووبارەی نەکاتەوە.. نەك مەبەست ئەوە بێت سەرکەوێت بەسەریدا..
چونکە ئێوە خۆ زۆران بازی و پاڵەوان بازی ناکەن لە گۆڕەپانی پاڵەوانیەتیدا..پێغەمبەر ((ﷺ))چووە ژوورەوە بۆ لای عەلی و فاطمة ڕەزای خودایان لێ بێ.
لەکاتی شەودا..پێی فەرموون:(( الا تصليان..)).
واتە ئایا شەو نوێژ دەکەن؟..عەلی وتی: ئێمە دەروونمان بەدەست خوداوەیە..

---

[1] حسن: رواه ابو داود (٤٨٠٠) كتاب الادب من حديث ابي امامة وحسنه العلامة الالباني رحمه الله في السلسلة (٢٧٣).

ئەگەر حەزی لێ بوو بە هۆشمان دەهێنێتەوە.. ئێمەش بەهۆش دێینەوە..پێغەمبەر ((ﷺ))پشتی لێ هەڵکردن..

رۆیشت دەستی لە ئەژنۆی خۆی دەدا و دەیفەرموو: (كان الانسان اكثر شيء جدلا) رواه البخاري.

واتە: (( مرۆڤەکان لە هەموو شت زیاتر بە مشتومڕترن..)).

جاری واش دەبێ کابرای ئامۆژگاری لێکراو..

عوزر دەهێنێتەوە بەلام لە کاتێکا ئەوە هیچ عوزر نیە بەلام ئەو هەر دەیهێنێتەوە و دەیلێتەوە..

بۆئەوەی ئاوی ناوچاوی خۆی پێ هەڵگرێتەوە و پێی بمێنێتەوە..

بۆیە هەردەم دڵفراوان و پێکەوە ژیانت هەبێت و عوزری خەڵکی وەرگرە هیچ توندوتیژی مەکە لەگەڵی..

دەرگاکانی لێدامەخە بەڵکو بە کراوەیی بیانهێڵەوە لەبەر دەمیدا لە کاتێکا کە تۆ ئامۆژگاری دەکەیت..تەنانەت ئەگەر قسەیەکی هەڵەش بکات..

تۆ دەتوانی چارەسەری بکەیت بە شێوەیەك کە ئەو هەستی پێ نەکات..

وەك ئەوەی باسی چاکی ئەو بکەیت..

لەسەر تێگەیشتنەکەی و ئازایی و لێهاتووییەکەی.. لەپاشاندا..

تۆ دەڵێی: بەلام.. لەپاشاندا قسەکانی وردە وردە هەڵوەشێنەوە و پەرچی بدەوە ئەگەر هەڵە لە وشەکان و بۆچوونەکانی و تێگەیشتنەکانی هەبێت.

## بۆچوونێك..

ئاگاداری بکەوە لە سەر هەڵسوکەوتی هەڵەی بە کورتی.. موحازەرە مەدە بەسەریدا...

هیچ گرنگی مەدە بە وشەی خەڵکی ئەگەر تۆ ڕاست بووی..

سەرنجی ڕاکێشام دەربڕینەکەی عەبدولرحمان کوڕم کە دووبارەی دەکردەوە و واگومان دەبەم کە لەو تەمەنەدا ماناکەیشی تێ نەدەگەیشت ((گوێ مەدە بە قسەی خەڵکی بە خۆشی دەژیت))..!!

بیرم لەم دەربڕینە کردەوە من سەرنجی ڕەخنەکانی خەڵکی دەدەم.. بۆچوونەکانیان و دەربڕینەکانیان.. قسەکانیان..

وا سەیر دەکەم خەڵکی لە قسەکانیاندا و ڕەخنەکانیاندا جۆراوجۆرن..

تیایاندایە ڕاستگۆ بەڵام نازانێ تەکنیکی ئامۆژگاری بکات..

لەدوای ئەوەشدا تۆ دڵت پێ ناخۆش و بارگران دەبێ کاتێك شێوازەکەی زەرەری زیاترە لە سوودی بۆیە تۆیش زیاتر پێی دڵگرانی لە باتی ئەوەی دڵت پێی خۆش بێ..

لەناویاندا هەیە ناحەز.. کە ئەیەوێ دڵت ناخۆش بکات پەژارەت بۆ زیاد بکات..

لەناویاندا هەیە پسپۆریی کەمە..

ئەوەی کە قسە دەکات و نازانێت چی دەڵێت.. ئەگەر قسەی نەکردایە چاکتر بوو بۆی..

لەناویاندا بەسروشتی خۆی حەزی بە رەخنەگرتن بۆ هەموو ژیان و لە هەموو ژیاندا..

ئەو لە بنەڕەتدا روانینی بۆ ژیان بە چاویلکەی رەشەوە دەڕوانێت..

لەقسەی پێشینەی ئێمە داهاتووە ئەگەر زەوقەکان هەموو یەکبوونایە ئەوا شتەکان لە نرخدا نەدەمان. دەڵێن: جوحا سواری گوێدرێژێك دەبێ..

تێپەڕ دەبێ بەلای هەندێك خەڵکدا ئەوانیش دەڵێن چەندە دڵی رەقە خۆی سوار دەبێ منداڵەکەی بەپێ لەبەر خۆر دەچێ..

کاتێك ئەمەی گوێ لێ بوو.. گوێدرێژەکەی راوەستان و خۆی دابەزی..

کوڕەکەی سواری گوێدرێژەکە کرد.. لەپاشاندا.. هەندێك رۆیشتن..

تێپەڕبوون بەلای کەسانێکی تردا.. یەکێکیان وتی: بڕوانن بۆ ئەم کوڕە بەد کارە.. خۆی سواری گوێدرێژەکە دەبێ.. باوکی بە پێ دەڕوا لە پەنای دا..

کاتێك گوێی لێبوو.. گوێدرێژەکەی راوەستان کە رەخنەیان لێ گرت..

لەپاشاندا خۆی و کوڕەکەی سواری گوێ درێژەکە بوون..

بۆئەوەی خەڵك رەخنەیان لێ نەگرن..

کاتێك تێپەڕبوون بەلای هەندێ کەسدا..

وتیان :(( بڕوانن بۆ ئەم دوو کەسە دڵرەقە.. هیچ سۆزێکیان نیە بەرامبەر ئەم گوێدرێژە بەسەزمانە..)).

بۆیە جوحا دابەزی و بە کوڕەکەی وت کوڕم دابەزە..

هەردووکیان لەسەر رێی خۆیان و گوێدرێژەکەیان بەدەستەوە بوو.. بەبێ ئەوەی هیچ کەسێکیان لەسەر گوێدرێژەکە بێت..

ئەوانیش بەم شێوازە تێپەڕ دەبن بەلای کەسانێکدا..

پێیان دەڵێن :((بڕوانن بۆ ئەم دوو گێلە خۆیان لەسەر پێی خۆیان دەڕۆن.. سەپشتی گوێدرێژەکەش بەتاڵ و چۆڵە.. ئایا گوێدرێژ بۆ سوار بوون درووست نەکراوە؟!!..)).

جوحا هاواری کرد منداڵەکەی خۆی لەگەڵ خۆی بەهەردووکیانەوە.. گوێدرێژەکەیان خستە سەرشانی خۆیان.. بەم شێوەیە دەڕۆیشتن..!!.

بەڵام ئەگەر من لەو کاتەدا بوومایە.. بە جوحام دەوت ئەی خۆشەویستی دڵ.. چی دەکەیت بیکە.. خەڵکی لە تۆ رازی نابن..

هیچ گرنگی بە قسەی خەڵکی مەدە.. رازیبوونی خەڵکی مەبەست و پلەو پایەیەکە هیچ کەس پێی ناگات..

لایخلو المرء من ضد ولو ...... حاول العزلة فوق جبل وعر

واتە:.کێ یە لە رەخنەی تاوانکاری رزگاری بێت با ئەگەر لەسەر شاخێك خۆی گۆشە گیر بێت هەندێ لە خەڵکی بیر لە قسە ناکەنەوە کاتێك دەیڵێن..

بۆ نموونە دێت بۆ لات( دوای ئەوەی کە ژنت هێناوە!) ئەوە بۆچی ئەو ژنەت هێنا؟

من وا سەیر دەکەم.. کە تۆ هاوار بکەیت بەروویداو بڵێیت داوام کردو گواستمەوە.. تەواو کۆتایی پێ هات..

باسەکە پێی ناوێ..

کەس داوای ئامۆژگاری و پێشنیاری لەتۆ نەکردووە یان کابرایەك بێت بۆ لات و تۆ سەیارەکەت فرۆشتووە..

پێت دەڵێ:

(( خۆزگە ئاگادارت بکردامایەوە فلأن کەس زیاتری پێ دەدا..)).

تۆیش دەڵێی برام: کۆتایی هات!!

سەیارەکە فرۆشراو تەواو.. (با) بیبڕێتەوو..

خۆت سەرقاڵ مەکە بەدوایدا!!..

بۆیە خۆت سزا مەدە..

ئەزموونێك..

یەکێک لە پێشینەی ئێمە دەڵێت: هەر کەسێک لە قاپیین
پەروەردیدا گوێ بە خەڵک نەدات لە رەخنەکانیان..
ئەبێت هەردەم ماڵی جێگۆڕکێی بۆ بکات..!!

| Mi l smile and smile | أبـتسم .. ثم أبـتسم .. ثم أبـتسم |
|---|---|

خەندەت هەبێ.. لە پاشاندا خەندەت هەبێ.. لە پاشاندا خەندەت هەبێ.. لە پاشاندا خەندەت هەبێ..

**لەچەند ساڵێکەوە دەیناسم..**
**برادەرێکمە لە ئیش و کاردا.. هەر چۆنێك بێت.. بەڵام ئایا بڕوام پێ دەکەن کە هەتا ئێستا نازانم ددانی لێ درووست بووە یان نا؟!هەردەم بار داگیراوە.. ڕووی گرژە..**
**وەك ئەوەی ئەگەرپێبکەنێ یان خەندەی هەبێ لە تەمەنی کەم دەبێتەوە.. یان ماڵ و سامانی لێ دەسێنن.. خەندەداری چەند شێوازێکی هەیە چەند پلە و پایەی جیاجیای هەیە..**

یەکێک لە پێشینەی ئێمە دەڵێت: هەر کەسێک لە ئاینی پەروەریدا گوێ بە خەڵك بدات لە ڕەخنەکانیان..
ئەبێت هەردەم ماڵی جۆلگۆڕکێ پێ بکات..!!

| Mi l smile and smile | أبـتسم .. ثم أبـتسم .. ثم أبـتسم |
|---|---|

خەندەت هەبێ.. لە پاشاندا خەندەت هەبێ.. لە پاشاندا خەندەت هەبێ.. لە پاشاندا خەندەت هەبێ..

**لەچەند ساڵێکەوە دەیناسم..**

**برادەرێکمە لە ئیش و کاردا.. هەر چۆنێك بێت.. بەڵام ئایا بڕوام پێ دەکەن کە هەتا ئێستا نازانم ددانی لێ درووست بووە یان نا؟!هەردەم بار داگیراوە.. ڕووی گرژە..**

**وەك ئەوەی ئەگەرپێبکەنێ یان خەندەی هەبێ لە تەمەنی کەم دەبێتەوە.. یان ماڵ و سامانی لێ دەسێنن.. خەندەداری چەند شێوازێکی هەیە چەند پلە و پایەی جیاجیای هەیە..**

لەوانە زەردەخەنەی بەردەوام.. بەوەی هەردەم رووت کراوە و خۆش بێت لەگەڵ خەڵکی..ئەگەر تۆ مامۆستا بووی چوویتە ژوورەوە بۆ لای قوتابیانت.. بەرووی خۆش و خەندارییەوە بڕۆ ژووری.

سواری تەیارەیەک دەبی بەجێی پێ پەڕبووەکاندا.. دەرۆی خەندەت هەبێ بەرامبەر خەڵکی.. دەچیتە دووکانێکی میوە و بابەتێکی وردە فرۆشەوە.. یان جێگەی بەنزین وەرگرتنێک.. دەستت بۆ پارە پێدانیان درێژ کرد..بەخەندەوە پارەکەیان پێ بدە..ئەگەر تۆ لەناو چەند هەوڵێکدا .. کابرایەک هاتە ژوورەوە بەدەنگێکی بەرز سەلامی کرد.. روانی بۆ خەڵکەکان.. تۆ خەندەت هەبێ لەگەڵی... ئەگەر چوویتە ژوورێ لای هەندێ کەس.. تەوقەت لە گەڵ کردن.. خەندەت هەبێ... بە گشتی:خەندەو رووی خۆش کاریگەری وشوێنەواری گەورەی هەیە لەسەر خواردنەوەی رق وکینەکان وگومان ودوودڵی..

هیچ شتێک هاوبەشیی لەگەڵ ناکات.. پاڵەوان ئەوکەسەیە کە بتوانێ زاڵ ببێت بەسەر سۆزەکانیدا .. خەندەداربێت هەتا تەنانەت لە ناسک ترین کاتی ژیانیدا..

ئەنەس لەگەڵ پێغەمبەر((ﷺ)) .. پێغەمبەر((ﷺ)) ((جلبانێکی نەجرانی ئەستووری)) لە بەردابووئەو کراسەکەی راکێشا هەتاجێگەی لە گەردنی پێغەمبەر((ﷺ)) دەرکەوت و .... ئایا ئەم کابرایە چی دەوێ لە پێغەمبەر((ﷺ))؟ لەوانەیە ماڵی سووتابێ هاتبێت داوای یارمەتی و کۆمەکی بۆ رێکخستنەوەی ماڵەکە.. یان لە وانەیە هاوەڵ پەیداکارن و دزان هاتبن ماڵیان لێ تاڵان کردبێ.. بۆیە بەپەلە داوای سەرخستنی دەکات.. گوێ بگرە چی دەوێ..

وتی:ئەی ((محمد))(ورد بەوە) نەیوت: ئەی پێغەمبەری خودا((ﷺ))..

بەڵێ.. پێغەمبەر((ﷺ)) پاڵەوان بوو ئەم جۆرە شێوازی هەڵوێستەنە نایهەژێنێ.. نەتوورە دەبێ نەکەف وکوڵ هەڵ دێنێ لە سەر شتە بێ بەهاکان لە ژیاندا..

پێغەمبەر ﷺ زۆر سینەو سینگفراوان بوو.. بەهێز بوو ئەعسابی خۆی کۆنترۆڵ دەکرد.. هەردەم خەندەدار بووە هەتا تەنانەت لە ناسکترین باروودۆخدا.. بیری لە دەرئەنجامەکان دەکردەوە پێش ئەوەی پێی هەستێ.. ئەی چ سودێ دەگەیەنێ ئەگەر هاواری بەسەر کابرادا یان فەرمانی دەرکردنی بدایە!ئایا برینەکەی سەر ملی پێ چاک دەبوو! یان کابرای فێر ئەدەب وهەڵسوکەوت دەکرد! نەخێر.. کەواتە هیچ شتێک نییە وەک خۆراگری وئارامگری ودان

بەخۆداگرتن بە بەرهەم بێت: بەڵێ راستە ئێمە جاری وادەبێت لە هەندێ شتدا تووڕە دەبین وهەڵ ئەچین..
لە کاتێکا چارەسەریەکەی شتێکی ترە.. چارەسەریەکەی بەلەسەرخۆیی و نەرمونیان بوون..خەندەو.. گومانی چاك وباش بردنە..خواردنەوەی رق و کینەیە ودڵ راگرتنی خەڵکییە..
پێغەمبەر ((ﷺ)) راستی فەرمووە کاتێك دەفەرمووێت ..((لیس الشدیدبالصرعە)) پاڵەوانیەتی ئەوە نییە بەهێزو بازووبیت بەڵکو پاڵەوانی راست ئەوەیە بتوانێت کۆنترۆڵی خۆی لە دەست نەدات))..پێغەمبەر ((ﷺ)) زۆر رێزدار بووە.. خەڵکی بەخەندەوە بۆ لای خۆی راکێشاوە...

پێشنیارێك...

هەرگیز نەمبینیوە ئەگەر بەخەندەو رووخۆشیەوە نەبێت هەردەم رووی کراوە بووە..

| **الخط** الأحمر |
| --- |
| The rid line |

## هێڵە سوورەکان..

یەکێك بوو لە قوتابیانم لە زانکۆ..
رۆشنبیریی زۆر فراوان بوو..
هەوڵی ئەوەی ئەدا کە پەیوەندی لەگەڵ خەڵکی دروست بکات..
بەڵام خوێنی گران بوو بەلی خەڵکیەوە رەزاگران بوو.. رۆژێك هات ..
پێی وتم: دکتۆر.. هاوەڵانم لێم تووڕەن و..بەهیچ شێوەیەك دان بەخۆیانا ناگرن بۆ گاڵتەکردنەکانم لەگەڵیان..
منیش لە دڵی خۆمدا.. وتم: من بەبێ دەنگیت پەستم.. ئەی چۆن دان بەخۆدابگرم ئەگەر بە قسەهاتی..؟! بەتایبەت ئەگەر تۆ بتەوێ خوێنی خۆت سووك وشیرین بکەیت بەگاڵتە کردنت..!

بەهەر حاڵ لێم پرسی بۆچی ئەوان ناتوانن دان بەخۆیانا بگرن بۆ سوعبەت وگاڵتە کردنەکانت

وتی: یەکێکیان پژمی و وتی سوپاس بۆ خودا..

منیش بە سوعبەتەوە وتم خودا بە نەفرینت ببات.. لەپاشاندا هەندێك بێ دەنگ بووم.. کاتێك تووڕە بوو...

منیش قسەکەی خۆم تەواو کرد وپێم وت: ئەی شەیتان ئینجا لە پاشاندا وتم خودا ڕەحمت بەسەرتا برژێنێ...!!!

ئا ئاە... چەند خوێن گرانە!!ئەم هەژارە وا دەزانێ بەم جۆرە سوعبەتە بێ بنەما و ناباو و ناشیاو و نالەبارە... خوێنی خۆی شیرین و سووك دەكات!!

خەڵکی هەرچەند ئامۆژگاریت لێ وەرگرن و سوعبەت و گاڵتەکردنەکانت لێ وەرگرن...

هەر هەندێك لە هێڵە سوورەکان هەیە نابێت تۆ بیبەزێنی...

بەتایبەت ئەگەر لەناو و لەپێش چاو خەڵکیدا بێت...

هەندێ خەڵك چاودێری ئەم جۆرە شتانە ناکات بۆیە تۆ دەبینی سنوورەکانی خەڵکی دەبەزێنێ...

بۆ نمونە وەك ئەوەی کە زۆر تێکەڵیت لە گەڵ دەکات دەست دەبات مۆبایلەکەت دەگرێت بەدەستەوە تەلەفۆنێك دەکات بۆ هەر کەسێك کە خۆی بیەوێت...

یان لە وانەیە کورتە نامەیەك بنێرێ لەمۆبایلەکەی تۆوە بۆ کەسانێك تۆ حەز نەکەیت ژمارەی مۆبایلکەت لەلای ئەوان هەبێت...

یان دەست دەبات سویچی سەیارەکەت لێ وەردەگرێ بەبێ ئەوەی هیچ مۆڵەتت لێ وەربگرێ،

یان داوای شتێکت لێ دەکات هەتا تۆ ئەگەر پێی بدەیت بە ئیحراج بوونتەوە پێت داوە...

یان کۆمەڵە قوتابییەك بەیەکەوە دەژین لە بەشەناوخۆییەکاندا...

کاتێك بەهۆش دێتەوە وا سەیر دەکات فلان برادەری چاکەتەکەی بردووە و لەبەری کردووە بۆ زانکۆ...

یان فلان کەس پێڵاوەکەی بردووە بۆ کۆلێژ...لەو سنوور بەزاندنەیە...

کاتێك تۆ کەسێك دەبینی برادەرەکەی خۆی شەرمەزار دەکات بەقسەو گاڵتەیەکی قورس و گران یان پرسیار لێکردنی ناباو لە جێگەیەکی گشتیدا...

کابرا هەرچەند خۆشەویستیی زۆربێت بۆت...

هەر ئەوە دەمێنێ کە ئەویش مرۆڤ و رازیبوونی و تورەبوونی لێ دەوەشێتەوە... خۆشحاڵی و تووڕەبوونی لێ دەبینی.

خەڵکی هەستیارن با هەر چەندە لێتەوە نزیک بن زۆر سنووریان مەبەزێنە...

لەکاتی گاڵتەکردنەکانت یان لە کاتی هەڵسوکەوتت...

هەردەم دووربە لەهێڵە سوورەکان...

شەرمەزاریان مەکە با هەرچەندە تۆ لێیان نزیک بیت لەدڵیاندا... باوەکو براو منداڵی تۆش بن...

هەر بۆیە پێغەمبەر قەدەغەی موسوڵمانانی کردووە کە موسوڵمانانی تر بترسێنن بەهەر شێوەیەك بێت لە شێوەکان...

جارێك پێغەمبەر هەندێك لە هاوەڵانی بە کاروانی دەڕۆن هەر یەکەو...

هەموو پێویستییەکی خۆی تایبەتی پێیە... لە چەك... لە خواردن... لە ئاو...

لە کەرەستەی خەوتن... لەجێگەیەك دابەزین بۆ پشوودان و خەوتن...

برادەرێك هەندێ شت و مەکی برادەرەکەی خۆی شاردەوە... بەشێوازی گاڵتەکردن...

کاتێك ئەو برادەرەی کە شتەکانی لێ شاراوەتەوە... بەهۆش هاتەوە...

وا سەیر دەکات شتەکانی نەماون... بۆیە ترساو دەگەڕا بەدوایدا...

پێغەمبەر فەرمووی: " لا يحل المسلم ان يروع مسلما".

واتە بۆ هیچ موسوڵمانێك رەوانییە برای موسوڵمانی خۆی بترسێنێ (ابو داود)بەڵێ ئەو کەسەی کە گاڵتەت لەگەڵ دەکات...

واگومان دەبات دڵت خۆش دەکات بەڵام دڵت پڕ پەژارە و دڵتەنگی دەکات..

کاتێك تۆ دەبینی وا سەیارەکەت راگرت "

ئەویش دێت سەیارەکە بە ئیش دەخات و دووری دەخاتەوە لێت..

تۆیش وا تێ دەگەی کە سەیارەکەت دزرابێ..

ئەمەی بەگاڵتە لەگەڵ کردی...

یان قسەیەکی ترسناکت بۆ دەگێڕیتەوە لە پاشاندا دەڵێت سوعبەتم کرد..

بەڵام ئێش و ئازاری تۆی دا...

## بۆچوونێك...

هەر شتێك لە سنووری خۆی زیاد بكات...
ئەوا دەگۆڕێ و دەبێتە كارەسات...
زۆر گاڵتەكردنێك بووەتە هۆی كێشە و پێشە و ناریشەو گرفت لەنێوان خەڵكاندا!!...

| ا د ا ء  ا لـ و ا جـ بـ ا ت | Works doing |
| --- | --- |

## بەجێهێنانی پێویستییەكان...

كاتێك دەستم بە تاوتوێكردنی ماستەرنامەكەم كرد... پێداچوونەوەی زۆرێك لە پەڕتووكەكانی لایەن و تائیفەگەرییەكانم كرد...
لە نێوان ئەو بیروبۆچوونانەدا ڕێڕەوی ئەلبراجماتی واتەكەی بە كوردی ڕێڕەوی- سوود تەنها بۆخۆ بووەكان – خۆپەرستەكان... -تەنها خۆویستان- كاتێك زیاتر قوڵ بوومەوە لە تاوتوێكردنی ئەم ڕێڕەوە ئەو كات تێگەیشتم بۆچی ئێمە گوێمان لێ بووە لە ئەورووپا و ئەمریكادا...
زۆرجار بووە كوڕ باوكی بەجێ دەهێڵێ...

ئەگەر باوك و كوڕ لەدوای جیابونەوەیان هەریەك مالّی خۆی.. ئەگەر بگەن بەیەك لەچێشتخانەكەدا هەر كەسێك تەنها پارەی خۆی دەدات...

بەكرداری دەڵێن... مادەم و ئەگەر من سوودت لیّ نەكەم بۆچی خزمەتت بكەم؟!

ئەی بۆچی مالّ و سامانی خۆم خەرج بكەم بۆت؟! كاتی خۆم بە ریّ بكەم لەخزمەتی تۆدا؟! ماندووبوونی خۆم بەتۆ بكەم؟! بەبیّ ئەوەی هیچ سودێكم پیّ بگات...

بەلاّم ئایینی ئیسلام ئەم پێوەرەی گۆڕی و سەرەو ژێر و سەرەو بنی كرد.

خودای گەورە دەفەرموێت: "واحسنوا ان الله یحب المحسنین".

واتە ئێوە چاكە كار بن خودا كەسانی چاكەكاری خۆش دەویّ".

پێغەمبەر دەفەرمویّ: (خیر الناس انفعهم للناس) .

واتە: ((چاكترینی ئێوە ئەو كەسانەتانە سوودمەندترین كەستان بێت بۆ خەڵك...

(( ومن كان في حاجة اخيه كان الله في حاجته)) هەركەس لە جێبەجێیكردنی كاری خەڵكی بێت

خوداش كاری ئەو جێبەجیّ دێنیّ...

پێغەمبەر((ﷺ)) پیرەژنێك ئیشی پیّ دەبوو.. رایدەگرت و ئیشی خۆی پیّ كرد لەوانەیە شتێكی پێبوایە داوای لە پێغەمبەر دەكرد بۆی هەڵگرێت...

لەوانەیە سكالاّ و شكاتی هەبوایە لە كەسانی تر پێغەمبەر دەچوو سكالاّی بۆ بەجیّ دەهێنا..بەڵیّ پێغەمبەر((ﷺ)) تێكەڵی خەڵكی دەبوو..

دانی بەخۆیدا دەگرت لەسەر ئەزیەت دانی ئەوان بۆی... هەڵسوكەتی لەگەڵ خەڵكی بە دەروونێكی زۆر میهرەبان بوو...

چاوێكی فرمێسكاوی... بەزمان پاڕانەوەی بۆ دەكردن.. بەدڵێكی پڕ لە سۆز و خۆشەویستییەوە.

كارێكی وای لەگەڵ دەكردن كە هەستیان بە وەبوو كە پێغەمبەر((ﷺ)) یەكێكە لە ئەوان... وەك یەك جەستە و لاشە... هەستیار بوو بەهەژاریی هەژاران، بەدڵتەنگی دڵتەنگ بوان... نەخۆشی نەخۆشەكان... پێویستی پێویستان...

بڕوانە بۆ پێغەمبەر((ﷺ))... كە دانیشتبوو لە مزگەوتەكەی هەوالّ و ئامۆژگاری بە هاوەلاّنی دەكرد زۆری پیّ نەچوو هەتا تەرمایی و رەشاییەك لە دوورەوە بەرەو ئەوان دێن.

بۆیه پێغەمبەر((ﷺ)) سەیری کردن وا سەیر دەکات بەتێکڕاو بەگشتی هەژارن و هەژاری و نەداریان پێوە دیار بوو... لەناوچەی نەجدەوە هاتبوون...

لە هەژاریی خۆیاندا جل و بەرگیان لەپێستی پڵنگ و دڕندەکانی تر پۆشی بوو...

کاتێك پێغەمبەر ((ﷺ))هەژاری ئەوانی دیت...

یەکسەر رەنگی رووی پێغەمبەر ((ﷺ)) گۆڕا... لە پاشاندا... نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردن...

لەدواتریش چووە سەر ینبەرکەی:

((ان الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور انفسنا وسيئات اعمالنا من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له ، واشهد. ان لا اله الا الله وحده لا شريك له واشهد ان محمداً عبده ورسوله ((ﷺ))قال تعالى { يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا } [1].

وقال تعالى { يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ } [2].

وقال تعالى { يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا } [3].

اما بعد فأن خير الحديث كتاب الله وخير الهدي هدي محمد((ﷺ))) وشر الامور محدثاتها وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار[4].

واتە(سوپاس و ستایش هەر بۆخودایە،سوپاس وکۆمەکی و داوای لێخۆشبوونی هەرلە خودا دەکەین، پەنا بەخودا دەگرین لەخراپەی دەروونی خۆمان و لەخراپەی بەدکاریەکانمان ،هەرکەس خودا کۆمەکی دەری بێ هیچ کەس ناتوانێ سەری لێ!تێکبدات، هەرکەس خوداگومڕای بکات هیچ کەس نییە بتوانێ یارمەتیی بدات،

---

[1] سورة النساء / الاية : ١ .

[2] سورة آل عمران / الاية : ١٠٢ .

[3] سورة الاحزاب / الايتان : ٧٠ .

[4] الحديث صحيح وللالباني رسالة لطيفة سماها ( خطبة الحاجة ) . التي كان يبدئها في كل مناسباته ، والذي رواه اصحاب السنن الاربعة ابو داود ٦-كتاب النكاح ٣٣باب في خطبة النكاح برقم ( ٢١١٨ ) . والنسائي برقم ( ١٤٠٤ )١٤كتاب الجمعة. ٢٤-باب كيفية الخطبة والترمذي ٩-كتاب النكاح عن رسول الله (ﷺ)١٧-باب ماجاء في خطبة النكاح برقم ( ٥٠١١ ) وابن ماجه برقم ( ١٨٩٢ )٩-كتاب النكاح ١٩-باب خطبة النكاح .

باشترین پەڕتووك پەڕتووکی خودایە چاکترین ڕێگە ڕێگەی پێغەمبەرە((ﷺ))،
خراپترین بەدکاریەکان ئەوەیە لەئاییندا دابهێنرێت هەمموتازەیەك لە ئاییندا (داهێنراوێك)سەرگەردانییە هەموو سەرگەردانیەکیش دەرئەنجامی بۆئاگری دۆزەخە،
ئەی خەڵکینەلەخوداتان بترسن ئەو خودایەی کە ئێوەی درووست کردووە لە یەك دەروون لەو دەروونەش هاوسەری بۆدرووست کردوون و لەئەوانیش خەڵکانیتری درووست کردووە لە ژن ولە پیاوان خەڵکینە لە خوداتان بترسن ئەو خودایەی کە لێپرسینەوەتان لێ دەکات لەسەر جێ بەجێکردنی خزمایەتی،خودا ئێوەی لە ئەوپەڕی چاودێریدا گرتووە..
ئەی موسوڵمانەکان لەخوداتان بترسن لەئەوپەڕی لەخودا ترسیندا، ئێوەش نەمرن ئەگەر بەموسوڵمانی نەبێت..
ئەی باوەڕدارەکان لەخودا بترسن وتەنها قسەی خێرنەبێت نەیڵێن ئەوکات خودا کارتان بۆ ئاسان دەکات ولەگوناهتان خۆش دەوبێ هەرکەس فەرمانی خوداو پێغەمبەر((ﷺ)) بەجێ بهێنێ ئەوە سەرکەوتوو دەبێت بە سەرکەوتنێکی زۆر گەورە.. فەرمووی بە ئێمە (تصدقوا قبل ان لا تصدقوا.. تصدقوا قبل ان یحال بینکم وبین الصدقة..تصدق امرؤ من دیناره... من درهمه... من بره... من شیعر... ولا یحقرن احدکم شیئا من الصدقة...)).
واتە: (( ئێوە ئێستا خێر و چاکە بکەن پێش ئەوەی کە کاتێك بێت نەتوانن خێرو چاکە بکەن...
با هەر کەسێك لەئێوە خێر و چاکە بکات لەدینارەکەی... لە درهەمەکەی... لە گەنمەکەی... لە جۆکەی...
با هیچ کەسێك لە ئێوە خێری خۆی بەکەم نەزانێت هەرچەندە بچووك بێت...
ئیتر پێغەمبەر((ﷺ)) دەستی کرد بەباس کردن و هێنانەوەی جۆرەکانی خێر و چاکەکردن، تەنانەت باسی ئەوەشی کرد ئەگەر بە نیوەی دنکە خورمایەك بێت...)).
کابرایەکی ئەنساری لە ناو کیسەیەکدا خواردنی هێنا ئەوەندە کەم بوو لە ناو لەپی خۆی کردبوو...
پێغەمبەر((ﷺ)) لێی وەرگرت بە دەستی خۆی هێشتا لەسەر مینبەرەکەی بوو...
پێغەمبەر((ﷺ))لێی وەرگرت لەناوچاوانی گەشاوەیی و درەوشاوەیی بوو هەموو کەسێك دڵخۆشی پێغەمبەری((ﷺ)) لەرووی پێغەمبەری((ﷺ))دەخوێندەوە...

فەرمووی:(( من سنة من سنة حسنة... فعمل بها له اجرها... ومثل اجر...خەڵکی هەستان...
هەریەك بەرە و ماڵی خۆی ڕۆیشت... هەریەکە و خێر و چاکەی خۆی هێنا...
خاوەن دینار... خاوەن درهەم... خاوەن خورما... خاوەن جل و پۆشاك...
هەتا هەموو کۆبووەوە لە خزمەت پێغەمبەر((ﷺ)) وەکو گردۆڵکە کۆبووەوە گردۆڵکەکەیان لە قوماش و جل وبەرگ... گردۆڵکەی دووەمیش لە خواردن و خواردنەوە کاتێك پێغەمبەر((ﷺ))ئەمەی دی رووی گەشایەوە هەتاوەك ئەوەی پارچە مانگێك بێت وابوو...
لە پاشاندا دابەشی کرد بەسەر هەژاراندا... (رواه مسلم).
بەڵێ... پێغەمبەر ((ﷺ)) دەچووە دڵی خەڵکانەوە کە کارەکان و پێویستییەکانی بۆ بەجێ دەهێنا کاتی خۆی و ماندووبونی خۆی و ماڵ و سامانی خۆی بۆ خەڵکی بەجێ دەهێنا.
کاتێك پرسیار لە خاتوو عائیشە کرا لەشێوازی پێغەمبەر ((ﷺ)) لەماڵی خۆیدا... قالت: (( کان یکون في مهنة اهله...)).
واتە ئەو لە خزمەت خێزانەکانیدا دەبوو...
ئایا ئەمە ناکەیتە هۆی چوونە ژوورەوەت بۆ دڵی خەڵکی...بەوەی کە کارەکانیان بۆ راپەڕێنی

کابرایەك پێویستی بەوەبوو بچێتە خەستەخانە... تۆ بێگەیەنە...
کابرایەك داوای کۆمەکی لەتۆ دەکات بۆ ئەوەی کێشەیەکی بۆ چارەسەربکەیت یارمەتیی بدە... با ببینیێ تۆ کاری بۆ جێبەجێ دەکەیت...
لە گەڵی راوەستە لە ناخۆشییەکەی... با ئەو بزانێت تۆ هیچ چاوەڕوانی هیچ سوپاسێکی ئەو نیت یان چاوەڕوانی پاداشتێکی ئەو نیت...
بۆیە تۆ دەبیتە خۆشەویستی داوا و پاڕانەوەت بۆ دەکات لە لای خودای گەورە...
ئەو ئامادەی ئەوەی تیادا درووست دەبێت هاریکار و یارمەتییدەرت بێت ئەگەر پێویستت بوو..

احسن الى الناس تستعبد قلوبهم– –– فطالما استبعد الانسان احسان
چاکە بۆ خەڵکی بکە دڵیان بەلای خۆتا رادەکێشی
زۆر جاری وا بووە مرۆڤ بووەتە کۆیلەی چاکەی بەرانبەری

## پێشبینییەك...

هەر کەسێك بۆ بێجگە لەخۆی بژی لەژیانیدا زۆر هیلاك و ماندوو دەبێ...
بەڵام لە ژیانیدا دەژی بەگەورەیی کاتێکیش دەمریت بە گەورەیی دەمریت...

| لاتحمل ما لا تتحمله | Do not bear what you cant |
|---|---|

## شانی خۆت مەدە ژێر کارێك کە لە توانای تۆدا نییە پێی هەستی...

برادەرێك پیاوێکی زۆر چاکە... لە رەوشت... لە ئایین... لە هۆش پێشنوێژی مزگەوتی تەنیشت ماڵی خۆیانە.. بەلام من زۆر گوێم لێ دەبوو لەسەر زمانی خەڵکی کە بە خراپی باسیان دەکرد...

منیش زۆر سەرم سوڕ دەما...هیچ وەلامێکم پێ نەبوو بۆیان...

هەتا رۆژێك دراوسێیەکیان هات بۆ لام پێی وتم"ئەی دوکتۆر" ئەو برادەرەت نوێژمان بۆ ناکات نە نوێژمان لەگەڵ دەکات!!لێم پرسی: بۆچی؟!وتی: نازانم!... بەلام ئەو خۆی پێشنوێژ خوێنەکەمانە... لەگەڵ ئەوەدا زۆر ئامادەی مزگەوت نابێت...منیش بەش بەحاڵی خۆم هەوڵم دەدا کە پاساوی گونجاوی بۆ بهێنمەوە... دەموت:

لەوانەیە سەرقاڵ بێت بە کارێکی زۆر پێویست... لەوانەیە لەماڵ نەبێ...

وتی: مامۆستا... ئەو سەیارەکەی لەبەردەرگا راگرتووە... ومن دڵنیام لەوەی کە ئەو لەماڵەوەیە لەگەڵ ئەوەشدا ئامادەی نوێژ نابێت کە ئەو خۆی پێش نوێژ خوێنە بۆ ئێمە و مزگەوتەکە..!!

منیش هەر بۆ ئەوە گەرام مرۆڤێك بدۆزمەوە، بۆ ئەوەی ئامۆژگاریی برادەرەکەمی پێ بکەم... هەتا هۆکارەکەییم بەچاوی خۆم دی.. کابرا لەبەر ئەوەی پێش نوێژی مزگەوتی گەڕەك بوو. خەڵکی دێنە لای داوای یارمەتی لیّ دەکەن بۆ کارو پێویستییەکانیان..

بۆ نمونە:ئەمەیان قەرزی بەسەرەوەیە... ئەویش دەگەڕێت بۆ ئەوەی کابرایەك بدۆزێتەوە قەرزەکەی بۆ بداتەوە. ئەمەی تریشیان کوڕی لە دواناوەندی دەرچوو، و داوای واستە دەکات

بۆ ئەوەی لە زانکۆ وەرگیرێت... ئەمەش نەخۆشە دەیەوێت کۆمەکی یارمەتی بدرێت بۆ ئەوەی بچێتە نەخۆشخانەی ئەهلییەوە... ئەمەش کچی گەورە بووە و دەیەوێت هاوسەری چاکیان بۆ بدۆزێتەوە...

ئەمەشیان کرێچییەو دەیەوێت کۆمەکی بکرێت بۆ ئاسانکردنی کرێیەکەی لەسەری... ئەوەش... هەتا دوایی...بەهەمان شێوە خەڵك پۆل پۆل لەدوای یەك دێن پێویستی خۆیان دەخەنە بەردەستی ئەویش کابرایەکی سادەیە توانایيەکانی گەورە نییە.. نە پەیوەندی بە خەڵکانی گەورە وەهەیە..

نە خەڵکانی بەرپرسی بەو شێوەیە دەیناسن... بەلاّم ئەو خۆی کابرایەکی شەرمنە شەرم لە هەموو کەس دەکات... ناتوانیّ هیچ کەس دەنگ بدات بەڵکو هەر داوایەکی لیّ دەکەن دەڵێت بەسەرچاو هەوڵتان بۆ دەدەم...

ژمارەی تەلەفۆنی ئەمەیان وەردەگرێت... سۆزی پیّ دەدا لە زانکۆ وەربگیریّ....

سێیەمیان دەڵیّ: دوای دوو رۆژی تر وەرەوە پەڕاوی ئەوەت بۆ دەکەم بچیتە نەخۆشخانە... هەتا دوایی بەم شێوەیە...

بۆیە ئەو خەڵکانەش هەمووی لەکاتی خۆیاندا دێنەوە بۆ لای... ئەویش هیچی پیّ نەکراوە و داوای لێبوردن دەکات... کاتی تریان بۆ دادەنێت...

هەتا وای لێهات خۆی لە خەڵکی دەدەزییەوە و دەشاردەوە وەلاّمی تەلەفۆنییانی نەدەدایەوە بەڵکو لە وانەشە زۆرجار لە ماڵیش بووبیّ بەلاّم لە ماڵی خۆی دەرنەئەچوو...!!

لەپاشاندا ئەو خەڵکانەی کە سۆزی جێبەجێ کردنی کاری پێویست و کارەکانی بۆ دەدان... ئەگەر پێی بگەیشتنایە جنێویان پێ دەدا و خۆیان تووڕە دەکرد... دەیوت دەیباشە بۆچی سۆزی جێبەجێ کردنی ئەم کارەت لە ئەستۆی خۆت دەگرت... ئەی بۆچی وات لێکردم هیوای خۆم لە جێبەجێ کردنی تۆ بنیات بنێم...کابرایەتی تر دەهات دەیوت: تەنها بەتۆم وت بەکەسی ترم نەوت چونکە تۆ سۆزی جێبەجێ هێنانت پێ دابووم...

کاتێك ئەم شێوازەی ئەوم زانی و بۆم دەرکەوت دڵنیابووم لەوەی کە کابرای برادەرم چاڵی بۆ خۆی خەڵکەندووە... لەپاشاندا خۆی تێ فڕە داوە...

گوێم لێ بوو جارێك داوای لێبوردنی لە کەسێکیان کرد... دەیوت... داوای لێبوردنم هەیە... نەمتوانی هیچ کارێکت بۆ بکەم لەو داوایەی تۆ.. کابراش دەیوت بەهەموو هێز و تواناییەکەی

خۆیەوە:

باشە بەڵام تۆ هەل و دەرفەتت لە دەستی مندا... خۆزگە هەر زووتر پێت بووتمایە... ئەوکات من قسەو وتەی لوقمانی حەکیمم بەیاد هاتەوە:( الاعتذار في البداية خير من الاعتذار في النهاية) .واتە: (( لەسەرەتاوە داوای لێبوردن بکەی چاکترە لەوەی لە کۆتاییدا داوای لێبوردن بکەیت...

چەند جوانە مرۆڤ بەها و توانای خۆی بزانێت...

تەنها لە سنووری لێهاتوویی و توانایی خۆیدا کاربکات خودای گەورەش ئێمەی لەسەر ئەوە پەروەردە کردووە کاتێك دەفەرموێت :(لايكلف الله نفسا الاوسعها)).

واتە: خودای گەورە داوای فەرمانی هیچ کەس ناکات تەنها بەپێی توانایی و لێهاتوویی هەر کەسێك نەبێت.)).

منیش خۆم ئەمەم تاقی کردۆتەوە... جارێك موحازەریەکم دا... لە کۆتاییدا کابرایەك هات و پێی وتم دوکتۆر من پێویستیم بەتۆ هەیە بۆ کارێك منیش وتم: فەرموو بەپێی توانا لە خزمەتت دەبم.. چییە؟

وتی: نا.. نەخێر ئێستا لێرە کاتی ئەوە نییە پێویستە لەکاتێکی تر بەرامبەر تۆ بم بۆت باس بکەم...

هەر باسەکەی گەورە دەکرد... منیش زۆر بە لەسەرخۆییەوە گوێم بۆ راگرتبوو..

بەڵێ ژیان ئەوەندەی فێرکردووین کە بزانین زۆربەی خەڵکی بۆ کێشەو گرفتەکانی زیاتر لە قەبارەی خۆی پێ دەدەن...

هەر کەسێك ئەگەر پێویستییەکی هەبوو ئەوە پێی سەرقاڵ و ئاشقی دەبێت هەتا بۆی ئەنجام دەدرێت... کابرا پێی وتم دەزانم سبەینێ لە فلان شاردا کە دووسەد کیلۆمەتر دوورە لێرە موحازەرەت هەیە لە وێ منیش وتم: بەڵێ وایە... وتی دێم بۆ ئەوێ بۆ لات.. لەوێ چاومان بەیەك دەکەوێ...

منیش سەرم سوڕما لە سووربوونی...

بەڵێ بەکرداری بەجێی هێناو هات... کاتێك لە قاعەی (هۆڵی موحازەرەکە دەرچووم. واسەیر دەکەم کابرایەك زۆر بە شپرزەییەوە بەرەو من دێت...

پارچە کاغەزێکی بەدەستەوەیە... منیش لەگەڵی راوەستام...

پێم وت: بەڵێ فەرموو... سوپاست دەکەم بۆ سوربوونت.. پێویستییەکەت چییە؟

وتی: دوکتۆر من برایەکم هەیە خاوەنی شەهادەی سەرەتاییە... دەمەوێ تۆ فەرمانبەریەکی بۆ پەیدا بکەیت...

وتم: بەس؟!!

وتی: بەس ئەوە!!

کابرا زۆر بەگەرمی گرتبووی... دڵت پێی دەسوتا... لەوانەیە براکەی باری دارایی زۆر خراپ بێت.

بەڵام من بەش بەحاڵی خۆم دڵنیابووم هەر سۆزێکی پێ بدەم... ناتوانم بۆی بەجێ بەهێنم... چونکە بەڕاستی ئێمە ئێستا لەکاتێکداین خاوەنی بڕوانامەی بەکالۆریۆس زۆر بەزەحمەت دا دەمەزرێت... ئەی چۆن خاوەنی بڕوانامەی سەرەتایی دادەمەزرێت.... من خۆم توانایی و لێهاتوویی سنورداری خۆم دەزانم...

زۆر لەسەر دڵم گران بوو.. خۆزگەم دەخواست کە بم توانیایە چارەسەرێکی بۆ بدۆزمەوە.. بۆ ئەوەی کۆمەك و یارمەتیدەری پێویستیان بکەم... بەڵام لە راستیدا من هیچ شتێکم لەدەسەڵاتدا نییە بۆی...

بۆیە ویستم داوای لێبوردنی لێ بکەم بەشێوازێك وەك شێوازی سۆز و عاتیفەی ئەو بێت...

وتم: ئەی برام سوێند بەخودا ئاوات دەخوازم کە بتوانم هاریکاریت بکەم...

برای تۆیە برای منیشە... منیش ئازار دەخۆم وەك تۆ ئازاری پێ دەخۆم بەڵام لە راستیدا من بەهیچ شێوەیەك هاریکاریی تۆم پێ ناکرێت... ئاواتە خوازم ئەم چاکەم لە گەڵ بکەیت ئەم داوایەی خۆت لە سەر شانی من لابدەیت...

وتی:جەنابی دوکتۆر.. هەوڵێك بدە...

وتم: نا نا نا ناتوانم...ئەو پارچە کاغەزەی کە بەدەستییەوەبوو دایە دەستی من.. وتی: باشە... جەنابی دوکتۆر ئەم پارچە وەرەقەتە باپێ بێ ژمارەی تەلەفۆنی براکەمە ئەگەر شتێکت بەدەست هات پەیوەندیمان پێوە بکە...

بۆیە زانییم ئەیەوێ بە پەتی هیواوە گرێم بدات... هەردەم چاوەڕوانی پەیوەندی من بکات تەنها ئاوات و هیوابوونە کە دەمێنێ.. دڵی براکەی پێ خۆش دەکات...

بۆیە پێم وت: بەڵکو با پارچە کاغەزەکە لەلای تۆ بێ... تۆ ژمارەی من وەرگرە.. ئەگەر تۆ شتێکت دی لە دامەزراندنێك ئەوا پەیوەندیم پێوە بکە... بە هیوای ئەوەی تکایەکت بۆ بکەم بۆ وەرگرتن و دامەزراندنی...

کابرا هەندێ بێ دەنگ بوو... چاوەڕوان بووم خوداخافیزیم لێ بکات.

بەڵام پێی وتم: دوکتۆر خودا رووت سپی بکات!! سوێند بەو خودا.. قسەم لەگەڵ فلان بەرپرس کرد... بۆ ئەم کارەی براکەم پێش ساڵێك... وەرەقەکەی لێ وەرگرتم بەڵام تائێستاش هیچ وەڵامێکی نەداومەتەوە...

جارێکیان لە گەڵ فلان بەرپرسی تر... ئەویش بەهەمان شێوە... هیچ بایەخ و گرنگییەکی نەداوە بە کارەکانی براکەم... کوا بەرپرسان گرنگی و خەڵکانی هەژاریان لەبیرە... خودا تۆڵەیان لێ بکاتەوە... خودا...

دەستی کرد بە دوعا کردن لە سەریان منیش بەخۆم وت لەدەروونی خۆما... سوپاس بۆ خودا ئەگەر منیش پارچە کاغەزەکەم لێ وەرگرتایە سێیەم کەسیان دەبوو لە دوعام لەسەر بکات...

بەڵێ: داوای لێبوردن بکە لەسەرەتاوە زۆرجار چاکترە لەوەی کە لەکۆتاییدا نەتوانی کارەکەی بۆ بەجێ بهێنی... چەندە جوانە ئێمە راشکاوانە قسەبکەین لەگەڵ خەڵکانیتر... سنووری توانا و لێهاتوویی و دەسەڵاتی خۆمان بزانین.

ئەمەش تایبەتی نییە بە پێویستیی خەڵکییەوە بەڵکو قەناعەت پێویستییە بچووکەکانیش بۆ خێزان و منداڵەکانیش بەهەمان شێوەیە...کاتێك لەماڵ دەردەچی...

خێزانەکەت هاوار دەکات شیر بهێنەوە... شەکر... حەفازە... خواردنی ئێوارە...تۆ ئاگاداریە..
بڵێت و دووبارەی بکەیتەوە باشە... باشە... لەکاتێکا کە تۆ دەزانیت ناتوانی ئەم شتانە بەجێ
بهێنی چونکە تۆ گرێ دراوی بە مەوعیدەکان و کاتێك دێیتەوە ماندو و هیلاك هیچ لەمانەت پێ
نەکراوە بۆیە تۆیش هاوار بکە و بڵێ: نا نا نا توانم..!! ئەمە چاکترە لە عوزرهێنانەوە لەکاتی
گەڕانەوەتا.. کە کاتت بەدەستەوە نەماوە... دووکانەکان داخراون... یان هەر لەبیرت
چوو...بەهەمان شێوە لەگەڵ برادەرەکانت...براکانت...هەرکەسێکی تر..

ئەزمونێك...

داوای لێبوردن کردن بکە کاتێك ئەتوانی کارێك ئەنجام بدەیت هەر لەسەرتاوە بڵێ داوای لێبووردن دەکەم چاکترە و روانترە. لەوەی کاتێك سۆزی جێبەجێکردنی کارێك لەئەستۆی خۆت بگریت بەلام پێت جێبەجێ نەبێ لە کۆتاییدا داوای لێبوردن بکەیت...

| Beumble not pride | تواضع . . . ولا تتکبر |
|---|---|

## بێفیزی... خۆ بەگەورە نەزانین...

لە جێگەیەك بووم... زۆرێك لە کەسانی پیاوماقوڵ و دەوڵەمەند و بەرپرسی تیابوو..کەسێکیان
کە وای زانیوە دەوڵەمەندبووە و پێویستیی بەکەس نەماوە! دەستی بە قسەکردن کرد...
لەکاتی قسەکردنەکەیدا وتی:تێپەڕبووم بەلای کابرایەکی کرێکاردا...
ئەویش دەستی خۆی درێژ کرد بۆ ئەوەی من تەوقەی لەگەڵ بکەم... منیش دوو دڵ بووم
لەوەی دەستی خۆم درێژ بکەم بۆ ئەوەی تەوقەی لەگەڵ بکەمەوە لەپاشاندا دەستی خۆم درێژ
کرد و تەوقەم لەگەڵ کردەوە...
لەپاش ئەوە بە لەخۆباییەکەوە وتی: لەگەڵ ئەوەی کە من دەستی خۆم درێژ ناکەم بۆ دەستی
هیچ کەسێك!!
سەیرکە چی دەڵێ: دەستی خۆم بۆ هیچ کەس درێژ ناکەم بۆ تەوقە کردن...

بەڵام پێغەمبەر((ﷺ)) دەیفەرموو:(( لا يدخل الجنة من كان في قلبه مثقال ذرة من كبر)).
واتە: ((ناچێتە بەهەشتەوە هەرکەسێك بە ئەندازەی زەڕەیەك خۆ بەگەورە زانی تێدابێ)).
زۆرمان گوێ لێ بووە کە خەڵکی باس لە کابرایەکی خۆبەگەورە زان دەکەن دەڵێن: برام ئەو خۆی بەگەورە دەزانێ خەڵکی هەمووی لە خۆی پێ کەمترە... لەسەر ئەم رەوشتە خەڵك هەموو رقیان لێی دەبێتەوە... باسی بە خراپی دەکەن...
ئەگەر لێی پرسی بڵێیت :بۆچی داوای کۆمەکیت نەکرد لە دراوسێکەت بۆ فلاَن شت؟ئەویش دەڵێت: کاکە فلاَن کەسی دراوسێم خۆی بەگەورەتر دەزانێ بەسەرمانەوە...
هەر رووی خۆیشیمان نیشان نادات!!ئائائاە بێزراون ئەو کەسانەی کە خۆیان بە گەورەتر دەزانن لە خەڵکانی تر هەڵسوکەوتیان بەشێوەیەك دەبێت دیارە خەڵکیان لەخۆیان پێ

کەمترە...

چەندە بێزراوە ئەو کەسەی کەبایی دەبێ لەخۆی کاتێ دەوڵەمەند دەبێت...ئەو کەسەی کە رووی خۆی بە بەرز دەگرێت لە ئاست خەڵکیدا... زۆر بەفیزەوە بەسەر زەویدا دەڕوات...ئەو کەسەی کە خۆی بەگەورە دەزانێ بە سەر کرێکاراندا... خزمەتکاراندا... هەژاراندا... خۆی بەگەورە دەزانێ کە قسەیان لەگەڵ بکات... لەگەڵیان دانیشێت...
کاتێك پێغەمبەر((ﷺ))بۆ رزگار کردنی مەککە کەوتە رێ و مەککەی رزگار کردو چووە ژوورەوەی مەککە بە ڕێگەی کوچەو کۆلاَنەکاندا دەچوو.. ئەو کوچە و کۆلاَنانەی کە زۆر تێیدا ئازاری خواردن لەلایەن بێ بڕوایانەوە.. گاڵتەی پێ کرا...
ئەو کوچە و کۆلاَنانەی کە زۆرجار گوێ لێبوو تیایدا دەیان وت: ئەی شێت.. جادوگەر... کاهن... درۆزن...
وا ئەمرۆ وەك گەورەترین سەرکردە و پێشەوا و دەسەلاَتدار دێتەوە ناو شاری مەککە و دەسەلاَتی تەواوی بەسەردا گرتووە... خودای گەورە دوژمن و نەیارانی تیادا ریسواو سەرشۆڕ کردووە ،وا لەژێر دەستی میهرەبانی ئەودان...
ئەی ئەبێت چۆن بێت هەست و ئەستی پێغەمبەر((ﷺ)) کاتێك دێتە ناو شاری مەککەی پیرۆز..

هاوەڵێک لە هاوەڵاتی دەگێڕێتەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکری سدیقە دەڵێت: کاتێک پێغەمبەر ((ﷺ)) گەیشتە (ذي طوى) جێگە نزیک شاری مەککە... (وڵاخەکەی) سوارییەکەی خۆی ڕاگرت خۆی داپۆشی بە پارچە قوماشێکی سوورەوە.. پێغەمبەر ((ﷺ)) سەری خۆی دانابوو نزم کردبوو وەک بێ فیزییەک بۆ خودای گەورە دەربڕینێک کە سەری خست بە سەر کافرەکاندا وشاری مەککەی خستە ژێر دەسەتییەوە...

هەتا وای لێهات ریشی پێغەمبەر ((ﷺ)) وا خەریک بوو بدات بەسەرپشتی سوارییەکەیدا ئەوەندە سەری خۆی نەوی و نزم کردبوو..ئەنەس دەفەرموێ: پێغەمبەر ((ﷺ)) چووە ناو مەککە چەناگەی لەسەر پشتی خوشترەکەی بوو...عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود دەڵێت: کابرایەک هاتە خزمەتی پێغەمبەر ((ﷺ)) هەندێک شتی بە پێغەمبەر ((ﷺ)) وت وەک پیاهەڵنانێک پێغەمبەر ((ﷺ))لەرز دایگرت وفەرمووی:

(( هون عليك... فانما انا ابن امراة من قريش تأكل القديد...)).

واتە: لەسەرخۆی سووک بکە... زیاد لەسنور بەمنداڵ هەڵ مەڵێ... من تەنها کوڕی ئافرەتێکی قوڕەیشم گۆشتی وشک کراوەیی دەخوارد...مەبەست ئەوەیە لە هەژاریدا...

پێغەمبەر((ﷺ))دەیفەرموو: ((اجلس كما يجلس العبد.. واكل كما العبد..واتە: دانیشتم وەک دانیشتنی هەر بەندەیەکی ترە.. خوارنم وەک خواردنی هەر بەندەیەکی ترە...

بەڵێ:

تواضع تكن كالنجم لاح لناظر- - - على صفحات الماء وهو رفيع

ولاتك كالدخان بعلو بنفسه- - - على طبقات الجد وهو وضيع

واتە:

بێ فیز بە، وەک ئەستێرە ...

خۆی پێشانی تەماشاکار داوە...

لە سەر ڕوومەتی ئاوە ..

لە کاتێکدا کە خۆی زۆر بەرزە...

خۆت وەک دووکەڵ لێ مەکە ...

خۆی بەرز دەکاتەوە...

لە سەر چینەکانی هەواوە..

**لە کاتێکدا خۆی زۆربێ نرخە...**

بەکورتی...

- هەرکەس بۆ خودای گەورە و لە بەرخودای گەورە خۆی بێ فیز بکات خودای گەورە بەرزی دەکاتەوە...
- هەر کەسێکیش بێ فیز بێ خودا هەردەم بەرزو بەرزی و شکۆداری و ڕێز دەبیا...

| Giv them your hand | خذ بيدهم |
|---|---|

لە چاڵەکە - قوڵتەکە - دەریان بهێنە..

ئایا جاری وا نەبووە، کە کابرایەک لەناو کۆمەڵێک خەڵکدا تۆی خستێتەوە هەڵوێستێکی شەرمەزارییەوە و نەت دەزانی چۆن لێی بێیتە دەرێ... ڕەنگت گۆڕاو شەرمەزاری بەسەرسەرتەوە دیاربوو...

برادەرێك یان هەر کەسێکی تر تۆی بەم شێوەیە دی یەکسەر هەوڵی ئەوەیدا لەو شەرە زارییە تۆ بهێنێتە دەرەوە... بەرەڤانی لێکردی...

تۆیش زۆر سوپاست کردوو هەست دەکەیت کە قەرزاری چاکەی ئەویت... چونکە وەك ئەوە وایە... دەستی گرتی لەکاتێکا کە کەسێکی تر دەیەوێت فڕەت بداتە ناو چاڵێکەوە...

بۆیە تۆش هەمان هەڵوێستت هەبێ لەگەڵ گشت خەڵکان... ئەو کات دەزانی چ کاریگەری شوێنەواری خۆشەویستی بەجێ دەهێڵێ لەناو دڵ و دەروونیان بەرامبەر بە تۆ...

ئەگەر چوویتە جێگەیەك باوکێك واسەر زەنشتی کوڕەکەی دەکات..

لە سەر ئەوەی کوڕەکەی خواردنێکی زۆری هەڵگرتووە... بەڵام تۆزێك پەلەی کرد... خەریك بوو خواردنەکەی لەدەستی بەر ببێتەوە بۆ سەر زەوی.
باوکەکە دەست بکات بەسەر زەنشت کردنی کوڕەکەی و لێی تووڕە ببێت... هاواری لێبەرز ببێتەوەو بڵێ: بۆچی پەلە دەکەیت؟
چەند جارم پێ وتی: و فێرم کردی؟
بۆیە رووی کوڕەکە سوور هەڵگەڕا... تۆیش بڵێیت... نا ئەو کوڕە پاڵەوانە... پیاوە... ماشائەڵڵای لێ بێت ئەو هەموو شتە هەڵ دەگرێ... لەوانە تۆزێك پەلەی کردبێ چونکە شتی تری پێیە...

سوێندت دەدەم بەخودا هەست دەکەیت چەندە ئەو منداڵە هەست بە چاکەی تۆ دەکات بەسەرییەوە...ئەمە ئەگەر بەرامبەر منداڵێك بێت ئەی ئەگەر بەرامبەر گەورە بێت...
ئەگەر چاکەی برادەرێکی خۆت باس بکەیت لە ناو کۆڕو کۆمەڵێکدا..لەپاش ئەوەی کە بەلێزمە سەرزەنشتیان لێ کردبێ..یان باسی کەسێك بکەیت لە براکانت یان خوشکەکانت لە پاش ئەوەی هەموو ئەندامەکانی خێزانەکەت بەتیکڕا سەرزەنشتی بکەن..

یان گەنجێك کابرایەك شەرمەزاری بکات..
بەوەی پرسیاری نمرەکانی لێ بکات لەناو دۆست و برادەرانێکی زۆردا: بڵێت مژدەیەکمان بدەرێ کە پلەکانت چەندە..؟!
سوێندت دەدەم بەخودای گەورە ئەمەو ئێرە جێی پرسیارە هیچ هۆشمەندێك ئەم پرسیارە دەکات لەپێش چاوی خەڵکی؟!!
بۆیە رووی کابرای گەنج قوتابی و خوێندکار سوور هەڵگەڕاو تێکچوو..
تۆیش رزگاری بکەیت بەهێنانی قسەیەکی خۆش: ئەی بۆچی فلان کەس پرسیاری دەرئەنجامەکانی لێ دەکەیت لە زانکۆ؟ ئایا ژنێکی بۆ دەهێنی؟!!یان فەرمانبەریەکەت بۆ دۆزیوەتەوە؟ یان.. خەڵکان دەست بکەن بەپێکەنین و پرسیارەکە لەبیر بچێتەوە..
یان سەرزەنشت بکات لەسەرئەوەی پلەی کەمە..
تۆیش بڵێیت ئەی برام سەرزەنشتی مەکە.. چونکە ئەو بەشەی ئەوی تیادابوو زەحمەتە و چۆن زەحمەتێك.. بەڵام لەساڵی ئایندەدا چاکتر دەبێ ان شاء الله..

بەدەست هێنانی خۆشەویستی‌ی خەڵکی هەل و دەرفەتە زیرەك و هۆشمەندان و داناکان بۆ خۆیانی دقۆزنەوە..

اذا هبت رياحك فاغتنمها - - - فان لكل حافقة سكون

واتە:

ئەگەر رەشەبای تۆ هەڵی کرد بیقۆزەوە ..

چونکە بۆ هەموو جوولەو بزاڤێك وەستانەوەی هەیە..

عەبدوڵلای کوڕی مەسعود بە سەر دارێك کەوت بۆ ئەوەی داری سیواکی لێ ببڕێت پێیەکانی باریك و لاواز بوون..

بۆیە خەڵکی گاڵتەیان پێ کردو چونکە رەشەبا هەڵ بوو ئەویش پێیەکانی کەوتە لەرزین خەڵکانێك پێکەنین بەم شێوازە لەبەر ئەوەی پێی زۆر لاواز بوو..

پێغەمبەر ((ﷺ))فەرمووی :(( مم تضكحون؟! من دقة ساقيه؟!)).

واتە:(( ئایا ئێوە بەچی پێ دەکەنن؟! ئایا لە بچووکیی هەردوو لاقەکانی؟! ((والذي نفسي بيد انهما اثقل في الميزان من احد)). رواه احمد.

واتە: سوێند بەو خودایە کە دەروونی من بەدەست ئەوە، ئەم دوو پێیە گران و سەنگینترە لە پێوەری خودای گەورە لە کێوی ئوحود..

ئەی ئەبێت هەستی عەبدوڵلای کوڕی مەسعود چۆن بێت.. کاتێك پێغەمبەر ((ﷺ)) بە ڕەڤانی لێدەکات ..

## بۆ چوونێك...

دەست خستنی خۆشەویستی خەڵکی هەل و دەرفەتە.. زیرەکەکان بە هەل و دەرفەتی دەزانن دەیقۆزنەوە...

| أهتم بمظهرك الخارجي | Interest your look |
|---|---|

## گرنگیدان بە رووکەشی دەرەوە...

ئیمام (ئەبوحنیفە) لە ناو قووتابیانی دانیشتبوو.. لەناو ئەژنۆی ئازارو ئێش هەبوو پێی درێژکردبوو .. پشتی دابووەوە بە دیوارێکەوە. لەم کاتەدا..

کابرایەك هاتە ژوورەوە جل و پۆشاکی جوانی لەبەر دابوو.. جامانەیەکی لەسەر بوو زۆر رێك وپێك بوو..لە رووکەشی.. خەڵك رێزی لێ دەگرت.. لەسەر خۆ بوو لە رۆیشتن..

بەرێز بوو بۆ هەنگاو هەڵنانی قوتابیانی دەرفەت پێ داو رێگەیان لێ کردەوە هەتا چووە تەنیشت ئیمام ئەبوو حنیفە ودانیشت.. کاتێك ئەبوو حنیفە ئەوی دی شەرمی کرد بەو شێوەیە دانیشێ.. پێی خۆی کۆکردەوە.. دانی بەخۆیدا گرت لەبەر ئازاری پێیەکانی.ئەبوو حەنیفە بەردەوام بوو لەسەر وتنەوەی وانەکانی کابراش گوێ دەگرێ..

کاتێك ئەبوو حەنیفە لەوانەکانی بوویەوە.. قوتابیانی دەستیان کرد بەپرسیار لێکردنی. کابراش دەستی بەرز کردەوە بۆ ئەوەی پرسیار بکات.. ئیمام ئەبوو حنیفە رووی کردە لای و وتی: فەرموو پرسیارەکەت چییە؟ وتی: کەی کاتی نوێژی مەغریبە؟ ئەبو حەنیفە وتی: کاتێك

ئا ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە ئەبوو حنیفە پێی خۆرئاوا دەبێ..!! ئەوکات ئەبوو حنیفە وتی: ئا ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە ئەبوو حنیفە پێی خۆی درێژ بکات..

دەڵێن: لەیەکەم بینینی تۆدا لە هزرو مێشکی کابرادا وێنەی لە ٧٠٪ حەفتای تۆ دەکێشێ..
لە راستیدا ئەگەر بە وردی بیربکەیتەوە لە یەکەم روانین بۆ تۆ لە ٩٠٪ی وێنەی تۆ دەکێشرێت لە هزری بەرامبەردا.. هەتا خۆت ئەناسێنی.. یان قسە دەکەیت.. ئەو کات یان ئەوەتا زیاد دەکات یان کەم دەکات..

ئەگەر تۆ بەجێگەیەکدا بڕۆیت کابرایەکیش لە پەناتەوە بێت چلوپۆشاکێکی جوانورێکوپێکی لەبەر بێ.. هێواش و لەسەرخۆ دەڕۆیشت..

تۆ وا ئەو دەبینی وەك ئەوەی ئەگەر نزیك چوونە ژووریٚ بن لە دەرگایەکەوە.. یەکسەر تۆ پێی دەڵێیت فەرموو: لە پێش خۆتی دەدەیت!! ئەگەر سواری سەیارەیەك بوویت کە سەیارەی برادەرەکەت بوو شتەکانی ناوەوەی نارێك وپێك بێت.

لێرە فرچەی پێلاو فڕەدراوە..لێرەوە پارچە نان وپارچە شاوورمە فڕەدراوە... لەولاشەوە کلێش فڕەدراوە..یان شریتی کاسێت بلاۆو لەم لاو لەو لاکەوتووە..

یەکسەر لەوکاتەدا هزرت بەرامبەر ئەو کەسە و کەسایەتیەکەی بێ سەروو بەرییە..

هیچ گرنگی نادات بە رێك وپێکی..بەهەمان شێوە لە پۆشاکی خەڵکیدا .. رووکەشی دەرەوەی بە گشتی ..

ئەوەی من مەبەستمە لێرەدا ئەوەیە گرنگی دان بە رووکەشی دەرەوە نەك زیادە ڕەوی لە پۆشاك یان لە سەیارە.. یان لەشت ومەکی ماڵەوە..

یان بێجگە لە مانەش پێغەمبەر ((ﷺ)) گرنگی دەدا بەم هەموو شتانە..بەکاربرای وت چ ماڵێك هەیە؟ .. پێشتر..

## ئەزموونێك..

روانینی یەکەم بۆت وێنەی تۆ لە هزری بەرانبەردا لە ٧٠٪یە.

| Honest | الصدق |
| --- | --- |

## راستگۆیی..

ڕۆژێك چاودێریی قوتابیانم دەكرد لە ئەزموونەكانیاندا. لە ڕۆژی پێنجشەمەدا بوو. لەگەڵ ئەوەش كە ڕۆژی پێنج شەممە خۆی لەخۆیدا پشوویە:

بەڵام ئێمە چارمان ناچار بوو ئەم ئەزموونەی تیادا دابنێین لە بەر زۆری وانەكان..

لەدوای تێپەڕبوونی چەند خولەكێك قووتابییەك ..یەكێك لە قوتابیان دواكەوت لە گەیشتنە پۆل.. ئەو هەژارە شپرزەیی پێوەدیار بوو..

وتم: داوای لێبوردنم هەیە.. دواكەوتیت ناتوانم بت كەمە ژووریٚ بۆ ئەزموونەكەت..

ئەویش دەستی كرد بە سكاڵاكردن بۆ ئەوەی دەرفەتی ئەوەی بدەم بێتە هۆڵی ئەزموونەوە..

پێم: باشە بەس بۆچی دواكەوتی؟! وتی: سوێند بەخودا دكتۆر..لەخەودا مابووم!! منیش: سەرم سوڕما لە راستییەكەی..بۆیە پێم وت: فەرموو..هاتە ژوورەوە و ئەزموونەكەی دا..پاش چەند خولەكێكی تر قوتابییەكی ترهات ..

وتم: بۆچی دواكەوتی؟..

وتی دكتۆر سوێند بە خودا ڕێگە قەرەباڵغە تۆ دەزانی خەڵكی لە بەیانیاندا دێنە دەریٚ هەموو بە تێكڕا بۆ كارەكانیان..

ئەمەیان بۆ زانکۆ..ئەوەیان بۆ کۆمپانیا..ئەوەشیان بۆ..
هەر دەیژمارد وبۆی دەهێنامەوە بۆ ئەوەی قانیعم بکات بەوەی رێگە قەرەبالغە..
بەلام ئەو هەژارە ئەوەی لەبیرچوو بوو کە ئەمڕۆ بە گشتی فەرمانبەرەکان لە مۆلەتدان..
لەوانەشە لە رێگەدا ..تەنها تەنها ئەو قوتابیانەی ئێمەی لێبێ!!
منیش پێم وت: یەعنی شەقامەکان قەرەباڵغن.. سەیارەکان رێگەکانیان پڕکردووە بەقەرەباڵغی خۆیان؟

وتی: ئا، بەڵێ، سوێند بە خودا دکتۆر ئەڵێی لەگەڵ من بووی پاکی وبێگەردی بۆ خودا!!..پێم وت: ئەی زیرەك!! ئەگەر ئە تەوێ درۆ بکەیت درۆیەك رێك بخە ..
برام ئەمڕۆ پێنجشەممەیە.. یەعنی پشووی رەسمییە وهیچ کارێك نییە.. نە فەرمانبەران هەیە.. لە کوێوە ئەم قەرەباڵغییە هاتووە؟!!
وتی: ئاه جەنابی دکتۆر.. لە بیرم چوو بوو تایەیەکی سەیارەکەم پەنچەر بوو بوو.. منیش دواکەوتم بە هۆی چاکردنەوەی تایەکەیەوە..!!
ئەم قوتابییە هەژارە نەی ئەزانی چی بهێنێ بۆ ئەوەی خۆی لێ دەربازبکات لەو کێشەیەی تێی کەوتووە.. بۆیە پێکەنین و دەرفەتم دا بۆ ئەوەی ئەزموونەکەی بدات..
بەڵێ.. ئای چەندە ناشیرینە کاتێك هەڵەیەکت لێ کەوتەوە هەڵەیەکی درۆکردن بێت..!!
درۆ کردن خەڵکیت لێ دوور دەخاتەوە.. بڕوات پێ ناکەن.. دڵنیا نابن لێت..
ئەگەر کەسێکیان بکەوێتە کێشەو گرفتێکەوە.. بۆ تۆی باس ناکات.. ئەگەر قسەیەکیش بکات خەڵك لێی وەرناگرێت..
ئای چەندە ناشیرینە درۆ کردن..
پێغەمبەر ((ﷺ)) فەرمووی: ((یطبع المؤمن علی الخلال کلها الا الخیانة والکذب)) رواه احمد وابو یعلی ورجاله رجال الصحیح..
واتە: مرۆڤی باوەڕدار هەموو شتێکی لێ دەوەشێتەوە بێجگە لە ناپاکی و درۆکردن.
پرسیار لە پێغەمبەر ((ﷺ))کرا : ((ئایا مرۆڤی باوەڕدار ترسنۆك دەبێت؟
فەرمووی: ((بەڵێ)) ..
وتیان: ئایا باوەڕدار چاوچنۆك دەبێت؟
فەرمووی: (( بەڵێ))..

وتیان ئایا درۆ دەکات؟

فەرمووی: (( نەخێر)).

عەبدوڵڵای کوڕی عامر رەزای خودای لێبێ:-

دەڵێت: دایکم بانگی کردم.. پێغەمبەریش ((ﷺ))لەماڵمان بوو...

دایکم وتی: کوڕم وەرە ها پێت ببەخشم

پێغەمبەر فەرمووی: ((ئایا ئەتەوێ چی پێ بدەیت؟)).

دایکم وتی: خورمای پێ دەدەم.. پێغەمبەر((ﷺ)): ((ئاگادار بە ئەگەر پێی نەبەخشی.. ئەوە بەدرۆیەکت لە سەر حساب دەکرێت .. مالك ي الموطا وهو مرسل.

زۆر جار خەڵكان درۆ دەكەن.. بۆ ئەوەی بە گەورە بێنە پێش چاو کە ئەمەش دوورە لەراستی..

بۆیە تۆ دەبینی درۆ دەکات پاڵەوانییەتی خۆی پێ دادەنێت..هەڵوێستانێك بۆ خۆی دادەنێت..

یان لە چیرۆکەکان زیاد دەکات.. بۆ ئەوەی خۆشی بکات..

یان هەندێك شت دەڵێت لە گیرفانی خۆیەوە بهێنەدەرێ ئەمەش درۆیە.. خۆی پڕ دەکات بەهیچ ولەکەسی وەرنەگرتووە..

یان کابرای درۆزن دەبینی سۆز دەدات وبەجێ ناهێنێ..

یان خۆی لە هەندێ کاروبار دەگلێنێ.. چەندەها درۆ درووست دەکات کە جۆراوجۆرە.. زۆر زوویش درۆکەی بۆ خەڵك ئاشکرا دەبێت

ئیمامی زوهری لەلای پادشایەك بوو شایەتی بۆ شتێك دا..

کابرای پادشا: وتی درۆت کرد..

زوهری هاواری لێ بەرز بوویەوە: پەنا بەخودا دەگرم ئەگەر درۆبکەم!! سوێند بە خودای گەورە ئەگەر بانگ دەرێك لەئاسمانەوە بێت کە بڵێت خودا درۆی حەڵاڵ کردووە..واش هێشتا من هەر درۆ ناکەم..

ئەی چۆن ئەگەر درۆ کردن خۆی لەخۆیدا حەرام وقەدەغەیە!!

نیلیان لێ کردووە کاتێک دەڵێن: درۆی سپییە.. چونکە درۆ رەنگەکەی رەشە..

| الشجاعة | Encourage |
|---|---|

## ئازایەتی و نەبەردی..

کاتێک لە دەعوەتەکە دەرچووین پێی وتم: بڕوادەکەیت ناوی ئەو هاوەڵەی پێغەمبەر کە ئێوە لەبیرتان چوو بوو لەکاتی باس کردنی چیڕۆکەکەی..دەمزانی..

وتم: ئەی بۆچی باست نەکرد!.. لە کاتێکا ئێمە سەرگەردان بووبووین؟!

سەری خۆی نەوی کرد وتی: شەرمم کرد کە قسە بکەم.. منیش لەدەروونی خۆمدا وتم بەخێرنەیەت ترسنۆکییەک کە ڕێگربێت بۆ زانین وزانست.. مامۆستایەک لەگەڵم بوو لەدواناوەندی دەرسی دەوتەوە.. جارێک پێ ی گەیشتم باسی بۆ کردم وتی چوومەتە پۆلەوە.. واسەیر دەکەم قوتابیان زۆر بە سامناکییەوە بێ دەنگن وتم : ئەوە خێرە، وتیان: فلان قوتابی کۆچی دوای کردوو کەلەم پۆلەدابوە.. منیش دەمزانی هەندێک برادەری لەوێ بوون بەڵام نوێژیان نەدەکرد.. ئەم کارە دڵتەزێنە زۆر شوێنەواری بەجێ هێشتبوو لەسەریان..

لەدەروونی خۆمدا وتم هەندێک شتیان بۆ باس بکەم وەک ئامۆژگاری بێت بۆ ئەوەی دەست بکەنەوە بە نوێژکردن. چاکەکردن لەگەڵ دایک وباوکدا.. خۆ چاکسازی کردن..

پێم وت: شتێکی زۆر چاکە.. ئایا ئەم شتەت کرد؟ وتی: بەراشکاوی.. نەخێر.. چونکە شەرمم کرد. منیش بێ دەنگ بووم.. تووڕەیی خۆمم خواردەوە..

لە دەروونی خۆمدا دەم وت: بەخێر نەیەیت ترسنۆکی!! بە ئافرەتێک دەڵێت بۆچی داوای کارەکانی خۆت ناکەیت بەراشکاوی لە پیاوەکەی خۆت؟دەڵێت: چونکە شەرم دەکەم!! ترسام لە وەی کە دڵی لە ئاستم دڵتەنگ ببێت!! لەوە دەترسم کۆچم لیٚ بکات.. ترسام... ترسنۆکی بەخێر نەیەیتەوە! ..گەنجێك لێی دەپرسی: بۆچی فلاَن شتت بە راشکاوی بە باوکت ڕانەگەیاند پێش ئەوەی لە دەست دەربچیٚ؟!

دەڵێت: دەترسم.. جورئەت ناکەم..

یان لەوانەیە کەسێکیان پاڵەپەستۆی خوێنت بەرز بکاتەوە بەو وتنەی کە دەڵێت: شەرمم کرد پیٚ بکەنم و خەندەدار بم.. شەرم ئەکەم ئەگەر خەڵك بەچاکی باسم بکەن..

دەترسم لەوەی کە پێم بڵێن موجامل چییە .. خوێنی خۆی سووك دەکات..

ئەم شتانەم زۆر گویٚ لیٚ بووە..

ئاواتە خوازم هاتو هاوار بکەم بە ڕوویاندا: ئەی ترسنۆوکەکان.. هەتا کەی؟! ترسنۆك هیچ گەورەییەك بنیات نانێن..

ئەو خاڵی سفرە لەلای چەپەوە..ئەو جۆرە کەسانە کۆمەڵێکن خۆیان داپۆشیوە بە لیفەی ترسنۆکی خۆیانەوە هیچ هاوبەشییەکیان نییە بە بۆچوونێك..

یان قسەیەك بکەن..ئەگەر شتێکی خۆش بگێڕنەوە.. خەڵك دەست بکەن بە پێکەنین وقەسەی خۆیان بڵێن.. ئەوەی ترسنۆك سەری ئەوەی دەکات ئینجا پیٚ دەکەنیٚ..

ئەگەر ئامادەی کۆڕێك بوو.. هیچ کەس هەست بەبوونی ناکات..لەوەش گەورەتر ئەوەیە ئەگەر.. باوك بێت..

یان مێردێك بێت.. یان بەڕێوەبەرێك بێت.. یان هەتا دایکێك بێت یان خێزانێك بێت..

خەڵکی بەتێکڕا ڕقیان لە مرۆڤی ترسنۆك دەبێتەوە.. هیچ ڕێزێکی بۆ دانانیٚ..

دەسا بۆیە خۆت ڕابهێنە لەسەر ئازایەتی ودلێری و نەبەردی وچاونەترسی لێهاتوویی وجورئەت وبوێری و.. لەدەربڕیندا..لەوتاردا.. لەئامۆژگاری ودڵسۆزیدا..

ئازایەتی وبوێری لەجێبەجێکردنی لێهاتوویی وتوانایی بەهرەکانت لەمەڵسووکەوتت بەرامبەر خەڵکی..

## بۆچوونێك..

**خۆت ڕابهێنە لەسەر بوێری وئازایەتی.. بەڕاستی سەرکەوتن تەنها لەدان بەخۆداگرتنی یەك کاتژمێرە دێت..**

| Be firm at principle | الثبات على المبادئ |
|---|---|

## راگیر بوون لە سەر بیرو باوەڕەکان..

هەرچەندە کاسایەتی مرۆڤ بەهێزتربێت .
راگیربوونی لەسەر بیروباوەڕەکان زیاتر و پتەوتر دەبێت ..
کاریگەری گرنگی زیاتر دەبێت لە ژیاندا..لەبیروباوەڕی تۆیە کە بەرتیل وەرنەگریت..
با هەر ناوێکی لێ بنێن. بەخشیش.. دیاری..
هەقی ماندووبون زەحمەت..
تۆ هەر خۆراگیربە لەسەر بیروباوەڕەکانت..
ئافرەتێك لە ماڵدا.. لەبیرو باوەڕیەکی کە درۆنەکات لەگەڵ پیاوەکەی..
باهەر چۆن بۆی برازێنینەوە.. بەرێکرنی رۆژانەیە.. درۆیەکی سپییە..
با خۆی راگیر بکات لەبیروباوەڕەکەی.
لەوبیروباوەڕانەیە..
*کە پەیوەندیی نادروست وحەرام لەگەڵ کەسانیتر ببەستێ..
*جگەرە نەکێشا.. کاتێك لەگەڵ چەند کەسێك دەبێ خۆ راگیرکات..
*نەخواردنەوەی ئارەق..
ئەو کەسەی لەسەر بیروباوەڕەکانیەتی خۆی لێ لانادا..
با هاوەڵانی رەخنەیان لێ هەبێ..

بڵێن کابرایەکی وشکە.. بەڵام لەراستیدا و لەهەستی ناوەوەی خۆیاندائەوان بەرامبەر پاڵەوانێکن..

بۆیە زۆربەیان لە کاتی ناخۆشییەکاندا دەگەڕێنەوە بۆ لای یان بۆ راوێژ کردن پێی با تەنانەت لە کێشە وگرفتی کەسایەتی تایبەت بەخۆیشی بێت..

هەست دەکات ئەم مرۆڤە گرنگی زیاترە لە ئەو و لەخەڵکانی تر..

ئەمەش تایبەتی نییە بە پیاو بێجگە لە ئافرەت..

یان کە تایبەتی بیّ بەئافرەت بێجگە لەپیاو..

بەڵکو پیاوان وژنان یەکسانن لەو شتانەدا..

بۆیە راگیربە لەسەر بیروباوەڕە کانت بە هیچ شێوەیەك لێی لامەدە..

ئا لەوکاتەدا خەڵکی چۆکت بۆ دادەنێن..

کاتێك ئیسلام سەری هەڵدا هۆزەکان نوێنەریان دەهاتنە لای پێغەمبەر((ﷺ)) لەوانە وەفدی (ثقیف) بوو چەند کەسێك بوون..

کاتێك هاتنە لای پێغەمبەر((ﷺ)) بردنی بۆ مزگەوت بۆ ئەوەی گویّ بیستی قورئان بن ئەوان پرسیاری ریبا و زینا وئارەقیان؟ کرد

فەرمووی((ﷺ)): (( ئەوانە هەمووی حەرامن))..

بتێکیان هەبوو ناوی (الربه) بوو (الطاغیة) : زۆر لێی دەترسان..

پێغەمبەر((ﷺ)) فەرمووی: (( بیشکێنن )).

وتیان: (( ئێمە لەباو باپیرانمانەوە بۆمان ماوەتەوە تەنها سیّ ساڵ بابمێنێتەوە؟))

پێغەمبەر((ﷺ)) فەرمووی: (( نەخێر ...))چونکە ئەو بیروباوەڕەو تەنازول کردن تیایدا هەرگیز نابێت.

بۆیە عومەر وتی ئەوە بتە لەچی دەترسن ؟

وتیان ئێمە بۆ لای تۆ نەهاتووین ئەی عومەر! ئەویش بیّ دەنگ بوو.

وتیان: بۆ دوو ساڵ؟

فەرمووی((ﷺ)): نەخێر!

وتیان : ((بۆ یەك ساڵ ))

فەرمووی((ﷺ)) (( نەخێر)) وتیان ((تەنها بۆ مانگێك)).

فەرمووی((ﷺ)): (( نەخێر )).

کاتێک زانییان ئەمە بیروباوەڕە وئیسلام بەبێ بیروباوەڕ هیچ سوودێکی نییە (دابەزین نییە!!

وتیان: تۆ خۆت بیرووخێنە ئەی پێغەمبەری خودا. فەرمووی((ﷺ)) ((من کەسێک دەنێرم ئەم ئیشەتان بۆ بکات))..

کاتێک هاتنەوە بۆ هۆزەکەی خۆیان ئەوان موسوڵمان بوون ...

بەڵام ترسیان هەرمابوو لە بتەکەی خۆیان..

بۆیە موغیرەو چەند هاوەڵێک چوون بۆ رووخاندن وشکاندنی بتەکە..

موغیرە وتی: ئێستا هەموو هۆزەکانی ثقیف بە پێکەنین دەخەم؟

کاتێک چەکوشێکی لە دەستەوە گرت چوو لە بتەکەی دا.. خۆی بوراندەوە! هەندێک لاقە فڕە بەخۆی کرد!!ئەوانیش لە دوورەوە سەیریان دەکرد ...

وتیان ((:تەواو کەس ناتوانی ئەوبتە بڕوخێنێ))..

بەڵام موغیرە هەستایەوە وبەرد بە بەرد هەموو لە سەریەک لادا وتی ئەو بتە هیچ سوودو زیانی بۆ ئێوە نییە.

## نیگایەک..

((هەر کەس خودا لە خۆی رازی بکات ..
خودا خەڵکیش لێی رازی دەکات، هەر کەس تەنها هەوڵی ئەوە بێت خەڵکی لە خۆی رازی بکات خودایش لێی نارازی دەبێ لە پاشان خەڵکیش لێی نارازی دەبێ..
خەڵکیش لێی نارازی دەبێ...))..
(( پێغەمبەر(ﷺ) راستی فەرموو)).

| no t for enemythe book | لا للعداوة |
|---|---|

## فریودانەکان..

لە رۆژنامەیەکدا خوێندمەوە .. گەنجێکی موسوڵمان لەبەریتانیا ئیستیمارەی خۆی پێشکەش دەکات بۆ ئەوەی لە کۆمپانیایەک دابمەزرێت..

کۆمەڵە گەنجێکی تریش وەک ئەو هەمان داوایان هەیە نیوەیان موسوڵمان ونیوە مەسیحی..هەر گەنجێک دەچێتە ژورێ بۆ لای لیژنەی هەڵسەنگاندن چەند پرسیارێک دووبارە دەکەنەوە..

ئەم گەنجە دەچێتە ژووری لیژنەکە:- ئایا تۆ ئارەق ناخۆیت؟

گەنجەکە: نەخێر..

لیژنەکە: بۆچی تۆ نەخۆشی؟..

گەنجەکە: نەخێر بەڵام من موسوڵمانم ئارەق حەرامە لە ئاییني ئیسلامدا.

لیژنەکە: تەنانەت لە پشووی شەویشدا نایخۆیت؟

گەنجەکە: نەخێر..

کاتێک دەرئەنجام دەرچوو یەکەم کەس ئەو وەرگیرابوو..

دوای چەند مانگێک بەردەوام بوون لەسەر کارەکەی رۆژێک دەگاتە بەرپرسی کارەکەی لێی دەپرسێ ئەو پرسیارانەتان بۆچی بوو؟!بەرپرسەکە وتی: چونکە ئێمە پێویستمان بە پاسەوان بوو بۆ کارگەکە.. هەر گەنجێکیمان دەکردە پاسەوانی لەشەودا ئارەقی دەخواردەوە بێ ئاگادەبوو لە کۆمپانیا دزیش دەهاتن دزیی خۆیان دەکرد..

لەدەرئەنجامدا بڕیاماندا .. کە گەنجێک بگرین هەرگیز ئارەق نەخواتەوە؟!

تۆیش ئەو کەسە بوویت کە ئێمە بەدوایدا دەگەڕاین. بۆیە تۆمان دامەزراند!!

چەند جوانە خۆراگیر کردن لەسەر بیروباوەڕەکان با هەرچەندە فریودان و خۆشییەکانی زۆرو گەورە بێت بۆلادانی مرۆڤ مرۆڤ بۆی بژی بۆی بمرێت.. بەردەوام خۆی پێ ڕاگیرو وابەستە بکات با هەرچەندە فریودانەکان و خۆشییەکان زۆرو گەورە بن لە بەر چاوی مرۆڤدا..

کاتێک لەسەر ڕیچکەی ڕاست بڕۆیت .. دەست بگریت بەپەیڕەوی ڕاستەوە.. خاوەن پەیڕەوەکانی تر وازت لێ ناهێنن..

کاتێک تۆ ڕەشوەو بەرتیل وەرناگریت هاوەڵانی تۆ لەفەرمانگەکە کە ئەوان بەرتیل وەردەگرن لێت تووڕە دەبن..کاتێک خۆت لە داوێنپیسی دوور دەگریت خۆت دەپارێزی.. داوێنپیسان لێت تووڕە دەبن.. دەگێڕنەوە لە عومەری کوڕی خەتتاب لەو شەوانەی کە خۆی دەگەڕا بەناو شاری مەدینەدا بۆ ئەوەی بزانێت چی لە وڵات ڕوودەدات..

گوێ لە دەنگە دەنگێک بوو لە ماڵێکدا.. بۆیە ماڵەکەی دیاری کرد بۆ ئەوەی لە بەیانیدا دڵنیابێت چی لەوماڵەدا دەکرێت.. کاتێک ماڵەکەی بە خەڵوزێک دەستنیشان کرد.. کابرای خاوەن ماڵ گوێی لە چرپە و دەنگێکەوە بوو .. بۆیە هاتە دەرەوە واسەیری کرد دەرگای ماڵیان دەستنیشان کراوە.. تارماریی کابرایەکی بینی ڕۆیشت..

یەکسەر ئەویش بەهەمان شێوە ماڵەکانی چوار دەورو چوارچێوەی خۆی دەستنیشان کرد بە خەڵوزەکە بۆ ئەوەی ماڵی ئەو جیا نەبێتەوە لە ماڵەکانی تری خەڵکی.

وەك ئەوەی ئەو هەموو ماڵەوەك خۆی سەرخۆش بکات.. نەك خۆی بەرزبێتەوەو بچێتە ئاستی ئەوانەوە. وەك لەوشەی نەستەقدا هاتووە.. دەڵێت: کەسی داوێن پیس لەئەو وایە هەموو خەڵك داوێن پیسن.. لە ئەزموونی ڕۆژانەی خۆماندا ... کاتێك ئافرەتێك دەبینی زۆر درۆ دەکات لەسەر پیاوەکە خۆی لە سەر ئەمە پەروەردە کردووە.. خۆی لە سەر ڕاهێناوە بووەتە نەریت بۆی.. ئەگەر ئافرەتێك ببینێ ئەمەی لا پێ باش نەبێ ئامۆژگاریی بکات لە سەر ڕاستگۆیی.. بەڵام ئافرەتی درۆکار لەباتی ئەوەی ئامۆژگاری وەرگرێت.. بەڵام ئەویش دەبێتە بانگێشە کارێك بۆ ئەوەی ئافرەتەکەی تر .. بۆسەر هەمان بەد ڕەوشتی ڕابکێشی..

بۆیە دەڵێت و دووبارەی دەکاتەوە پیاوان شیاوی ئەوە نین چاکەیان لەگەڵ بکەین بێجگە لەم هەڵوێستانە نەبێت هیچ شتێکی تریان شیاو نیە.. کاروبارت ڕاناپەڕێت ئەگەر درۆی لەگەڵ نەکەیت.. هەر ئەم وتانەی پێی دەڵێ دووبارەی بۆ دەکاتەوە هەتا وەك خۆی لێ دەکات.. وازی لەبیروبۆچوونەکانی چاکی خۆی پێ دێنی.. یان لەوانەیە ئافرەتە چاکەکە خۆی ڕاگیر بکات

لەوانە زەردەخەنەی بەردەوام.. بەوەی هەردەم ڕووت کراوە و خۆش بێت لەگەڵ خەڵکی..ئەگەر تۆ مامۆستا بووی چوویتە ژوورەوە بۆ لای قوتابیانت.. بەڕووی خۆش و خەنداوییەوە بڕۆ ژووری.

سواری تەیارەیەک دەبی بەجێی پێ پەڕبووەکاندا.. دەڕۆی خەندەت هەبێ بەرامبەر خەڵکی.. دەچیتە دووکانێکی میوە و بابەتێکی وردە فرۆشەوە.. یان جێگەی بەنزین وەرگرتنێک.. دەستت بۆ پارە پێدانیان درێژ کرد..بەخەندەوە پارەکەیان پێ بدە...ئەگەر تۆ لەناو چەند هەوڵێکدا .. کابرایەک هاتە ژوورەوە بەدەنگێکی بەرز سەلامی کرد.. ڕوانی بۆ خەڵکەکان.. تۆ خەندەت هەبێ لەگەڵی... ئەگەر چوویتە ژووری لای هەندێ کەس.. تەوقەت لە گەڵ کردن.. خەندەت هەبێ... بە گشتی:خەندەو ڕووی خۆش کاریگەری وشوێنەواری گەورەی هەیە لەسەر خواردنەوەی ڕق وکینەکان وگومان ودوودڵی..

هیچ شتێک هاوبەشیی لەگەڵ ناکات.. پاڵەوان ئەوکەسەیە کە بتوانێ زاڵ ببێت بەسەر سۆزەکانیدا .. خەندەداربێت هەتا تەنانەت لە ناسک ترین کاتی ژیانیدا..

ئەنەس لەگەڵ پێغەمبەر((ﷺ)) .. پێغەمبەر((ﷺ)) ((جلبانێکی نەجرانی ئەستووری)) لە بەردابووئەو کراسەکەی ڕاکێشا هەتاجێگەی لە گەردنی پێغەمبەر((ﷺ)) دەرکەوت و .... ئایا ئەم کابرایە چی دەوێ لە پێغەمبەر((ﷺ))؟ لەوانەیە ماڵی سووتابێ هاتبێت داوای یارمەتی و کۆمەکی بۆ ڕێکخستنەوەی ماڵەکە.. یان لە وانەیە هاوەڵ پەیداکارن و دزان هاتبن ماڵیان لێ تاڵان کردبێ.. بۆیە بەپەلە داوای سەرخستنی دەکات.. گوێ بگرە چی دەوێ..

وتی:ئەی ((محمد))(ورد بەوە) نەیوت: ئەی پێغەمبەری خودا((ﷺ))..

بەڵێ.. پێغەمبەر((ﷺ)) پاڵەوان بوو ئەم جۆرە شێوازی هەڵوێستەنە نایهەژێنێ.. ئەتوورە دەبێ ئەکەف وکول هەڵ دێنێ لە سەر شتە بێ بەهاکان لە ژیاندا..

پێغەمبەر ﷺزۆر سینەو سینگفراوان بوو.. بەهێز بوو ئەعسابی خۆی کۆنترۆڵ دەکرد.. هەردەم خەندەدار بووە هەتا تەنانەت لە ناسکترین بارووددۆخدا.. بیری لە دەرئەنجامەکان دەکردەوە پێش ئەوەی پێی هەستێ.. ئەی چ سودێ دەگەیەنێ ئەگەر هاواری بەسەر کابرادا یان فەرمانی دەرکردنی بدایە!ئایا برینەکەی سەر ملی پێ چاک دەبوو! یان کابرای فێر ئەدەب وهەڵسوکەوت دەکرد! نەخێر.. کەواتە هیچ شتێک نییە وەک خۆراگری وئارامگری ودان

لەسەر بیروبۆچوونەکانی لەوانەشە راگیر نەبێت...

بەهەمان شێوە تۆ بڵێ بۆ بەرپرسێکی رەوشت جوان ورەوشت بەرز لەگەڵ فەرمانبەرانی .. وا گومان دەبات ئەم شێوە هەڵسوکەوتە سوود بە کارەکەو کارگە وکرێکاران دەگەیەنێ.. حەوانەوەیی و کامەرانی دەخاتە دڵی کرێکارانەوە.. بەروبووم زیاتر دەکات..

بەرپرسێکی بەد رەوشتی پێ دەگات.. هەموو کارمەندانی رقیان لێ دەبێتەوە.. بۆیە ئەویش ناحەزی بە بەرپرسی رەوشتبەرزەکە دەبات یان ئەیەوێ وەك خۆی لە بکات بۆ ئەوەی هاوەڵ وبرادەری بەدرەوشتی زۆر لێ نەنگی یەکان وبەد رەوشتییەکانی دەرنەکەوێت.. بۆیە دەیەوێت هەڵسوکەوتی بگۆڕێت.. پێی دەڵێت:- ئەو شتانە مەکە.. بەڵکو بە پێچەوانەوە... رووت گرژ بێت وهەرگیز خەندەت نەبێت بە رووی کرێکاران وفەرمانبەراندا.. ونە... یان کابرایەکی دوکانداری ناو کوچەو کۆڵانەکان جگەرە نافرۆشێت لە ناو دوو کانەکەیدا ..

کابرایەکی تری بەقاڵ ودووکاندار دێت ئامۆژگاریی ئەوەی دەکات دەست بکات بە جگەرە فرۆشتن تیایدا بۆ ئەوە خێرو قازانجی زیاتری پێ بگات.. دوودڵی دەخاتە دڵیەوەو هەتا قەناعەت ورازی دەکات بۆ جگەرە فرۆشتن...

بۆیە تۆ پاڵەوان بە خۆراگیریە لەسەر بیروباوەڕوبۆچوونەکانی خۆت.. بەبەرزترین دەنگ هاوار بکە وبڵێ: نانانا.. باهەرچەندە فریودانە کانیان گەورەو بەرچاو بێت. هەر لە کۆنەوە بێ بڕواکان هەوڵی تەواوی خۆیانیاندا بۆ ئەوەی پێغەمبەر((ﷺ)) لەهەندێك لەبیروباوەڕەکانی کە خودای گەورە فەرمانی پێ دابوو دابەزێت لەبەر خاتری ئەوان.. خودای گەورە وەڵامی دانەوە فەرمووی (ودوا لو تدهن فیدهنون) واتە ئەوان خۆزگە دەخوازن بۆ ئەوەی تۆ هەندێك دابەزی بکەیت لەبیروباوەڕەکانت ئەوانیش دابەزین بکەی لە هەندێ بیروباوەڕەکانی خۆیان کە خۆیان بۆ خۆیانیان داناوە)).کەواتە کارەکانیان بێ بیروباوەڕە بۆیە هیچ شتێك نییە ئەوان لەسەری راگیربن.. کەوا بوو هیچ قەدەغەو بەرهەڵستییەك نییە لە وەی کە ئەوان لانەدەن لە بیروباوەڕەکانیان ..مادام وابوو تۆی خاوەن بیروباوەڕە نەکەیت هەرگیز لە بیروباوەڕی خۆت دابەزیت با هەرچەندە گەورە بێت فریودانیان لە بەر چاو بۆ تۆ بێ..

پەیڕەوێك...

خودای گەورە دەفەرموێت: ((لا تطع المکذبین ودوا لو تدهن فیدهنون)) . . الایة سورة نون واتە: تۆ ئەی پێغەمبەر (ﷺ) تۆی خاوەن بیروباوەڕ نەکەی هەرگیز بە قسەی درۆکاران بکەیت....

| Not for any enemy | لا للعداوة |
|---|---|

# نا بۆ دووژمنایەتی..

خەڵکی سروشت ونەریتیان جیاجیایە وجۆراوجۆرە....

تیایاندایە هەمیشە و هەردەم توورە..

تیایاندا هەمیشە وهەردەم ساردو سڕ..

تیایاندایە زیرەك وهۆشدار تیایاندایە گێل و وێل..

خوێنەدەوارو تێگەیشتوو نەخوێندەوارو ناتێ گەیشتوو.. تیایاندا هەر دەمو و هەر كات گومانی چاك نەبێت بەخەڵكی نابات.. تیایاندا هەردەم وهەركات گومانی خراپ نەبێ بە خەڵكی نابات..

جا بۆیە ستەمكار بێ ئاگایە و هەست بە ستەمەكانی خۆی ناكات والەخۆیدا گومان دەبات كە دادوەرترین مرۆڤە..

گێل و وێلەكەش وا گومان دەبات زیرەكترین مرۆڤە نەزان ونەفامەكەش..

وا گومان دەبات دانای سەردەمی خۆیەتی..

دێتەوە یادم لە كاتی گەنجیدا بووم هێشتاش گومان دەبەم هەر وابم.مەبەستم كاتێك لەخوێندنی دواناوەندی بووم..

كابرایەكی خوێن قورس ورەزاگران بوو بەمیوانمان ..

نازانم ئایا خوێندنی سەرەتایی تەواو کرد بوو یان نا؟ بەڵام ئەوەی کە لێی دڵنیابووم ئەو دەیتوانی بنووسێ و بخوێنێتەوە...

منیش لە کاتی هاتنی ئەو دابە مەسئەلە فیقهیەوە لەشەرعدا سەرقاڵ بووم ئەم ئەزانی وەڵامەکەی چییە؟..

ئەوەی بۆ میوانداری دادەنرێت پێش کەشم کرد..

دەستم دایە تەلەفۆن بۆ شێخ عەبدول عەزیز ابن باز بکەم..

هەوڵێکی زۆرم دا بەڵام شێخ لەوێ نەبوو..

برادەرە میوانەکەم هەستی کرد من زۆر سەر قاڵم.. بۆیە لێی پرسیم: پەیوەندی بەکێوە دەکەیت؟

وتم : بە شێخ عەبدول عزیز کوڕی بازەوە.. پرسیارێکی زۆر گرنگم پێیە..

یەکسەر پێی وتم زۆربە باوەڕ بەخۆ بوونیەوە: سبحان الله .. پرسیار لە کوڕی باز دەکەیت منیش لێرەم؟!!!

بۆیە زۆربەی خەڵکی ئابەم شێوەیەن بۆیە تۆ نەبێت لە ڕەزاگرانی ئەواندا دان بەخۆتا بگریت.

هەڵسوکەوتت لەگەڵیان بە نەرمی بێت..

ئەگەر پێت کرا دڵیان بەلای خۆتا رابکێشە هیچ دووژمنایەتیان مەکە..

تۆ نەنێرراوی بە بەرپرسی لێپرسینەوە لە ئەوان بکەیت..

ئەوەندەی پێت دەکرێت رزگاریان بکە.. بەڵام سزاو ئەشکەنجەی خۆت نەدەیت ..

## هاتنێك بە سەر دڵدا..

ژیان زۆر لەوە کورتترە سەرقاڵی بکەیت بە دژایەتی و دووژمنایەتی..

| No thing for any duby | لا تسيء إلى أحد |
|---|---|

## خراپەت بۆ کەس نەبێت

خەڵکی بەگشتی رقیان لێی دەبێتەوە... لەوانەیە هیچ کەسێك لەدەستی خراپی رزگار نەبێت....

ئەگەر رزگارت بێ لەدەستی هەرگیز رزگارت نابێ لە زمانی... ئەگەر رزگارت بێ لە قامچی زمانی کەڵێت بدات هەرگیز لەدەستی زمانی دەرناچی کە غەیبەتت بکات...

بەکردار... کابرایەکی بێزراوە... ڕەزای گرانە لەسەر دڵ و دەروونی خەڵکی بە قوڕسایی و گەورەیی چیاکان... ئەگەر بیر بکەیتەوە و لەشێوازی خەڵکی ئەوکات دەگەیتە دەرئەنجامێکی دڵنیایی تەنها ئازاری کەسێك دەدات کە ئەو زاڵتر بێت بەسەریدا لەلایەك لە لایەکانیەوە.

چونکە کەسێکی بەهێز سنووری کەسێك دەبەزێنێ کە لە ئەو بێهێزتر بێت بەدەستی خۆی لێی بدات... یان لە لەقەو بەپێیەکانی پیایدا بکێشێ... لێدان و قسە پێ وتنی: خۆی وەك شێر لێدەکات لەسەری بەڵام لەجەنگی نەعامەکاندا!!!دەوڵەمەند ستەم لە هەژار دەکات...

بەوەی سووکایەتی پێ دەکات لە ناو خەڵکیدا... قسەی پێ دەبڕێ.

خاوەن پلەو پایە... بەشێکی گەورەی هەیە لەو ستەمە...

بەهەمان شێوە بڵێ بۆ ئەو کەسەی خاوەن نەسەب و تیروو هۆزی ناوداری هەبێ ئەم کەسانە لەراستیدا...

لەگەڵ ئەوەی کە خەڵك زۆر رقیان لێ دەبنەوە...

ئاواتەخوازن کە دەسەڵاتە زۆرەکەی نەمێنێ...

دڵشادن بەوەی کە هەموو بەڵاکانی بەسەریانەوە بێت... ئەوان خۆیان موفلیسن بێ مایەن....

بڕوانە بۆ پێغەمبەر((ﷺ)) کە لەگەڵ هاوەڵانیدا دانیشتووە ((ﷺ))فەرمووی

: (( اتدرون من المفلس؟قالوا المفلس فينا من لا دينار له ولادرهم قال المفلس من ياتي يوم القيامة وقد ضرب هذا واكل مال هذا ...فياحسناته لهذا فان فنيت حسناته طرحت عليه من سيئات صاحبه عليه..)).

واتە: (( ئایا ئێوە دەزانن کێ بێ سەرمایەیە ؟وتیان : بێ سەرمایە لە لای ئێمە ئەوەیە بێ دینارو بێ درهەم بێت بەڵام پێغەمبەرفەرمووی: (( بێ سەرمایە ئەو کەسەیە کە خاوەنی چاکەی زۆرە بەڵام لە ئەمەی داوە و قسەی بەئەوەیان وتووە ، چاکەکانی لێ دەسێنرێت بۆ ئەو خەڵکەی کە ئەو مافەیان لە سەریەتی ((بەهۆی لێدانیانەوە و قسە پێوتنیانەوە لەلایەن ئەو کابرایەوە)) ئەگەرچاکەی نەما کە بدرێ بەئەم وئەو ئەوکات خراپەی ئەوان دەخرێتە سەر کابرای خراپەکار لەگەڵیان)).

قالت عائشة ما ضرب رسول الله((ﷺ)) قط..

.واتە هەرگیز پێغەمبەر ((ﷺ))بەدەستی لەکەسی نەداوە ...

ومانيل منه((ﷺ)) ..انتقم لنفسه((ﷺ)) قط...

واتە هەرگیز پێغەمبەر((ﷺ)) بەدەستی تۆڵەی لەکەس وەرنەگرتووەتەوە((ﷺ)) ...

بەگشتی... هەر کەسێك ئەم بەهرە و توانایی بە لێهاتوویی و دەسەڵات حەسەب و نەسەب دار بۆ ئازار و ئەشکەنجە و ستەم کردن لە خەڵکانی بێ دەسەڵات بکات...

رقی خەڵکی بۆ خۆی پێویست دەکات...

لەوانەشە خودای گەورە هەر لە دونیادا تاقی بکاتەوە پێش دوا رۆژی...

ئەو کات دڵی ئەو هەژارانە و ستەم لێکراوانە ساڕێژ ببێ...

برادەرێکم کابرایەکی چاك بوو... قوتابی زانستی شەرعی بوو... قورئانی لەبەربوو... خەڵکی دەهاتن بۆلای قورئان و دووعای بەسەردا دەخوێندن وەك دوعاو پاڕانەوە وەبۆ ساڕێژیان... زۆرێکیش خودای گەورە شیفا و ساڕێژی کردن لەژێر دەستی ئەودا...

جارێك كابرایەكی دەوڵەمەند چووە لای دیاربوو بەجل و بەرگیدا دەوڵەمەندی لێ دەتكایەوە... لەبەردەستی برادەرەكەم دانیشت بۆ ئەوەی دوعای بەسەردا بخوێنێ وتی جەنابی شێخ ماموستا: من ئێش و ئازارم هەیە لەدەستی چەپم هەر ئەوە ماوە بمكوژێ... خەوم لێ هەڵگیراوە لەشەودا... بە رۆژیش حەوانەوەم بڕاوە...

چوومەتە لای چەندەها دكتۆر... هەموو تاقیكردنەوەكیان لەسەر كردووم... چەندەها راهێنانیان پێ كردووم... بەڵام هیچ سوودێكی بۆ من نەبووە و لێم نەكردووە... ئازارم لەزیاد بووندایە گەورەتر بووە هەتا ژیانی لێ تاڵ كردووم بەهەموو مانای ژیان لێ تاڵ بوونێك...

جەنابی شێخ من بازرگانم ژمارەیەك دەزگا و كۆمپانیام هەیە... لەوە دەترسم چاوپیسێك كاری لێ كردبم... یان كەسێك سیحر بۆ دانابم..

شێخەكە وتی: (سورەتی الفاتحە و ایە الكرسی و سورەتی الاخلاص هەردوو سورەتی الفلق و الناس)م بە سەردا خوێندن هیچ شوێنەوارێك دەرنەكەوت!!!

لەپاشاندا سوپاسی شێخی كرد و لەلای شێخی بەجێ هێشت..

پاش ماوەیەك هاتەوە بۆ ئەوەی دووبارە دوعای بەسەر بخوێنم... بەهەمان شێوە خوێندم بەسەریدا... و چوو... لەپاشاندا هاتەوە و ئێش و ئازارەكەی زۆر زیاتر ببوو...

ئا لەوكاتەدا پێم،وت: لە وانەیە تۆڵەیەكی خودایی بێت بۆت كە تۆ شتێكت كردبێت... وەك ستەم لەهەژارێك... یان خواردنیماڵیان...یان هەق و ماڤ كەسێكت نەدابێ..

یان هەر شتێكی تر بێجگە لەوانە... ئەگەر شتێك هەیە لەو شتانە ئەوا تۆ بەپەلە تەوبە بكە لەوەی كە كردووتە.. مافەكانی خەڵكی بگێڕەوە بۆ خاوەنەكانیان... داوای لێخۆشبوون بكە لەلای خودای گەورە بۆ گوناهی پێش ئێستات.

كابرای بازرگان ئەمەی پێ خۆش نەبوو كە من بۆم باس كرد... زۆر بەخۆگەورەییەكەوە وتی:ستەمم لە كەس نەكردووە... نە ماڤ كەسم خواردووە... سوپاست دەكەم بۆ ئامۆژگارییەكەت...

لەپاشاندا دەرچوو... چەند رۆژێك دیارنەما... منیش لەوە ترسام كابرا دڵی لەمن زویر بووبێت بۆ ئەو ئامۆژگاریانەی كە پێم وت: رۆژێك لە جێگەیەكی چاوەڕوان نەكراو پێی گەیشتم... بەرەو من هاتوو زۆر بەدڵخۆشییەوە...پرسیارم كرد... ها دەنگ و باست تەندروستیت چۆنە..؟

وتی: سوپاس بۆ خودا... ئێستا دەستم زۆر باشە بەبێ ئەوەی هیچ چارەسەری دوکتۆری پێویست بێ؟!!

پێم وت: چۆن؟وتی: کاتێك تۆ ئامۆژگاریت کردم... من لای تۆم بەجێ هێشت...
دەستم بە بیرکردنەوە کرد لە ئامۆژگاریەکەت... هەموو یادەوەریەکانی خۆمم بەهۆش و هزری خۆمدا هێنایەوە؟!

ئایا ئەبێت ستەمم لەکەسێك کردبێت؟ ئایا ئەبێت ئایا ئەبێت ماف رەوای کەسێکم خواردبێ؟
هاتەوە یادم پێش چەند ساڵێك باڵەخانەیەکم دروست کرد...
زەویەك لە پاڵیدا بوو حەزم کرد ئەویش لەگەڵ بێت بۆ ئەوەی جوانتر بێت...
بەلام موڵکی ئافرەتێکی بێوەژن بوو... چەند منداڵێکی هەبوو...
ویستم پێم بفرۆشێ بەلام رازی نەبوو... وتی: چی بە پارە بکەم... کێ ئەڵێ پارەکە ناخورێ...
بەڵکو با زەوییەکە بمێنێتەوە بۆ منداڵەکان هەتا خۆیان گەورە دەبن.
چەند جارێك دەمنارد بۆ ئەوەی پێم بفرۆشێت ئەویش هەر هەمان هەڵوێستی هەبوو...
مامۆستاکە دەڵێت: لێم پرسی ئەی چیت کرد؟
بازرگانەکە... بەچەند رێگەیەك لە رێگەکانی خۆم زەویەکەم لێ زەوت کرد.مامۆستاکە: رێگەکانی تایبەتی تۆ چین؟بازرگانەکە: بەڵێ پەیوەندی گەورە و زۆر و فراوانم... ناسینەکانم...
مۆڵەتی ئەوەم وەرگرت کە ئەو زەویە لە گەڵ زەویەکەی خۆم بۆ باڵەخانەکە بکەم...
مامۆستاکە لێم پرسی: ئەی دایکی هەتیوەکان؟
بازرگانەکە: ئەویش بەم هەواڵەی زانی هەر ئەوەندەی پێ کرا هاوار بکات بەسەر کرێکارەکاندا بۆ ئەوەی نەیەڵێت بیناکە درووست بکەن...
ئەوانیش پێی پێ دەکەنین گۆمانیان وابوو کە ئەو شێتە...
لەراستیشدا من خۆم شێت بووم نەك ئەو ئافرەتە بێوەژنە بێ دەسەلاتەکە...
هەر دەگریا و دەستی پاڕانەوەی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە...
ئەمەم لێ دەبینی بەچاوی خۆم...
لەوانەشە پاڕانەوەکانی لەتاریکی شەودا زۆر گەورەتر بێت...
مامۆستاکە... ها... تەواوی بکە...

بازرگانەکە: منیش لەدوای ئەو هەموو ئازار و بێ چارەسەرییە...
چووم دەگەڕام بەدوایدا... هەتا جێگەکەیم دۆزییەوە...
دەستم بەگریان و داوای لێبووردنم لێ کرد...
هەر لێی پاڕامەوە و تکام لێ کرد هەتا چی ویست لەباتی زەوییەکەی قەرەبووم بۆ کردەوە...
لێم خۆش بوو...

گەردنی ئازاد کردم دوعای بۆ کردم.
سوێند بەخوای گەورە هەرکە دەستی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان بۆ پاڕانەوە و دوعای خێرکردن بۆم...
یەکسەر بەبێ هیچ دواکەوتنێك تەندروستیم وردە وردە بۆ دەستە بەئازارەکەم گەڕایەوە...

لەپاشاندا بازرگانەکە سەری خۆی جوولاند و بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان و وتی:
(( دوعا و پاڕانەوەکەی سوودی پێ گەیاندم بە ئیزنی خودای گەورە لە کاتێکدا هەموو پزشکانی دونیا نەیانتوانی سوودم پێ بگەیەنن و چارەسەرێکم بۆ بدۆزنەوە ئەگەر بۆ کاتیش بێت.)).

وتراوە...

چاوەکانت خەوتوون..
ستەم لێ کراو بە ئاگایە..
نزات لە سەر دەکات..
چاوی خوداش ناخەوێت..